

# من و شەقڵاوە



وێنە: ئازا عەبدوڵا

قادر گۆزێ

ژیاننامە و مێژوو

# « سوپاس نامە »

ئەگەر هەوڵ و هیمەت و خەمخۆری هەندێك لە دڵسۆزانم نەبوایە، لەوانەبوو ئەم بەرهەمە وا بە گورجی نەکەوێتە بەردەستی خوێنەران. بۆیە زۆر بە پێویستی دەزانم جگە لە هەوڵی کوڕ و کچەکانم، دەست خۆشیەکی گەرمی خەدیجە ڕەشی خێزانی خۆشەویستم بکەم کە زۆر یارمەتیدەرم بوو لە وەبیرهێنانەوەی وردەکاری زۆر لە بابەتەکان. هەروەها سوپاسێکی بێ پایانی هەموو ئەوانە دەکەم کە ڕۆڵێکی کاریگەر و بەرچاویان بینی لەم هەوڵەی من بۆ دۆکیومێنت کردنی بەسەرهاتەکانی خۆم و بەشێك لە مێژوو و کەلتوری ناوچەکەمان. دەست خۆشیەکی گەلێك تایبەت لە هەردوو ڕۆناکبیری بەڕێز مامۆستا زرار سەرتاش و بەڕێز ڕزگار شەمعون تۆما پاتری دەکەم کە زۆر یارمەتیدەر بوون و کاتێکی زۆری خۆیان بۆ ئەم پەڕتوکە تەرخانکرد. لە ماوەیەکی کورتیشدا بەشێك لە بابەتەکانی ئەم پەڕتوکەیان بە ڕێکی داڕێشتەوە و تایپیان کردەوە، بە هەموو شێوەیەکیش پاڵپشتم بوون و هەندێك زانیاریشیان بەخشیە ناوەرۆکی ئەم پەڕتوکە. سوپاسی زۆری بێستونی برازام و ئەنوەر گۆزێی برام دەکەم بۆ هاوکاریکردنیان. هەروەها سوپاسی شاعیر و ڕوناکبیری بەڕێز مامۆستا ماهیر وەسمان خۆشناو دەکەم بۆ هەوڵەکانی. سوپاسی بەڕێزان شوان عوسمان، هەندرێن حەمەدئەمین و هەڵمەت عەبدوڵا زبێر دەکەم بۆ بەستنی کۆڕە ئینتەرنێتیەکانم کە هەوێنی ئەم پەڕتوکەیان فراوانترکرد. هەروەها سوپاس بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەش کە کۆمێنتیان لەسەر بابەت و بڵاوکراوەکانم داوە و ئەوانەی بە تەلەفۆن دەستخۆشیان لێکردوم یان بابەتەکانی منیان خوێندۆتەوە. ئەو هاندانەی خوێنەرانم نەبوایە، لەوانەبوو ئەم هەوڵە بەردەوامی بەخۆوە نەدیبا، دووبارە سوپاس. سوپاسێکی گەرمی سایتی شەقڵاوە پۆستیش دەکەم بۆ ڕێزلێنانە تایبەتەکەیان و ماندوبونیان لە بڵاوکردنەوەی بابەتەکانم.

نوسەر

# « چەند ڕونکردنەوەیەکی پێویست »

* من کە ئێستا خەریکی تەواوکردنی ئەو پەرتوکەم، تەمەنم گەیشتۆتە دەور و بەری ۹۰ ساڵ و پیری زۆر شتی لەبیر بردومەتەوە. مەبەستی من لە نوسینەوەی ئەو پەرتوکە، گێرانەوەی بیرەوەریەکانی ژیانی خۆمە و لە هەمان کاتیشدا خزمەتکردنە بە کورد بە شێوەیەکی گشتی و بە کەلتوری شاری شەقڵاوە و ناوچەکە بەتایبەتی. من بەو پێیەی هۆش و بیرم ڕێگەیان داوم، بیرەوەریەکانم گێراونەتەوە. لە بەشێك لە بابەتەکان ناوی هەندێك کەسم بیرنەماوە و لێرەوە داوای لێبوردنیان لێ دەکەم.

* زۆر ووشە لە زمانی کوردی هەن کە بە شێوازی جیاواز دەنوسرێن و تا ئێستا یەکلانەکراونەتەوە. نوسەرانیش بۆچونی جیاوازیان هەیە و لەسەر چۆنیەتی نوسینیان کۆکنین. چونکە من زمانەوان نیم، پێم باش بوو خۆم پابەند نەکەم بە بەکارهێنانی یەك جۆر نوسین، بەڵکو لە شوێنی جیاواز ووشەکانم بە شێوازی جیاواز بەکارهێناون. هەروەها هەوڵمداوە پەرتوکەکە بە زمانێکی ساکار بنوسم، بۆ ئەوەی زۆرترین خوێنەر سودی لێ وەربگرن. چونکە بەسەرهاتەکان باس لە ناوچەی شەقڵاوە دەکەن، لە زۆر شوێن هەوڵمداوە کەمێك زاراوەی ناوچەکە بەکاربهێنم بۆ ئەوەی چێژێکی تایبەتی هەبێت و خوێنەر بیاتە ئەوێ. داوای لێبوردنیش دەکەم لە هەر هەڵەیەکی نوسین، هەرچەندە هیچ بەرهەمێکیش بێ کەموو کەموکوڕی نابێ.

* لە گێرانەوەی بەشێك لە بابەتە کۆنەکان، چەند دەستەواژەیەکی فارسی و تورکی و ئوردوم بەکار هێناون. هەرچەندە جگە لە هەندێك ووشە لێرە و لەوێ، من هیچ کامێك لەو زمانانە نازانم. دوای حەفتا هەشتا ساڵ، ئێستاش ئەو یادگاریانە بە گوێمدا دەزرەنگێنەوە و وەك ئەمانەتێك، حەزمکرد هیچ ووشەیەك لە گێرانەوەی بابەتەکان نەقرتێنم و شتەکان بەو شێوەیە بگێڕمەوە کە گوێم لێیان بووە. هەندێك ووشەی عەرەبیشم بەکار هێناون، چونکە تێکەڵ بە زمانی کوردی بوونە و زۆریش باون، بەتایبەتی لە ناوچەی شەقڵاوە.

* لە زۆربەی گوند و شارەکانی کوردستان، ناو و ناوەرۆکی جیاواز و سەیر بۆ خەڵك هەڵدەبژێردرێن. لە گێرانەوەی بابەتەکان، هەوڵمداوە نازناوی ئەو کەسانە بەکاربێنم کە پێی ناسراون، بۆ ئەوەی لە ماندوبوون و دەوری ئەوان کەم نەکەمەوە.

* زۆر لەو کەسانەی لەم پەرتوکە ناویان هاتوە، لە ژیاندا نەماون و بەشێکیشیان شەهید کراون. لێرەوە لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە لە گیانی پاکی هەموویان خۆشبێ و سەری ڕێز و ئەوازشیش بۆ هەموو شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری کورد و کوردستان دادەنوێنم.

## لە بیرەوەری و ژیاننامەوە مێژوویەك لە دایك دەبێت

نوسینەوەی بیرەوەریەکان، هێنانەوە بیری لاپەڕە فەرامۆشکراوەکانی مێژووە بە شێوەیەکی نائاگاییەوە. هەروەها دەبێتە تەوەرێك بۆ چوونە ناو چەند بابەتێکی نادیار. بیرەوەری لە ئەنجامی بیرکردنەوە و ئاوڕدانەوە بۆ دواوە دێتە دی. بەڵام هەموو گەڕانەوەیەك ئەو کات کارێکی مەزن و ڕەوا دەبێت، کە بیرکردنەوەیەك بێت لەمەڕ ژیانی نەتەوەیەك و ئەوکات دەبێتە دەستکەوتێکی مێژووییش. مێژوویەکیش ئەگەر بەدەستی خۆمان بنوسینەوە، ڕەواترە لەوەی بەدەستی یار و نەیارەکانمانەوە بنوسرێت، چونکە ئەوان لە ڕوانینی هزری تایبەتی و بەرژەوەندیەکانی خۆیانەوە ئەوە ئەنجام دەدەن، نەك بەرژەوەندی ئێمە. بۆیە ئەرکی هەموومانە کۆمەکی ئەو کەسانە بکەین کە یاداشتی خۆیان دەنوسنەوە و باسی ڕابردووی خۆیان دەکەن. یاداشت و ڕابردووی هەریەکێکیشمان، هەر بەتەنیا شتێکی تایبەت نیە بەخۆمان، بەڵکو لە دەرەنجامدا ئامانجێکی گەلەکیش دەپێکێت. بۆیە دەبێت بە ڕێز و حورمەتیشەوە تەماشای سەربوردە و بەسەرهاتەکانی ئەو کەسانە بکەین.

بەختەوەرن ئەوانەی مێژوویێکیان هەیە بیخوێننەوە. شکۆمەندیشن ئەوانەی بیرەوەریەکانی خۆیان دەکەنە تەوەرێك بۆ مێژووی نەتەوەکەیان. (مام قادر) لەو نوسینەدا هەر ژیان و بیرەوەریەکانی خۆی نانوسێتەوە، بەڵکو باسی جۆر و شێوازی ژیانی شارەکەی خۆی دەکات. ئەوەش شکۆیەکە بۆ هەر هەمووومان، نەك هەر بە تەنیا دەستکەوتێك بێت بۆ خۆی و منداڵەکانی. ئەو باس لە هەمووومان دەکات و ڕۆژگار و مێژوویێك دەگێڕێتەوە کە بە شێوەی دەقێکی نوسراو بەرچاو نەبووە.

من ئەو نوسینە هەر بە داهاتێکی تایبەتی نازانم، بەڵکو ئەوە میرات و سامانێکی نەتەوەییە. لە ئایندەشدا دەبێتە بەڵگەنامەیەك و کارنامەیەك بۆ داڕشتنی بنەمایەکی مێژوویی. ئێمە وەکو خەڵکی ئەو شارە لە زمانی کەسێك کە خۆی نموونەیەکی زیندووی ئەو واقیعەیە، ڕەوش و جۆری ژیان و گوزەرانی باوباپیرانمان دەناسین. هەر لە ڕێی ئەزموونەکانی ئەویشەوە، دەگەینە شێوەیەك لە ژیانی سادەی ئەوساکەی خۆمان، کە بە کۆمەڵێك گۆڕان و گەشەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و وسیاسی و ڕۆشنبیری و شارستانی تێپەڕیوە.

(مام قادر) وەکو نوسەر و سیاسەتمەدارێکی ناسراو بەو کارە هەڵنەستاوە، بەڵکو وەکو کەسێتیەکی دیاری ئەو شارە و بە هۆی ئەزموونەکانی ژیان و

رامان و روانینەكانی لە سایەی هەبوونی زاكیرەیەكی تیژرەوانە، هاوشانی رۆشنبیرێكی مەزن، پاك و پوخت قسە دەكات. بەمەش تایبەتمەندیەكی لێكۆڵینەوەیی دەداتە پاڵ نوسینەكەی خۆی.

هەموو كەسێك دەتوانێت قسە بكات، بەڵام چ قسەیەك دەكات، لە چ وەختێك، چ دەڵێت و بۆ كێ دەدوێت، ئەوە شتێكی گرنگە. ئەو كە قسە دەكات، ئامانجی ئەوە نیە هەروا قسەیەكی ووتراو بڵێتەوە. بەڵكو راستگۆیانە شتێك لە واقعی ژیانی خەڵكەكەی، بۆ ئەوەكانی باس دەكات. ئەو لێرە نەهاتووە تەنیا یادەوەری و یادگاریەكانی خۆی بنوسێتەوە، ئەگەر ئەوەش بكات حەقێكی خۆیەتی، بەڵام ئەو دێ لەسەر زار و چاوی كەسەكانی پێش خۆی و كەسایەتیەكانی سەردەمی ژیانی خۆی قسە دەكات، قسەكانی ئەویش هەر بەسەر زاری ئەودا نامێننەوە، بەڵكو دەبنە وشە و دەستنووس و لە قەوارەی كتێبێكدا خۆیان دەگرنەوە. ئەو هاتووە لە زەینی دێرینەوە، زمانێك دروست دەكات بۆ گەڕانەوەی زەمەنی رابردوو و تا لە ئایندەشدا بۆ نوسین و لێكۆڵینەوە بەكاربێت.

هەر گەلێك رابردووی دیار نەبوو، ناتوانێت قۆناغەكانی دیكەی خۆی ببینێت. گەلێكجار قسەكان هەر لەسەر زاری خۆماندا دووبارە دەبنەوە، ئەگەر تۆماریش نەكرێن، ئەوەندە رۆڵ و رەهەندێكی درێژخایەن ناگێڕێن. بەڵام ئەگەر قسە بووە وشە و وشەش تۆماركرا، ئەوە زمانێك دێتە كایەوە كە دەبێتە بەڵگەیەك. باوەڕیش ناكەم هەرگیز ئەو بەڵگەیە بە ئاسانی رەش ببێتەوە. ئەوكات كەس ناتوانێت نكوڵی لە بیرەوەریەكی نوسراوەوە بكات.

نوسەر نایەوێت وەكو پێشینانی خۆمان تەنیا قسەبكات. كاتێك تەمەنیشی تەواو دەبێت، بڕوات و هەموو قسەكانیش لەگەڵ خۆی ببات. ئەو هەوڵدەدات بە هۆی ئەو نوسینەوە شتێك دروستبكات، تا وەك میراتێكی زیندوو بمێنێتەوە. (مام قادر) ژیانی خۆی بە موڵكی خۆی نازانێت، بەڵكو بە سامانی نەتەوەكەی و میراتی خەڵك و گەلەكەی دەزانێت. ئەگەر ئێمە هەریەكە لە شوێنی خۆمانەوە بتوانین شتێك لە ژیان و ئەزموونەكانی خۆمان بە دەستی خۆمان بنوسینەوە، بێگومان بە دەرئەنجامێكی دیار و شێوەیەك سەروەریش دەگەین. ئەو كات رابردوو و مێژووی نەتەوەكەشمان باشتر و دیارتر دەردەكەوێت.

نوسەر بە وێنەیەكی رەش و سپی ناو هزری دێرینی خۆی، باس لە رابردوومان دەكات. بەڵام لە رێی وشە و قسەكانەوە، بە وێنەیەكی رەنگاورەنگ دیمەنەكان دەخاتە بەر چاومان.

(مام قادری گۆزێ)، وەکو فەرهەنگێك لە کەلەپوور و گەنجینەیەکی پڕ لە پەند و وانە و قسە نەستەقەکانی بەر ئاگردان، بەسەرهاتەکانی ئەو سەردەم نوێ دەکاتەوە، تا هەمووومان لە سەر زمان و زاکیرەی ئەودا بگەڕێینەوە بۆ زەمان و زەمینەی رووداوەکان. بۆ ئەوەش، کتێبەکەی بەسەر چەند تەوەرێك دابەش کردووە. پێ بە پێی قۆناغەکانیش، چیرۆکەکانی لەبارەی گۆڕان و گەورەبووی شارەکە دەگێڕێتەوە. ئەو وەکو ئابووریزانێك لە پێشینەی کارەدەستیەکانی بازاڕ و پیشە سەرەتاییەکانەوە دەدوێت. لە تەوەرێکی دیکە وەکو پسپۆڕێکی کۆمەڵایەتی باس لە دابونەریت و دیاردەکان دەکات کە بوونەتە خەسلەتێکی تایبەت بەو شارە. لە شوێنێکی دی وەکو مێژوونوسێك باس لە هەندێك کۆچ و هاتنی نەتەوە جیاوازەکانی وەکو (ئەرمەنی و تورك و ئیگلیز و جووەکان) بۆ دەقەرەکەمان دەکات. لە زۆر شوێنی تردا وەکو زمانزانێك باسی کەرەستە و ئامراز و دەستەواژە و زاراوەی زمانەوانی دەکات کە خەریکە لەبیر دەکرێن و هەوڵیش دەدات لە فەوتان رزگاریان بکات. لە دوا بەشەکانیشدا بە گێڕانەوەی چەندین رووداو و کارەسات و هەلومەرج، باس لە خەباتی سیاسی و چەکداری خۆی و خەڵکی ناوچەکە دەکات.

جگە لەوەی ئەو کتێبە ژیاننامەی (مام قادر)ە، بەڵام مێژوو و ژیانی کۆمەڵایەتی و کەلەپوری شارێکە، هاوکات من بە ئەرشیفێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگێکی کەلەپووری نەتەوایەتی دادەنێم، کە کتێبخانەی کوردی ئاوەدانتر و دەوڵەمەندتر دەکاتەوە. دەبێتە هۆیکارێکیش بۆ مانەوەی هەموو ئەو شتانەی خەریکە لەناو دەچن. ئەو لە دوا تەمەنیدا لەسەر زمانی مێژوو دێتە قسە و بەرلەوەی ماڵئاوایی لە ژیان بکات، قسەی خۆی دەکات.

ئەو بەختەوەری لەو ئاوڕدانە مێژووییە دەبینێتەوە. منیش لێرەدا چەند خۆم بە بەختەوەر دەزانم کاتێك دێم قسە لەسەر یاداشت و بیرەوەریەکانی ئەو کەڵەپیاوە دەکەم، کە بووەتە زمانحاڵی هەر هەمووومان و قسە لە رابردوومان دەکات. دیارە هەر کەسێك بەختەوەری خۆی لە شتێك دەبینێتەوە، بەڵام من ئەو کەسانە بە بەختەوەر دەزانم کاتێك دێن وشتێك لەسەر زیندوو بوونی نەتەوەو نیشتیمانیان دەکەن. ئەوەش دەبێتە هۆی مانەوەیان بە زیندوویی و هەرگیز کەس ناتوانێت لەبیریان بکات.

(مام قادر) هەر لە منداڵیدا خوێندنی لێ حەرام کراوە، خوێندەوارێکی ئاسایش نەبووە و بەهۆی خۆیەوە خۆی فێری خوێندنەوە و نوسین کردووە. ئەوەی

خوێندەوارێك و سیاسەتمەدار و نوسەرێك لەو شارە لە دەستی نەهاتووە، ئەو بەهۆی ئەو كتێبەوە خۆی لە قەرەی داوە. ئەوەش رووبەڕوو بوونەوەیەكی زیندوو و بوێرانەیە. هاوكات زاكیرە تیژ و زیندووەكەی زۆر لە دیبلۆم و بەهرەی ئەكادیمی بە بایەخترە، كاتێك دێ مێژووی شارەكەی خۆی دەنوسێتەوە. ئەو لەو كتێبەدا بۆ پێشكەوتنی شارەكەمان پێمان دەڵێت ئەوەی لە دەستمانە با بیكەین. هەریەكە لە جێگەی خۆی با بیكات، زەمەنی قسە تەواو بووە، با كردارە جوانەكانمان ببینین. هەروەها جەخت لە راستگۆ بوونی خۆمان دەكاتەوە بۆ ئەوەی مێژوویێكی راستگۆ و دروستمان هەبێت.

شوان عوسمان

هۆڵەندە، دێلفت

٢٠١٤/٦/٣

# « پێشەکی »

لە کاتی گرانیەکەی کۆتایی سیەکانی سەدەی ڕابردوو، باران نەبارین و خەڵکەکە زۆر تامەزرۆی باران بوون. من ئەو کات گەنج بووم. دەمە و عەسری ڕۆژێکی پایز، هەڵیکردە بارانێکی خۆش و هەموو خەڵکەکەی گەشاندەوە. سلێمان بەگ، باوکی عەمەر بەگ و باپیری خالید و حەمەدئەمین، هاوسێی ئێمە بوو. ئەو، نەك هەر پیاوێکی یەکجار دەنگ خۆشبوو، بەڵکو زانیاریەکی یەکجار زۆریشی لا دەست دەکەوت. بەڵام ئەگەر نەخۆش نەکەوتبا، کەس گوێی لە دەنگی نەدەبوو و خەڵکەکەش زۆر حەزیان لە دەنگە خۆشەکەی دەکرد. لە خۆشی هەڵکردنی بارانەکە، سلێمان بەگ هاتە بن هەیوانی ماڵەکەی و بە دەنگێکی بەرز، لاوکێکی ئەوەندە بەتام و چێژی گووت، خەڵکەکە خۆشی بارنەکەیان لەبیرچوو. زۆربەی خەڵکەکە هاتنە بن هەیوان و پێش دەرگاکانیان تا گوێیان لەو دەنگە خۆشەی سلێمان بەگ بێ.

پاش ماوەیەك، سلێمان بەگ نەخۆش کەوت و بە عەمەر بەگی کوڕی ووت کە حەیفە ئەو هەموو زانیاریەی لای من دەست دەکەوێ بچێتە ژێر گڵ و بزر بێ. عەمەر بەگ بە پەلە چووە دوای میرزا قادر کە ئەو کات خوێندەوارێکی باش و کاتبی میرانی قادر بەگ بوو، بەڵام چونکە ئەو مەلا بوو، تەنها دەیتوانی بە عەرەبی و فارسی بنوسێ. بەداخەوە سلێمان بەگ هەر زوو زمانی شکا و هەموو زانیاریەکان فەوتان.

لە ساڵانی پەنجاکاندا درکم بەوەکرد کە ئەو زانیاریانەی لەلای من دەست دەکەون، با وەکو ئەوانەی سلێمان بەگ نەفەوتێن. محەمەد مەولود (مەم)یش منی بە عەلائەدین سوجادی ناساند و هەندێك لەو قسە نەستەقانەی لای من دەستدەکەوتن، لە ڕشتەی مرواری بڵاوکردنەوە. ئەوکات من تازە خەریکی فێربوونی خوێندەواری بووم و دوای ئەو ڕۆژە، بڕیارمدا ئەو زانیاریانەی لەلام هەن تۆماریان بکەم. سەرەتایەکی باشیشم دەستپێکردبوو، بەڵام کە بووم بە پێشمەرگە، ئەوەی تۆمارم کردبوو لەگەڵ ئەو پەرتووکانەی کۆمکردبوونەوە لە دوای من لە ژێر گڵ نرابوون. بەداخەوە لە ماوەیەکی کەمدا هەر هەموویان فەوتان. لە ژیانی پێشمەرگایەتیشدا، ڕۆژانە بەسەرهاتەکانم لە دەفتەرێکی بچوکدا تۆماردەکردن. بە داخێکی زۆرەوە و وەك لەو پەرتوکە باسمکردوە، ئەو تۆمارەی بەسەرهاتەکانیشم بە دەستی خۆم لەناوبردن.

دوای ئەوەی گەیشتمە ئەمریکا، قسەکانی سلێمان بەگم جارێکیتر کەوتنەوە یاد و بڕیارمدا هەرچی زووە ئەوەی لەبیرم ماوە تۆماریبکەم. من ئەو وولاتەم بینی کە هەر لە سەرەتاوە وورد و درشتی زانیاری و مێژووەکەیان تۆمارکردون. خەڵك لێرە زۆر بە ئاسانی دەتوانن بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرا لەسەر مێژوو، کەلتور، زمان یان هەر بابەتێکی تر بنوسن و بابەتەکە دەوڵەمەندتربکەن. خەڵك و حکومەتی ئێرە زۆر بە تەنگ بەرقەرار بوونی ئەمن و ئاسایشی وولاتەکەی خۆیانن، کە ئەمەیان هۆکارێکی سەرەکی پێشکەوتن و پاراستنی هەموو شتێکی وولاتەکەن. ئێمەی کوردیش هەر چەند ساڵ جارەك تووشی نەهامەتی دێین و وولاتەکەمان زیاتر دوادەکەوێ و هەرچی کۆمانکردۆتەوە و دروستمانکردوە، جار لە دوای جار لەناو دەچن.

هیوادارم بە هەموو کەموکورییەکانی ئەم پەڕتوکە، توانیبێتم چەند بەردێك بخەمە سەریەك و بەم سەرەتایەم، خزمەتێکی بچوکی کورد و بەتایبەتی مێژوو و کەلتوری ناوچەی شەقڵاوەم کردبێ. بەڵکو ڕۆژێك نەوەی نوێ بە دوای ئەم زانیاریانە بگەڕێن و بتوانن نەك هەر لێکۆڵینەوەیان لەسەربکەن، بەڵکو دەوڵەمەند و تێروتەسەلتریان بکەن. بە هیوام ڕۆشنبیرانی ناوچەکە بەم زوانە دەستبکەن بە بونیاتنان و پێکەوەنانی ئینساکلۆپیدیای شارەکە.

قادر گۆزێ

# « ناوەرۆك »

# ڕەچەڵەك و ژیاننامەم

من لە ڕۆژگارێکی پڕ لە کێشمەکێش لە دایك بووم. ڕۆژگارێك کە چەند ساڵێك بەسەر کۆتایی هاتنی جەنگی پڕ لە نەگریسی جیهانی، واتا جەنگی جیهانی یەکەم و هەشت ساڵ بەسەر دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق و پاشانیش بەزۆر لکاندنی کوردستانی باشور بە دەولەتی تازە دامەزراوی عێراق تێپەڕیبوو. من لە بناری چیای سەفینی سەربەرز، لە شارەدێیەکی بچوك بە ژمارە، بەڵام بوك ناسا و پڕ لە ڕەز و باغ و دەیان سەرچاوەی ناوی سازگار، لە شەقڵاوەی بوکی کوردستان لە ساڵی ١٩٢٨ هاتوومەتە جیهان. بەڵام دەکرێ چەند ساڵێك گەورەتر بم لەم ساڵەی کە بۆ لە دایك بوونم لەسەر ناسنامەکەم دیاری کراوە.

بابم و دایکم هەردووکیان هەر لە بنەچە خەڵکی شەقڵاوە و لە بنەماڵەیەکی بەگزادەکانی ئەو شارە بوون. ناوی تەواوی من، قادر حەمەدنەمین قادر بەکر حەمەدنەمینە. حەمەدنەمینی باوکم بە گۆزێ و قادری باپیریشم بە قادۆل ناسراو بوون، هەروەها بەکری باپیرە گەورەشم ناسراو بوو بە بەکرە ڕەش. لە ئێستادا من لە بەرەبابی خۆمان لە هەموویان بەتەمەن ترم. ئەو زانیاریانەی دەربارەی باب و باپیرانم لەلامن و دێنەوە بیرم، لە باب و دایکم، باپیر و داپیرەم، هەروەها لە مامم و فاتیمەی پلك (پور)ی باوکم بیستوون. من لە تەمەنی پلکی باوکم دڵنیانیم، بەڵام بە قسەی خۆی و ئەو بەسەرهاتانەی دەیگێڕانەوە، تەمەنی تەواوێك لە سەروی١٠٠ ساڵ بوو و لەبەر تەمەن زۆریشی، نازناوی پیرەژنی پێبەخشرابوو.

حەمەدنەمینی باپیرە گەورەم، دوو ئامۆزای هەبووینە بە ناوی ولیا کە دەکاتە باپیرە گەورەی بنەماڵەی حاجی قادری ولیا و ئەوەیتریان ناوی میران بووە کە دەکاتە باپیرە گەورەی بنەماڵەی حاجی مستەفای حەمەد عەزیزی. ئێستاش لەگەڵ ئەوانە هەر خزمایەتیمان بەردەوامە و هەموو کات لەگەڵ ئەوان لە پشت یەکتری بووینە. باوکم دەیووت میرات لەیەکتر دەگرینەوە. ئەوکات شەقڵاوە چەند ماڵە بەگزادەیەکی سەرەکی لێبووە وەك حوسێن بەگی و بەکر بەگی. بەکری باپیرە گەورەشم هەر بەناوی ئەو بەکرە کراوە. میر مەحمەریەکانیش (میرەکان) لە ١٥٠ ساڵی ڕابردوو هاتونەتە شەقڵاوە.

بە گوێرەی قسەکانی فاتیمەی پوری باوکم، هەرلە سەروچاوەی کانیاوی ناوەنجی و لە ڕوباری ناوەنجی بەرەو خوار، لەولاشەوە تا نزیك سەردۆر، هی باپیرە گەورە حەمەدنەمین و ئامۆزاکانی بووە. لە هاوین لەوێ جێنیش بووینە و ئێستاش بەشێك لە باخەکان هەرماون و هەندێکیشیان فرۆشراون و

بەشێکیش زەوت کراون، یان کراون بە باغی وەسیەت. لە کۆن زۆرجار خەڵک هەبوو باغێك یان گۆڕە توویەکی بەناوی خێر دەکردە وەسیەت. کەسەکە ئەو زەویەی بەردەدا و خەڵك بۆخۆیان بەروبومەکەیان دەخوارد، یان ئەوەی باغی نەبوایە، لە هاوین کەپرێکی لێدروستدەکرد. زۆرجار کە دۆمەکان دەهاتنە شەقڵاوە، لەو گۆڕەتوو و زەویە وەسیەتانە هەڵیاندەدا. جاریش هەبوو خەڵك مەڕوماڵاتی بە مەبەستی لەوەڕ لەو زەویانە دەکردن.

حەمەدئەمینی باپیرە گەورەم، دوو کوڕی هەبووە بە ناوەکانی بەکر (ناسراو بە بەکرە ڕەش) و مەحمود (ناسراو بە حودە شەل). مەحمود لە ڕاوی بەراز لە خواروی شەقڵاوە لەگەل هەرس (وورچ) تێکدەناڵێ و دەرفەتی تفەنگ هاویشتنی نابێ. دوای شەڕێکی زۆر، بە خەنجەر هەرسەکە دەتۆپێنێ، بەڵام خۆی بە سەختی و لە چەندین جێ بریندار دەبێ و لە هاوەڵەکانی دائەبڕێ. بەهەر جۆرێکبێ، تفەنگ دەتەقێنێ ئینجا ئەوان دەیدۆزنەوە. دکتۆری عەشایەری مەحمود تیمار دەکا، بەڵام شەل دەبێ و ئەوکات نازناوی حودە شەلی ئەخرێتە پاڵ.

حودە شەل سێ کچ و دوو کوڕی هەبووە. من ناوی کوڕەکان نازانم، بەڵام کچەکان ناویان فاتمە وعانیشە و حەلیمە بوون. من دووانم لەوان بینیون (عانشە و فاتیمە)، بەڵام حەلیمەم نەدیوە. کوڕێکی حودەشل لە کاتی گرانی مردووە. گوایە ٤٠ ساڵێك بەرلە گرانیەکەی ساڵی ١٩١٤، گرانیەکی تر ڕویداوە. لەبەر گرانیەکە، بەکرە رەش و محمود بە ماڵەوە چوونە کوێستان، لەوێ ئەو کوڕەی مەحمود لە ڕووباری گادەری لە کوردستانی ڕۆژهەڵات بە ناو دادەچێ و دەخنکێ. کوڕەکەی تریشی بە نەخۆشی و ڕشانەوە مردووە. لە ناوچەی پیاوچاکی شێخ سەید لە شەقڵاوە، باخچەیەکی حودە شەل هەبووە و لە کاتی مردنی کوڕی دووەمی، ماڵی ئەو لەوێ بووە.

هەر بە ووتەی پورە فاتیمە، بەکرە ڕەشی مامی ئەو (کە دەکاتە باپیرە گەورەی من)، لە ڕێگای حەج مردووە. بەکرە ڕەش دوو کوڕی هەبووە، قادر (ناسراو بە قادۆل) کە من بە ناوی ئەو کراوم، کوڕی دووەمیشی ناوی عەبدوڵا بووە (ناسراو بە عەدیل). کاتێك بەکرە ڕەش مردووە، کوڕەکانی گچکە بووینە، مودەتێکیش بەر لە مردنی پەکی کەوتوە. دواتر مەحمود دوو لە کچەکانی خۆی دەداتە برازاکانی (کوڕەکانی بەکرە ڕەش). عانشە بۆتە خێزانی قادۆلی باپیرم و حەلیمەش بۆتە خێزانی عەدیلی برای. کچەکەی تریشی (فاتیمە)، دەبێتە خێزانی عەزیز، بەڵام عەزیز دوای ماوەیەك کۆچی دوایی دەکا. کوڕەکەیان هەر بەناو

مەحمودی باوکی فاتیمە دەکەن کە ناسرا بوو بە مەحمودی پیرەژن، ئێستاش نەوەکانی هەر لەوشوێنە دەژین.

دوای مردنی کوڕەکانی، مەحمود بێ پشت دەمێنێتەوە. لەلایەکی تریش شەل و پەککەوتە. هەروەها بەکرە ڕەشی براشی مردووە و کوڕەکانی ئەویش هێشتا منداڵ بووینە. هەندێك لە خزمەکانی حودە شەل، دەڵێن دەبێ موڵکی گیز(گوێز)ە کلۆرمان بدەیێ، ئەویش بۆیان ناسەلمێنێ. ئەوانیش حودە شەل لە تەویلەی ووڵاغ، بێ نان و ناو بۆ ١٢ ڕۆژ بەند دەکەن وە پێی دەڵێن، "ئەگەر ئەو موڵکەمان دەدەیێ، ئەگەرنا دەبێ لێرە بمری". کچەکان قوڕ لەسەر سەریان دادەنێن و بە گریان دەچنە لای باوکیان، کە دەبینن حاڵی زۆر شڕە، باوکیان ڕازی دەکەن و پێی دەڵێن "موڵکەکەیان بدەیێ، با لەو تەویلەی نەتکوژن"، ئەویش بە قسەی کچەکانی دەکا.

عەدیل دەبێتە عەسکەری تورك و لە موسڵ نەخۆش دەکەوێ. قادۆلی باپیرم خەبەری نەخۆشکەوتنی وەرگرتوە و بە سواری بە دوایدا چووە. وەختێك دەگەڕێتەوە، کەلانگوچکەکانی لە خمی ڕەشداون کە ئەوکات نیشانەی خاوەن پرسە بووە، ئینجا بووە بە شین و گریان. هەندێك کەسی شەقڵاوەیی کە لەگەڵ عەدیل سەرباز بووینە، بە قادۆلیان ڕاگەیاندوە کە براکەی مردووە و لە نەبی یونس شاردراوەتەوە. هەروەها قەبرەکەشی پیشاندەدەن. پاش مردنی عەدیل، حەلیمە شوو بە مەلا ئەحمەد دەکا، کە خەلیفەی ماڵی شێخ مستەفای هەولێر بوو، هەروەها ئامۆزای دایکی منیش بوو و ئێستاش نەوەکانی هەر لەو شوێنە دەژین.

قادۆلی باپیرم دوو کوڕی هەبووە، مام بەکر و حەمەدئەمینی باوکم. بەکر، برا گەورە بووە و چوار ژنی هێناون. لە ژنێکیان تەنها کوڕێکی دەبێ بەناوی عبدالله، لە ژنێکی تریش ئەحمەد و ئیسماعیل و فاتمە و ئەمین، ئەوەی دواییان هەرزوو مردووە. حەمەدئەمینی باوکیشم سێ ژنی هێناون. لە ژنی یەکەم، من کوڕی نۆبەرە و سێ کچیشی دەبن بەناوەکانی: حەلیمە و فاتمە و سارە. دایکم ناوی ئەمین بوو. لە ساڵی ١٩٣٤، دایکم لەکاتی منداڵبوندا، خۆی و کۆرپە نوێیەکەی گیانیان لەدەست دا. بۆ من و خوشکەکانم لەدەست دانی دایکمان کارەساتێکی گەورەبوو و تا ماوەکی زۆر کاریگەری لەسەر ژیانمان هەبوو. من بە مردنی دایکم دوچاری کۆستێکی گەورە بووم، جگە لە کارکردن بەم تەمەنە گچکەیە، سەرپەرشتی کردنی خوشکەکانیشم کەوتە سەرشان.

هەر ئەوەندەم لەزەت لە ژیانی منداڵیکرد، تا دایکم لە ژیان مابوو. دوای ئەو ڕۆژە و بەم تەمەنە بچووکەمەوە، بەر لەوەی تیشکی خۆر ڕووناکی پەخش بکا، کەل و پەلی کارکردنم ئامادە دەکردن وەك داس و تەور و لە ماڵ دەهاتمە دەرێ. نانی نیوەڕۆم لەگەڵ خۆم دەبرد، کە لەو سەردەم بریتی بوو لە نوردیە نانێك و سەرکە پیازێك، یان مشتێك مێوژ و گوێز. تا ئێوارەش پشوم نەدەدا و هەر لە کارکردن بووم لە ناو ڕەز و بەیار، کۆزی ئەسپیندار، گۆڕە گوێز، شینایی و توتن. ئانوك (پەرژین)کردن و ئاودێری و چاندن و بڕین و کۆکردنەوەی بەروبومەکان... کاری من بوون. باوکم خاوەنی ڕەز و باغێکی زۆر بوو و جگە لەوەش، چەند باخچە و گۆڕە گوێزی ڕەهنکراویشمان سەرپەرشتی دەکردن. سەرەڕای ئەوەی باوکم پیاوێکی زۆر هەبووی بوو، زۆری حەز لە کاسبی و جوتیاری دەکرد. بەڵام کە من پێراگەیشتم، ئەم ئەرکانە زۆربەی کەوتنە سەرشانی من. باوکم لە سەردەمی عوسمانیەکان ڕەز و باغی زورتری هەبوون، بەڵام چونکە دەولەتی عوسمانی بەردەوام لە شەڕوشۆڕدا بووە، هەردەم پێویستی بە پارە بووە، نیتر بەردەوام باجی لەسەر خەڵك زیاد کردووە. چونکە ئەم زەویانەش بەروبومێکی زۆریان بەرهەم نەهێناوە، بەشێکیانی بە پارەیەی کەم فرۆشتووە تا زەریبەی عوسمانیەکانی پێ بدا. تەنانەت لە سەرمەیدان شوێنی سەربازگەی کۆن هی باوکم بووە و لەبەر زۆری باج جێیهێشتوە. لەبیرمە دەلاقەیەکمان لە ماڵی خۆمان هەبوو کە پڕبوو لە تاپۆی ڕەشی عوسمانیەکان. هەروەها لە سەردەمی قادولی باپیریشم زۆر لە زەویەکانمان زەوتکراون، بۆ نمونە ئەو گردەی سەروی ئاوی بێترمە موڵکی ئەو بووە.

ئێمە دار گوێزی یەکجار زۆرمان هەبوو، ئەمەش وای کردبوو بەرهەمی گوێزمان زۆر بێ و ساڵانە زیاتر لە نیو ملیۆن گوێزمان دەفرۆشت. هەرلەبەر ئەم هۆیەش بنەماڵەکەمان بە ماڵی گۆزێ ناسراوە. ئەو کات سروشتی شەقڵاوە وا بوو، کەش و هەواکەی زۆر دڵڕفێن و فێنك بوو. زستانانیش بەفرێکی زۆر دەباری، ئەمەش بۆ بەرهەمی گوێز زۆر باش بوو. بەڵام بەداخەوە ئێستا ئەم شەقڵاوەیەی کە لە کۆندا هەبوو، وەك خۆی نەماوە و ژینگە و سروشتەکەی وا خەریکە بەرەو وێرانی دەچێ.

نۆ مانگ بەسەر مردنی دایکم تێپەڕبوو، باوکم ژنێکی تری هێنا بە ناوی (خان) کە خەڵکی کۆیە بوو. خان دوو منداڵی هێنانە دونیا، بەڵام یەکەمیان بە کۆرپەیی مرد. بەداخەوە خان و کۆرپەی دووەم، وەك دایکم بەهۆی منداڵ بوونەوە کۆچی دواییان کرد.



حەمەدئەمین گۆزێ

هەر چەندە من ئاماژەم پێ کرد کە بە پێی ناسنامەکەم ساڵی ١٩٢٨ وەك ساڵی لە دایك بوونم تۆمار کراوە، بەڵام دڵنیام بەرواری لە دایك بوونم پێش ١٩٢٨ بووە. چونکە من ساڵی ١٩٣١م چاك لەیادە کە لەگەڵ باوکم بۆ مەبەستی کارکردن و هاوکاری کردنی ئەو دەچووم بۆ ناو ڕەز و باغ، بەڵام لەبەر کەمی تەمەن نەمدەتوانی جۆت و گا یان پێمەڕەکاری بکەم و زەوی بکێڵم. تەنیا کاری بچوکم ئەنجام دەدان، وەك بڕینی قونێری دارمێو بە مشار و پاککردنەوەی ئەمامەکان. هەروەها لەبیرمە کە لە ساڵی ١٩٣١/ ١٩٣٢ پارە لە لیرە گۆڕا بۆ دینار. هەر لە ساڵی ١٩٣١ شەڕی بارزان دەستپێکرد و لەبیرمە سەربازێکی زۆر بەرەو ناوچەی بارزان بەڕێکەوتن. ئەو سەربازانە لە زەوی ماڵی تەهای ولیای موختار لە شەقڵاوە هەڵیاندا، کە پاشان نوتێلی خەیامی لەسەر دروستکرا و سێ ڕۆژ لەوێ مانەوە. حانوتی سەربازەگەکە خواردنی بۆ سەبازەکان دەکڕی و چاك لە بیرمە ئەو ڕۆژە بیست و یەك هەزار گوێز و هەندێ هەرمێ و هەناریشیان لە باوکم کڕین.

دوای کردنەوەی قوتابخانە لە شەقڵاوە، میرانی قادر بەگ هانی خەڵکی دەدا منداڵەکانی خۆیان فێری خوێندەواری بکەن. مام مەولودی باوکی محەمەد مەولودی ڕۆمانئنوس کە تازە لە شارۆچکەی شنۆ هاتبوونە شەقڵاوە و پیاوێکی شارەزا بوو، تەرخانکرابوو یارمەتی قوتابیان بدا کە بچنە قوتابخانە. ڕۆژانە بەدوای قوتابیان دەگەڕا و لە ڕۆژانی زستان و بەفر، جاری وا هەبوو لە پشتی خۆی دەکردن و لە ناوی دەپەڕاندنەوە.

بەشێك لە هاوتەمەنەکانم دەچوون بۆ قوتابخانە، بەڵام باوکم نەیدەهێشت من بچم. لەبیرمە چەندین جار هەوڵم دەدا لەگەڵ هاوڕێکانم بچمە بەر خوێندن،

بەڵام ئەو ڕێگری لێدەکردم و دەیگوت "کوڕم، من نامەوێ کاتی خۆت بە خوێندن خەسار بکەی، من دەوڵەمەندم پارەی زۆرم هەیە، خوێندن و موچەم ناوێ"! هەرچەند هەوڵم دەدا، نەیهێشت نە لە حوجرەی فەقێیان نە لە قوتابخانە نزیك ببمەوە. من هەموو بەیانیان دەهاتمە بەر دەرگای ماڵی خۆمان و بە دیار هاوڕێ و هاوتەمەنەکانی خۆم کە بەڕێگاوەبوون بۆ قوتابخانە دادەنیشتم. ئەوکاتیش قوتابخانە لە شوێنی قشڵەی ئێستا بوو وە ماڵی ئێمەش لە بەرامبەر مزگەوتی گەورە و لە دامێن کلێسەی سەرگردەکە بوو. ئەگەر مام مەولودیش بەدیار کەوتبا، باوکم دەیناردمە چاکی خەجەلاسێ، هەتا مام مەولود نەمبینێ و نەمباتە قوتابخانە.

ئەوکات ئەو شەقامەی ئێستای ناو بازاڕی سەرەوە، تەنها کۆڵانکی تەنگی قیرنەکراو بوو، هاموشۆی خەڵك و کەر و بار هەر بەوێدا بوو. بەرامبەر مزگەوت بەزستانان شوێنێکی قوڕاوی بوو وە کەر و باری تێدا دەچەقی. هەربۆیە زۆربەی ڕۆژانی زستان، ئەو قوتابیانەی ماڵەکانیان لە مزگەوت بەلای گردی زەیتون بوو، خۆیان لەکۆڵانە قوڕاویەکە نەدەدا و بە بەردەم ماڵی ئێمەدا و بەلای سەرەوە دەچونە قوتابخانە. ئەمە کاریگەری زۆری کردە سەر من.

دوای دەستپێکردنی جەنگی جیهانی دووەم، زۆربەی بنەماڵەکان باری داراییان بەرەو خراپی چوو بوو. باوکیشم وەك جاران پارە و پولی نەما و کەسیش مولکی نەدەکڕین، ژیان بەرەو گرانبوون دەچوو. لە ساڵی ١٩٣٩ لەبەر کەم بارانی، ووشکە ساڵی ڕووی لە عێراق کرد. گەنم زۆر کەم ببوو و بۆ کڕینیش دەستنەدەکەوت وە لە جیاتی بارانی پەرە، پەرەی بە بەفردا. بۆیە بەرهەمی دانەوێڵە زۆر ڕووی لە کزی کرد و زۆربەی خەڵك بۆ پەیداکردنی گەنم، بە کاروان ڕویان لە ئێران کرد. منیش بەو تەمەنە بچوکەمەوە بە کاروان چووم بۆ شاری نەغەدە. ڕۆمان نوسی گەورەی کورد محەمەد مەولود (مەم) لە ڕۆمانی ڕێگا زۆر بە جوانی باس لەو کاروانانە دەکا. من لە نەغەدە گەنمم کڕی و گەڕامەوە، بەڵام لەبەر کەم ئەزموونی من لە کاروان کردن، سەرەڕای ماندووبوونێکی زۆر و بڕینی ئەو سنورە دەستکردە بە پێیان، زۆر بە نرخی گران لەسەرم وەستا. زەرەرم پتربوو لە قازانج و ماندووبوونیش سەربار و بنبار. گرانیەکە بە شێوەیەکی وا بوو کە بە داخەوە زۆر کەس هەبوو دوای ئەوەی هیچ شتێکی لە ماڵ نەما، بە ناچاری منداڵەکەی خۆی فرۆشت. شایانی باسە لە گرانی گەورەش، لە کاتی شەڕی جیهانی یەکەمدا باس دەکەن کە چوار برای گەنج هەبوون زۆر باری ئابوریان ناڵەبار بووە، کەچی ئامادە نەبووینە

سواڵ بکەن و هەرچواریان لە ژوورەوە دەرگایان لەسەر خۆیان داخستوە و لە برسان و لە دیار ناگردان مردون!

لە ساڵی ١٩٣٩، تەلاری نەخۆشخانەی شەقڵاوەی کۆن لە بەرامبەر مزگەوتی حاجی برایم لە خوار قشلەی شەقڵاوە دروست کرا و بۆ یەکەم جار لە ژیانم لەوێ بووم بە کرێکار. دوای ئەم کارەم لە بەڕێوەبەرایەتی ڕێگا و بان هەر بە کرێکار دامەزرام. بە ڕۆژ لەوێ کارم دەکرد و ئێوارە و شەوانیش ڕەز و باغەکانم ئاودەدان. کە کاری ئەوێش تەواو بوو، ئیتر کرێکاریم بۆ خەڵك دەکرد. کە ئەوکات کرێی ڕۆژانەی کرێکار لە دوو تا چوار درهەم بوو. ئەوەی پەیداشم دەکرد باوکم لە ورد و درشتی ئاگادار بوو ڕادەستی ئەوم دەکرد.

هەرچەندە تەمەنی باوکم گەورە بوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٤١ ژنی سێیەمی هێنا، لەم دایکەشم پێنج برا و دوو خوشکم هەن بە ناوەکانی: هەیبەت، عومەر، ئەنوەر، جەلال، ئەجات، خەبات و کوردستان.

ساڵی ١٩٤٧ ناوم بۆ سەربازی هاتەوە. بەهۆی لەبەرکردنی بەرگی سەربازی، سەرجەم بەڕێوەبردنی کارەکان کەوتنە سەر شانی باوکم. باوکیشم لەبەر گەورەیی تەمەن و چوونە ناو ساڵانەوە، نەیدەتوانی ئەم ئەرکانە جێبەجێ بکا. حاجی سەلیم یەکێك بوو لە کەسایەتیە ناسراوەکانی شەقڵاوە و دەڤەری خۆشناوەتی، لە هەمان کاتیشدا زۆر دەوڵەمەند بوو وە منی زۆر خۆشدەویست. حاجی سەلیم بە باوکمی گووت کە من لە عەسکەری بکڕێتەوە. چونکە لەو سەردەمدا، ئەوەی پارەی هەبوایە دەیتوانی لە جیاتی سەربازی پارە بدا. حاجی سەلیم گووتی "ئەگەر تۆ پارە نادەی من پارەی بەدەل سەربازیەکە بۆ قادر دابین دەکەم، چونکە تۆ ناتوانی ئەم هەموو کارانە جێبەجێ بکەی". لە هەمان کاتیشدا حەمەد بلەیی خەزوری باوکم هەوڵی لەگەڵ باوکمدا و ڕازی کرد کە لە سەربازی بمکڕێتەوە. ئەوە بوو باوکم کۆزە ئەسپیندارێکی گەورەی فرۆشت و منی بە پەنجا و یەك دینار لە سەربازی کڕیەوە. بەڵام ئەوکات، دوای پارە دانەکەش بە میری، دەبوایە سێ مانگ سەربازیت هەربکردبا، ئینجا دەستبەردارت دەبوون.

لە بیرمە سەرەتای وەرزی بەهار بوو لە سەربازی ڕزگارم بوو و گەڕامەوە شەقڵاوە. لای هەمووشمان ڕوون و ئاشکرایە کە ئەرکی جوتیار لە بەهاراندا زۆر گرانە. هەرلە ڕەز بڕینەوە تا دەگاتە بن مێو و ڕەز کێلان و تانۆك کردن و ئەمام چاندن و خۆ ئامادەکردن بۆ شینایی چاندن و کاری تر. من تەنیا بووم و کارەکان ئەوەندە زۆر بوون، لە بەیانیەوە تا ئێوارە ماوەم نەبوو پشووبدەم.

هەرلە هەمان کاتدا، ڕەزێکی گەورەی ترێمان هەبوو، کە ئێستاش ماوەتە و لە پشت چیای سۆرکە و بە قەشان بەناوبانگە. خەریکی کارکردن بووم لەوێ، سەگێکی هار پەلاماریدام و برینداریکردم. لەم پەلاماردانە زۆر ترسام کە میری پێی بزانێ. ئەوکات ئەو کەسەی سەگی هار پەلاماری بدابا، ڕەوانەی نەخۆشخانەی موسڵیان دەکرد و چل ڕۆژ لە نەخۆشخانە دەمایەوە و دەرزیان لێدەدا. من لەبەر ئەم ترسە، پەنام بۆ دەرمانی کوردەواری برد، کە ئەوکات زۆر باو بوو. چووم بۆ گوندی پیرزین، کە دکتۆرێکی میللی لەوێ بوو و چارەسەری بۆ ئەو کەسانە دەکرد کە سەگی هار گرتبوونی. ئەو پیاوە لە ئەوەی مەلازادەکان بوو وە خودا ئەو بەهرەیەی پێدابوو. دوای گەیشتنم بۆ ئەم گوندە، پزیشکەکە بەر لەوەی چارەسەرم بۆ بکا، گوتی دیارە تۆ دەوڵەمەندی کە پەنجا و یەك دینارت لە بەدەل سەربازی داوە، ئەو برە پارەیەش بدە بە من تا چارەسەرت بۆ بکەم! من تەنها یەك دینار و نیوم پێبوو، کە بۆ ئەوکات پارەیەکی کەم نەبوو! لە کابرا تورە بووم و گوندەکەم بەجێهێشت.



قادر گۆزێ ١٩٤٧

هەندێك ماڵی خەیلانی دۆستی ئێمە هەبوون و هێشتا لە هەوارە زستانیەکەیان بوون لە نزیك مەلا نۆمەر. ئەوان هەندێك پارەی باوکم قەرزار بوون، بەڵام کە چوومە لایان ووتیان بەم دەم و دەستە هیچ پارەمان لا نیە. دۆستێکیشم لە گوندی قەرەموتك لە دەشتی هەولێر هەبوو ناوی مستۆی مامزێ بوو، چووم بۆ لای ئەو و زۆر ڕێزی لێنام و بەخێرهاتنێکی گەرمی کردم. منیش ئەوەی بەسەرم هاتبوو بە وردی بۆم گێڕایەوە. پێی گووتم پشوو بدە و خەم مەخۆ. شەو لەو گوندە مامەوە. بەیانیەکەی خۆی لەگەڵم هات بۆ گوندی پیرزین، دیار بوو کابرای دکتۆر زۆر دۆستی ئەو بوو. کە گەیشتینە گوندەکە، کابرا دکتۆرەکەی سەرزەنشت کرد. سێ دیناری لە دەستی کابرا نا و پێی گووت،

چارەسەری بۆ بکە ئەمە برای منە. کابرا لەم هەڵس و کەوتەی لەگەڵ منی کردبوو زۆر پەشیمان بووەوە و دەستی کرد بە چارەسەر کردنی برینەکەم. سەرەتا قەتماغەی برینەکەی هەموو لابرد. ئینجا یەکێك لە قامکەکانی خۆی زامدار کرد و چەند دڵۆپە خوێنێکی لە برینەکەم هەڵسوی. دوای بەکارهێنانی دەرمانێکی کوردەواری بۆ سەر برینەکەم، هەندێك تفی ناو دەمی خۆشی لە برینەکە هەڵسوی. پاشان ئەنگوستە بریندارەکەی لە جامە ئاوێك وەردا و کردیە خوێناو و پێی گووتم کە ئاوەکە بخۆمەوە. سەرەڕای ئەم هەموو بێزەی کە هەمبوو، بە ناچاری ئاوەکەم خواردەوە. دکتۆر گووتی خوات لەگەڵ، چاك دەبیتەوە. هەرچەندە بڕوام بەم جۆرە چارەسەرکردنە نەبوو، بەڵام ماوەیەکی کەمی پێچوو بە تەواوی چاك بوومەوە و گەڕامەوە بۆ شەقڵاوە.

هەر کە گەڕامەوە شەقڵاوە، من و عەولای قادری شامی و چەند برادەرێك بە شێوەی کاتی لە بەڕێوەبەرایەتی ئەشغال دامەزراین. کابرایەکی خەڵکی سلێمانیش بە ناوی حەمە چاوەش، چاودێری سەر کرێکارەکان بوو. کە منی دەدی زۆر بە دڵسۆزی کاردەکەم، زۆری ڕێز لێدەگرتم و هاوکاری زۆری دەکردم. مانگانە موچەکەمان بۆ دەهاتە موهەندیسخانەی شەقڵاوە و زۆربەی جار گۆرانی شاعیر موچەکەی بۆ دەهێنایین و پێنج پۆلیسیشی لەگەڵ دەهاتن. ئەوکات ئەویش لە بەڕێوەبەرایەتی ئەشغال کاری دەکرد. جارێك لە ناوەڕاستی دابەشکردنی موچەبوو کە شیعرێکی بۆهات. نزیکەی نیو کاتژمێری خایاند تا نوسینەکەی تەواوکرد، ئینجا شیعرەکەی بەدەنگێکی بەرز بۆ ئێمە خوێندەوە.

لە ١٩٥٢/١/١، ژیانی هاوسەریم لەگەڵ خەدیجەی کچی قادری وەسمانە ڕەش پێك هێنا کە ئەویش خەڵکی شەقڵاوەیە. لەو تەمەنەی کە لەگەڵ هاوسەرەکشم بەسەرم بردووە، زۆر بەختەوەربووین و لە خۆشی و ناخۆشی ژیان پێکەوە گوزەراندومانە. بەرهەمی ئەم هاوسەرگیریەمان شەش کوڕ و دوو کچن بە ناوەکانی: محەمەد، ئەسعەد، هونەر، بەختیار، ژیان، ئەزار، سەردار و ڕۆناك، کە سەرجەمیان لە تاراوگە دەژین و تا ئێستا جگە لە کوڕ و کچەکانمان، ٢١ نەوەمان هەیە.

لە ساڵی ١٩٥٤، مامۆستا عەلائەدین سوجادی سەردانی شەقڵاوەی کرد، محمد مەولود لە دوکانی مام تەهای کاوانی کە بەرامبەر بە قشڵە بوو، بە مامۆستا سوجادی ناساندم. ئەوکات مامۆستا سوجادی خەریکی کۆکردنەوەی قسەی نەستەق و کورتە چیرۆك بوو بۆ ڕشتەی مرواری. مەم بە مامۆستای ووت کە من زۆر شتی لەو بابەتە دەزانم کە بۆ ڕشتەی مرواری دەگونجێن. منیش بە مامۆستام ووت کە من نەخوێندەوارم، مامۆستا عەلائەدین سوجادیش ووتی من

چارەیەك دەدۆزمەوە. دوای ماوەیەك مامۆستا ئەحمەد مەلا هادی ناردە لام، كە ئەوكات لە كۆلێجی ئادابی بەغدا و لە بەر دەستی مامۆستا عەلائەدین دەیخوێند. لەگەڵ مامۆستا ئەحمەد، دە تا پانزە لاپەڕە نوكتەمان نوسیەوە، مامۆستا ئەحمەد بۆ مامۆستا عەلائەدین سوجادی بردنە بەغدا. هەندێك لەو نوكتانە لە بەرگی شەشەمی ڕشتەی مرواری بڵاو كرانەوە، بەناوی قادرحەمەدئەمین نەك قادری گۆزێ.

ئەوەی كە هەمیشە خەمی بۆ دەخۆم، ئەچوونم بۆ قوتابخانە بووە. بەڵام بە هەوڵ و ماندوو بوونی زۆر و بە پشتگیری چیرۆك نوس و ڕۆمان نوسی گەورەی كورد محەمەد مەولود (مەم)، خاوەنی پەنجا فلس و برسیەتی بەهێزترە و هەردوو ڕۆمانەكەی پایزە خەون و ڕێگا، توانیم ئەم كەلێنەش لە ژیانی خۆم پڕ بكەمەوە. داواشم لە باوكم كرد كە براكانی ترم بنێرێتە بەر خوێندن، كە من بێ بەش بووم، با ئەوان بێ بەش نەبن. ئەوە بوو باوكم ڕازی بوو بیاننێرێتە قوتابخانە و خۆشبەختانە جەلال و ئەنوەری برام خوێندیان تەواو كرد و بوون بە مامۆستا.

لە وەرزی بەهاری ساڵی ١٩٥٤، بڕیارێكی وەزارەتی مەعارف زۆر خۆشحاڵی كردم. قوتابخانەی شەوان لە شەقڵاوە كرایەوە بۆ ئەو كەسانەی كە بە منداڵی لە خوێندن دابڕاون تا بە گەورەیی ئەم هەلەیان بۆ بڕەخسێ. مەم داوای لێكردم خۆم لەو قوتابخانەیە ناونوس بكەم. سەرەتا بۆ ماوەی چل و پێنج ڕۆژ درێژەم بە خوێندن دا. لە بیرمە پرۆگرامی خوێندنەكەمان ئەلف و بێی عەرەبی بوو وە سەرجەم كتێبەكەم بە ماوەی ئەو چل و پێنج ڕۆژە لەبەركرد، جگە لە پیتەكانی (س و ش) چونكە ئەم دوو پیتەم لێ تێكەڵ دەبوون. دوای ئەوە بوو بە پشووی هاوین. لە هاوین مەم هانی دەدام كە پەرتوكی زیاتر بخوێنمەوە. داوم لە ڕەسول كاكۆ كرد كە كوڕەكەی خوێندكار بوو لە كەركوك، كتێبی خەیامم بە كوردی بۆ بێنێ. هەرچەندە كتێبەكە بە پێنج درهەم بوو! بەڵام كە بۆم هات زۆر دڵخۆش بووم. پێشتریش هەموو شیعرەكانی خەیامم لە ڕێگای گوێگرتن لەبەر كردبوون. مەم داوای لێكردم بۆ ئەوەی نوسینم باش بێ، چیرۆكە فۆلكلۆریەكان و بەیت و باڵۆر و قسەی ئەستەق بنوسمەوە. بەڵام بەداخەوە لەبەر ئەوەی بە پیری چوومە بەر هەویری و بە ڕۆژ كارم دەكرد، ئەو دەرفەتەم بۆ نەڕەخسا. نیتر فێری خوێندنەوەیەكی باش بووم، دوای تەواو بوونی پشووی هاوین، ئەمجارەیان چوومەوە قوتابخانە، خوێندنی ئەوجارەشمان پیتی كوردی بوو و توانیم نزیكەی پازدە ڕۆژی تر بخوێنم. بەهۆی دامەزراندنم لە مەكینەی كارەبا، كە شەوانە ١٢ كاتژمێر كارم تێیدا دەكرد، لە خوێندن دابڕام. تامەزرۆییم بۆ خوێندەواری وای لێكردم كە لەم ماوە كورتەدا خۆم وا فێری خوێندن بكەم. زۆر

له بڵاوكراوه و شیعر و نوسینی كوردی ساڵانی چلەكان بەدواوه، لام دەست دەكەوتن و خوێندومنەتەوه. بەردەوامیش هەوڵمدەدا قەرەبوی ئەو ماوەیه بكەمەوه كه لەدەستم چوو بوو. له شیعر و ئەدەبیاتیشدا، دیوانی زۆربەی شاعیرانم خوێندۆتەوه، بەڵام مەم و زین و چوار خشتەكیەكانی خەیامم به هەردوو وەرگێڕانەكەی هەژاری موكریانی و شێخ سەلامەوه لەبەر كردبوون، و ئێستاش دەتوانم بەراوردیان بكەم.

ئەوەی كه له منداڵی بۆ من مەیسەر نەبوو، هەوڵم داوه بۆ منداڵەكانم جێبەجێ بكەم، به تایبەتی خوێندن. سوپاسی خودای گەوره دەكەم كه سەرجەم جگەرگۆشەكانم هەڵگری بڕوانامەن. منداڵەكانیشم به شێوەیەك پەروەرده كردوون كه نیشتیمان پەروەری و داوێن پاكی و خیانەت نەكردن ببینه بەشێك له ژیانیان.

دوای ئەم هەموو تەمەنه، ئاواره بووم و له وویلایەتی كۆلۆرادۆ له ئەمەریكا لەگەڵ خانەوادەكەم ژیان بەسەر دەبەم و زۆر بەختەوەرم. سروشتی كۆلۆرادۆ زۆر جوان و دڵگیره و شوێنێكی گەشتیاری خۆشه. سروشتەكەی زۆر نزیكه له چیاكانی كوردستان وه هەر بۆیه له ٥٠ ویلایەت ئێرەمان هەڵبژارد كه لێی بژیین. له وولاتانی جۆراوجۆر خەڵك به مەبەستی كات بەسەربردن و ڕاو و خلیسكێنەی سەر بەفر ڕوو لەم وویلایەته دەكەن. منیكیش كه هەرله منداڵیەوه خولیای ڕاوكردن بووم، دڵم زۆر پێی خۆشه.

ساڵی ٢٠٠٠ لەگەڵ هاوسەرەكەم و سەرداری كوڕم چووین بۆ حەج و ئەم ئەركه پیرۆزەمان بەجێ هێنا. لەم چەندساڵەی دواییش دەرفەتم بۆ ڕەخسا كه زۆر وولات بگەڕێم، بەڵام لەو وولاتانەی كەمن بۆی چووم، جگه له وولاتی دایك، دڵم زۆر به سوریا دەكرایەوه. به تایبەتی شوێنەواره مێژووییەكان و گۆڕی سەلاحەدینی ئەیوبی و مەزارگەی یەحیا پێغەمبەر (د.خ).

ئێستاش پیری پەكی خستووم و چەندین نەخۆشی دەوریان داوم و بوونەته میوانی هەمیشەم. بەڵام دەستەوەستان نەوەستاوم و ڕۆژانه دەمەوێ لەسەر پێ بوەستم و به پێیان ڕێگا ببڕم. كه له ماڵەوەشم، لەسەر ئەنتەرنێت به دوای هەواڵی جیهانی و كوردستان دەگەڕێم و له ژوورەكانی ئینتەرنێت، لەگەڵ برادەران و كوردان له سەرتاسەری دونیا دەدوێم.

هەر وەك له پێشدا ئاماژەم پێكرد، من زۆربەی ڕۆژەكانی ژیانم خەریكی كاركردن و كاسبی بووم، بەڵام وەنەبێ كاركردن وای لێكردبم كه له سیاسەت به

دووربم. چونکە بۆ ئێمەی خاوەن خاکێکی داگیرکراو و نەتەوەیەکی زوڵم لێکراو، سیاسەت کردن و بەشداری کردنمان بە هەر جۆرێك بێ لە شۆڕش و کاری شۆڕشگێڕایەتی، بۆتە بەشێکی دانەبڕاو لە ژیانی هەر تاکێکی ئەم نەتەوەیە. بە تایبەتی بۆ منێك کە هەموو تەمەنم جوتیاری و کرێکاریم کردوە. نەتەوەکەی خۆم زۆر خۆش ویستوە هەر زوو هەستم بەوە کردوە کە خاکەکەمان لەت لەت و داگیر کراوە و وەك نەتەوەش بە دەستی داگیرکەرانەوە چەوسێنراینەتەوە.

لە تەمەنی هەرزەکاریمدا، سەرەتا وردە وردە بە دوای دەنگ و باسی سیاسیدا دەگەڕام. لە ساڵی ١٩٤٠، پەیوەندیم بە حیزبی هیوا کرد. لەم کارە بێ گومان کاریگەری کۆمەڵە برادەرێکم لەسەر بوو، کە لەو کاتدا کەسایەتی ڕۆشنبیر و هەروەها کەسانی ووشیاری ئەو سەردەمە بوون. کەسی واشیان تێدابوو کە بۆ من وەك مامۆستا وابوون. بەداخەوە، پیری وای لێ کردووم ناوی بەشێکیانم لە بیر نەمێنێ. بۆ نموونە مام قەشە جوبڕانیل، ڕەسول کاکۆ، مەلا گچکەی شاعیر، وەسمان قادر، مەم، محەمەد ساڵح کامەلا... بە تایبەتیش محەمەد مەولود (مەم) کە خوێندەوارێکی زۆر وشیار و خاوەن قەڵەمێکی جوان بوو لە بواری وتار و چیرۆك نوسین و تەنانەت شیعر و ڕۆژنامەوانیشدا. مەم زۆر کاریگەری بەسەرمەوە هەبوو پێی دەگووتم "هیچ شتێك بۆ مرۆڤ ئەستەم نیە گەر بیەوێت ئەنجامی بدا". هانی دەدام خۆم فێری خوێندنەوە و نوسین بکەم و گرینگی بە خوێندنەوە بدەم، هەروەها گۆڤار و ڕۆژنامە بخوێنمەوە. ئەمانە هەر هەمووی وای لێکردم کە مرۆڤێکی بێ ئاگا نەبم کە لە دەوروبەر یان لە ناو وولاتەکەمدا چی دەگوزەرێ.

دوای دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان، حیزبی هیوا خۆی لەناو پارتی تواندەوە، بەڵام محەمەد مەولود و قادر حەسەن، کاریگەریان لەسەر من هەبوو. ئەوە بوو لە ڕێی قادر حەسەنەوە من پەیوەندیم بە پارتی دیموکراتی کوردستان کرد.

لە ساڵانی پەنجاکاندا، حزبی شیوعی دەستێکی باڵاتری لە پارتی لەناو جەماوەری شەقڵاوەدا هەبوو. دوای کودەتاکەی عەبدولکەریم قاسم لە ساڵی ١٩٥٨ و ڕوخانی ڕژێمی پاشایەتی، خەڵك زۆر هەستی بە ئازادی دەکرد و خەڵکی ناوچەکە ببوون بە دوو بەش. بەڵام ئەم لەت بوونەی جەماوەر، منی زۆر بێزار کردبوو. هەرچەندە زۆربەی ڕێکخراوە پیشەییەکان بە دەستی شیوعیەکانەوە بوون، کەچی دەیانەویست ئەوانی تریش بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان و پارتیش ئەمەی قبوڵ نەبوو. بەڵام بە هۆی بەرزبوونەوەی هەستی

نەتەوایەتی، ڕۆژ بە ڕۆژ جەماوەری پارتی لە هەڵکشان و شیوعیەکان لە داشکان دابوون. لەو کاتەدا لە شەقڵاوە شارەوانی نوێنەری کرێکارانی دیاری دەکرد بۆ سەرۆکی نیقابە، پارتی بۆ ئەم پۆستە منی کاندید کرد و حزبی شیوعیش عەوڵای قادر شامی کاندید کرد کە برادەرێکی زۆر نزیکی من بوو. هەڵبژاردن دەستی پێکرد من زۆربەی دەنگەکانم بەدەست هێنا و بووم بە سەرۆکی نیقابە. بەم دەرچوونەم، بەینی من و عەوڵا بۆ ماوەیەك کزبوو، بەڵام تا ئێستاش هەر برادەری زۆر خۆشەویستی یەکترین و نەمانهێشت جیاوازی ڕاو بۆچونمان چی تر کاریگەری لەسەر هاوڕێیەتیمان بکا. تا ساڵی ١٩٦١ و هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول من لەو پۆستە مامەوە، دوایی ڕووم لە شاخ کرد و بۆ ماوەی پێنج ساڵ بووم بە پێشمەرگە. پاش گەڕانەوەم لە پێشمەرگایەتی، لە شارەوانی دەستم بە کار کردەوە. لە دوای بەیانی ١١ ئازاری١٩٧٠، پارتی دووبارە داوای لێکردم کە ببم بە سەرۆکی نیقابەی شارەوانی و بۆ ماوەی چوار ساڵ لە نیقابە کارم کرد و تا خانەنشین بوونیشم لە ساڵی ١٩٧٩، هەر لە شارەوانی مامەوە.

# شوێنەوار

بە گوێرەی لێکدانەوەی هەندێ زانایانی مێژوو، مرۆڤ ژیانی نیشتەجێبوونی بۆ یەکەم جار لە کوردستان دەست پێکردوە و لە ئەشکەوتەکان هاتوتە دەر. ئەم سەرەتایە بە هەنگاوی وورد و بچوك ڕۆیشتوە و بە هەزاران ساڵی ویستوە تا گەیشتۆتە ئەم ڕۆژەی کە خەریکە مرۆڤ دەگاتە ئەستێرەکان. پێ دەچێ مێژووی شەقڵاوە زۆر کۆن بێ و بەڵگەی زۆریش لەسەر ئەم بابەتە هەن، بەڵام تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی چاکیان لەسەر نەکراوە. من ناسەوارناس نیم، بەڵام زۆر خولیای مێژوو و ناسەوارم و زۆر بابەتی مێژوویی دەخوێنمەوە.

ئەوەی من بزانم، بابەتی ئاوەدانی لە شەقڵاوە لە مێژوو زۆر باسی لێ نەکراوە. من هەندێك شوێنەواری شەقڵاوە دەخەمە ڕوو کە پێ دەچێ مێژوەکەیان زۆر کۆن بێ و لەوانەیە هەندێکیان سەدان ساڵ و بگرە بۆ هەزاران ساڵ بەر لە ئێستا بگەڕێنەوە. ئەشکەوتی شێخ وسو ڕەحمان (مار ڕەبەن بویا) لە چیای سەفین یەکێکە لە شوێنەوارە کۆنەکان. گەر سەیری چۆنیەتی دروستکردنی ڕێگای ئەشکەوتەکە و دیواری بە بەرد و قسڵ دروستکراوی، هەروەها شێوازی هەڵکۆلینی بیری ئاوەکەی بکەین، گومان نامێنێ کە ئەم شوێنە دەبێ مێژوویەکی زۆر کۆنی هەبێ. پیاوێك لە بەیتەریە هەبوو ناوی حەمەبۆر بوو، پیاوێکی زۆر زانا و زیرەك بوو. حەمەبۆر تاق و دیوارو ئەوشوێنەی ناو شێخ وسو رحمان گەڕابوو، هەندێك پارچە ئێسقانی مرۆڤی دۆزی بونەوە. هەروەها تۆمای پاتری کە هەموو ئێوارەی یەکشەمان دەچووە مەزارگەکە و مۆمی پێ دەکردن، دەیگووت لەو شوێنە سەلیبێکی زۆر کۆنم دۆزیوەتەوە. ئەو زۆر لەگەڵ من و باوك و باپیرم دۆستایەتی خۆش بوو. زۆر جار کە دەچوومە کاروانی هەولێر پاکەتێك مۆمم بە دیاری بۆ دەهێنا و زۆر پێ خۆشحاڵ دەبوو.

کاتی خۆی لە ناوچەی داری مەرحەنان (مار یوحەنان) ناسەواری گوندێك بەدیار کەوتبوو کە گوایا ناوی گوندی لەرزەك بووە و من بۆخۆم دوو کاولە خانووم لێ دیوە. یەکێك لە مەسیحیەکانی شەقڵاوە مۆرێکی لەوێ دۆزییەوە. پرسیارم لێی کرد و ووتی "مۆرەکەم ناردە موسڵ و لەوێ پشکنینیان بۆ کرد، دەرکەوت هی زەمانی چاخی بەردینە"، هەروەها ووترا بوو کە پێ دەچێ مۆری بنەماڵەیەك بووبێ. دیارە ئەوکات هەر بنەماڵەو مۆرێکی تایبەتی هەبووە. من بۆ ماوەیەك لەو شەقامەی لە بناری چیای سەفین لە ناوچەی بەرزایی بانەنۆك کارم دەکرد. شەقامەکە بە تەنیشت کۆنە گوندەکە دەبردرا و لەوێ گۆڕێکمان دۆزییەوە کە ئێسکی لاقەکانی لە مرۆڤی ئێستا زۆر زۆر

گەورەتر بوون. حاجی مستەفا کە پیاوێکی دونیا دیتە و زانا بوو، لەناو بەیاری خۆی بوو کە دەکەوێتە بەرامبەر ماریوحەننا. لێمان پرسی کە شتێکی وای پێشتر بینیوە، ئەویش ووتی "نێسکە سەری مرۆڤی زۆر گەورەم لەناو بەیاری خۆم دۆزیوەتەوە کە هێندەی خەرەکێك دەبوو".

قەڵاتی کاولان شوێنێکی ترە و ئەویش کەوتۆتە گەرەکی مەسیحیەکان، لە خواروی مار یوحەننایە و هێشتا ئاسەواری ئاوەدانی لێ ماوە. هەروەها لە گەرەکی میرەسەن (میر حەسەن یان سابیراوەی ئەمرۆ) شوێنەواری قەڵاتێك لەسەر گردەکە بوو کە بەردەکانی دەورەی دەرگاکەی هەر مابوون، بەڵام بەداخەوە لەگەڵ ئاوەدان بوونی ناوچەکە، شوێنەکە تێکدرا و بەردەکانیش بۆ دروستکردنی خانوو بردران. هەروەها شوێنەواری چەند کاولە ئاشێکیش لەوێ هەبوون. بەشێك لەو شوێنەوارانە لە پەرتوکێك دەربارەی شوێنەوارەکانی عیراق بەناوی "المواقع الاثرية في العراق" ئاماژەیان پێ کراوە.



سابیراوەی کۆن
لە ئەرشیفی مصطفی
مصور وەرگیراوە

کاولە ئاشێك لە ناو ڕەزەکەی حەسەن مام وسو بەرامبەر نوتێلی مەشکور هەبوو. لە کاتی هەڵوەشاندنەوەی ئاشەکە، دەرکەوت کە ڕەوڕەوەی ئاشەکە زۆر زۆر کۆن بوو. ئەسعد عەزیزبەگ، کاتێك خشتی بۆ خانوی خۆی دەبرین، کوپێکی دۆزیەوە نیسکی کچێکی تێدابوون و خڵخاڵێکی زێری لە پێ دابوو. قسەی بۆ من کرد کە هەرهەمان ڕۆژ بردبویە هەولێر و فرۆشتبووی، ووتی "گەر حکومەت پێی بزانیبایە، دەیووت خەزێنەی دۆزیوەتەوە و لێم نەدەگەڕا".
حاجی سەلیم کۆنە خانوەکی لە جووەکان کڕی بوو، کاتێك خەریکی نۆژەنکردنەوە و بناغە لێدان بوون، کوپێکیان دۆزیەوە کە نیسکی مرۆڤێکی تێدابوون.

لە پەڕتوکێکی ئایەتوڵا مردۆخیم خوێندۆتەوە کە کوردەکان سەرەتا لاشەی مرۆڤیان لەسەر چیاکان فڕێداوە بۆ ئەوەی ببنە خۆراکی ئاژەڵان. پاشان لە جێگای ئەهێنی و هەر یەك لە شوێنێك لە کوپیان ناون و شاردویانەتەوە. دوای ئەوە گۆڕستان دروست بوونە و لەوێ نێژراون.

کاتی خۆی شوێنێك هەبوو بە ناوی گۆڕدیوان، ئێستاش پێی دەڵێن حەسار کە کەوتۆتە دەربەندی شەقڵاوە و لە سەرەتای هەشتاکان تەلاری قوتابخانەی پیشەسازی لەسەر دروستکرا. لە گۆڕدیوان ناسەواری گوندێکی کۆن هەبوو و شتی لێ دەدۆزرایەوە. جارێکیان پارەی لێ دۆزرایەوە کە نەدەزاندرا بۆ چ مێژوویێك دەگەڕایەوە، ئەوەبووعوسمان بەگ پارەکەی نارده مۆزەخانەی بەغداد. لە ڕێگای پشت حەساریش زەویەکی لێیە پێی دەڵێن قەرەنیان، کە گڵکۆی زۆری لێ بوون. بەیاری ئێمەش لە نزیك ئەوێ بوو و باوکم لە مەسیحی و جووە بەتەمەنەکانی دەپرسی کە ئاخۆ قەبری ئەوانە، ئەوانیش دەیانگووت دەبێ بەر لە پەیدابوونی ئاینی ئێمە بێ. لەوێ ئێسك و پروسکێکی زۆر بەدیار کەوتبوون، پێ دەچوو ئەو شوێنەوارە زۆر کۆن بووبێ. هەروەها شوێنەواری گوندێك لە کۆنە ماوەران هەبوو، هەتا ئەم ڕووانەش بناغەی کۆنە خانوو لەوێ بەدەردەکەوتن.

لە پشت چیای سۆرك گردێك هەیە قەڵاتە سۆری پێ دەڵێن، ئاسەواری گوندێکی کۆن لەوێ دیارە. لە پیرەکانم بیستوە کاتی خۆی ئەو ناوچەیە باغی سماقی لێ بوون و کاتێك کە زەویەکانیان کێڵاون، گوایا بۆتەی زێرینگرانیان لێ دۆزیوەتەوە (بۆتە شتێکە زێری لە ناو دەتوێننەوە). هەروەها قەننە سەبیلیشی لێ دۆزراوەتەوە. بەخۆشم پارچە گۆسکە (گۆزە)م لەوێ دۆزیوەتەوە. هەرچەندە تووتن تەنها چەند سەدەیەکە دەکێشرێ و لە ئەمریکا دۆزراوەتەوە، بەڵام دیارە خەڵکی ئەو شوێنە زۆر لەمێژە قەننە سەبیلیان بەکارهێناوە بۆ کێشانی شتێکی وەك تووتن، یاخود لەوانەیە توتن لە کوردستان زۆر لە کۆنەوە هەبوبێ و لەناوچوبێ!

شتێکی تر کە لە شوێنەواری عێراق باس نەکراوە، پێدەچێ شارێك لە نێوان گوندی سپیگرە و گوندی چنێران هەبوبێ. لە پیاوە پیرانی ئەوناوەم بیستوە کە ئەم شوێنە شارێك بووە بەناوی شاری خۆتەن. ئەوشوێنە ئێستا پڕە لە بەردی زۆر زل و پێ دەچێ لافاوێکی زۆر گەورە لەو ناوە هاتبێ، چونکە هەندێك لە بەردەکان دەیان تەن دەبن. لە ژێر ئەوبەردە گەورانە پارچە گۆسکە و شتی تر دۆزراوەتەوە و شوێنەواری خانووش بەدی کراون. من لە کاتی پێشمەرگایەتیم زۆر جوان ئەو جێگایەم بەسەر کردەوە. ئێستا بەو شوێنە دەڵێن کەلەکین.

ئەگەر لەلای بەرزایی بانەنۆکەوە تەماشای دەربەندی شەقڵاوە بکەین، ڕیزەوی بەردەکان و لافاوەکە زۆر جوان دیارە کە پێدەچێ چیای سۆرکی لە دەربەند شەق کردبێ. ئەو شوێنانەی لافاوی پێدا ڕۆیشتوە، هەمووی بەردی چیاییە. یاخود لەوانەیە شوێنی شاری شەقڵاوە یەك پارچە گۆمێکی گەورە بووبی و دوایی چیاکەی هەڵدڕیبێ. بە هەرحاڵ من پێم وایە ناوی شارەکە لە شەق کردنی ئاو هاتبێ، هەرچەندە چەندین لێکدانەوە بۆ ناوی شەقڵاوە کراوە وەك شاقوڵیاوە، شاخی ئاوە، شەقی ئاوە، شەقڵی ئاوە... و چەندین بیر و بۆچونی جیا دەربارەی ناوەکە هەن.

هەرچەندە بابەتەکەم دەربارەی شوێنەوارە لە ناوچەی شەقڵاوە، بەڵام لە کاتی کاروانەکانم بۆ هەولێر، جارێکیان لەگەڵ ڕەسوڵ کاکۆ لە ڕووباری بەستۆڕە دەپەڕینەوە و شتێکی زۆر سەیرمان بینی. کونێکی لاکێشە لە شێوە و ئەندازەی دەرگایەك یان بەرین تر، لە دەم ڕوبار بوو. دیاربوو لەگەڵ هەڵکشان و داکشانی ئاو بەدەر کەوتبوو و ئێمەش چووینە تەماشای و بینیمان شوێنەوارێکی دەستکردە. سەر و بن و هەردوو تەنیشتی کونەکە لە بەردی پان و لووس دروست کرابوون. بەردەکان بە شێوازێك لەیەك گیرکرابوون کە لەبار یەك ئەچنە دەرەوە. کونەکە تا چەند مەترێك دەڕۆیشت و ئیتر بە خۆڵ پڕ ببووەوە، بەڵام ئەوەندەی لێم دیار بوو هەموو تەنیشتەکانی بەو بەردە پانە داڕێژرابوون. وەك بڵێی ئاوی بەناو گواسترابێتەوە بۆ شوێنێکی تایبەت. لە زارکی دەرگاکە نوسینێکی سەیر کرابوو. ڕەسوڵ کاکۆ لەسەر پارچە کاغەزێك وێنەی نوسینەکەی کێشا و دواتر بردمانە لای قەشە جیبرائیل و پیشانماندا، ئەویش گوتی "ئەوە نوسینی بزمارییە".

ئەو کات زۆر بیرم لێی کردەوە و بەدوای پێشونێك دەگەڕام تا بزانم ئاوەکە بەرەو کوێ دەچێ. دواتر بۆم دەرکەوت کە کاتی خۆی لەوێ ئاو بۆ قەڵاتی هەولێر ڕۆیشتوە! لە ئاوەڕاستی قەڵاتیش بیرێك لێدراوە بۆ ئەوەی ئاوەکە بە سەتڵ بهێننە دەرەوە. من نازانم ئەم بۆچونەم چەند ڕاست و دروستە، چونکە لە هیچ شوێنێك دەربارەی ئەم بابەتەم نەخوێندۆتەوە. بەڵام ئەگەر ئەم بۆچونەم ڕاستبێ، دەبێ چ ئەندازیارییەك بەر لە هازاران ساڵ بەکارهاتبێ بۆ دروست کردنی ئەو تونێلە! ئایا زەوییەکەیان هەڵدڕیوە ئینجا بەردەکانیان داناون، یان هەر چەند مەترێك کونێکیان لێداوەو چونەتە خوارەوە بۆ ئەوەی تونێلەکە هەڵبکەنن؟ ئایا لە نەبوونی دەزگای ئەندازیاری، چۆن توانیویانە بەرزیو نزمی ناوچەکە بخەمڵێنن. ئەی ئەو بەردە پان و گەورانە لەکوێ هێندراون؟ بەداخەوە وەڵامی ئەو پرسارانە بۆمن تا ئێستا ڕوون نەبونەتەوە. هەرچەندە دوای

ماوەیەك لە دۆزینەوەی تونێلەكە، مستۆی مامزێ كە دۆستێكی من بوو لە گوندی قەرەموتك، بۆی باس كردم كە بەڵێ ڕاستە و ڕێچكەی تونێلەكە لە زورگەكان هەتا هەولێر بەدی دەكرێت و ئاو لەوێ چووە بۆ قەڵاتی هەولێر.



هەولێر لە سەرەتای ساڵانی ١٩٣٠

# دەوا و دەرمان

لە کۆندا، بەر لەوەی زانستیە پزیشکیەکان گەشە بکەن و پێش بکەون، بە مەبەستی چارەسەر کردن، زۆربەی نەتەوەکان هانایان بۆ دکتۆری میللی بردوە. هەروەها دەوا و دەرمانی لە گژ و گیا دروست کراوی خۆماڵیان بەکارهێناوە. کوردستانیش وەك زۆربەی کۆمەڵگە مرۆییەکان لەم جۆرە چارەسەرکردنە بەدەر نەبووە. تاکو ئەمڕۆش سەرەڕای ئەو پێشکەوتنەی لە بواری پزیشکیدا جیهان بەخۆیەوە بینیوە، زۆر کەس هانا بۆ دەرمانی میللی دەبەن. دەبێ ئەو ڕاستیەش بزانین کە زۆربەی دەرمانەکانی ئەمڕۆش هێشتا هەر لە گژ و گیا دروست دەکرێن، بەڵام بە شێوەیەکی مۆدێرن و سەردەمیانە.

لێرەدا دەمەوێ هەندێك لەو جۆرە چارەسەر و ناوی هەندێك لەو بەیتار و دەرمانانەی کە لە سەردەمی منداڵی من لە شەقڵاوە هەبوون و بەکاردەهاتن باسبکەم. بۆ نموونە ناوی پزیشکێکی میللی کە ماوەیەکی زۆر وێردی سەر زاران بوو لە شەقڵاوە و دەوروبەری و زۆریش لە نەخۆشەکان بە مەبەستی چارەسەر هانایان بۆ دەبرد، حاجی سادق بوو. حاجی سادق ئەم پیشەیەی بە میرات لە ئەنکی و باوکی و مامی بۆ مابوەوە. قادر وەسمان و حەمەدنەمین وەسمان، کە دوو پزیشکی میللی زۆر بەناوبانگ بوون لە شەقڵاوە، لە هەمان کاتیشدا هەردووکیان کوڕی فاتیمە بەیتاری بەناوبانگی شەقڵاوە بوون. وەك دەگێڕنەوە، فاتیمەی بەیتار لەسەردەمی خۆیدا چارەسەری سەدان نەخۆشی کردوە. بەڵام حاجی قادری کوڕی گەلێك لەو شارەزاتر بووە. ڕاستە کە دەڵێن "هەمیشە خوێندکاری زیرەك لە مامۆستاکەی باشتر دەردەچێت".

ئەمانە چارەسەری زۆر نەخۆشی و ئەو کەسانەیان کردوە کە بە گولە یان بە خەنجەر بریندار بوون. یا ئەوەتا لە شاخ هەڵێدرابوون و لە دار بەرببونەوە و جەستەیان شکاو و زامدار بوو. لە دوای ئەمانی ئەوانیش، حاجی قادر وجاخ کوێر نەبوو. سادقی کوڕی کە بەر لە مردنی باوکی لە چارەسەرکردنی نەخۆشەکان هەمیشە هاوەڵی باوکی بووە، نەیهێشت ئەم پیشەیە شوێن بزر بێ و جێگای ئەوی گرتەوە و بووە دکتۆرێکی میللی زۆر بەناوبانگ.

ئەو کات خەڵك ئەوەندە گوێی بە پاك و خاوێنی جەستە نەدەدا. لەبیرمە خەڵکی بەڕێز و ڕدێن سپی، لەبەر هەتاو دادەنیشتن و ئەسپێیان لە لەشیان دەکوشتن. یان لە دوای نوێژی شەوان، خەڵك هەبوو کراسەکەی خۆی لەبەر دەکرد و لەسەر ئاگر دایدەوەشاند و قرچەی ئەسپێیان دەهات! بۆیە زۆربەیان توشی نەخۆشی پێست دەبوون و کولك یان زیپکەیان لەسەر جەستە پەیدا دەبوون،

بەڵام حاجی سادق زۆر بە سانایی چارەسەر ئەو نەخۆشیانەی دەکرد. جۆرە دەرمانێکی لە گژ و گیا دروستکراوی دەخستە سەر شوێنەکە و بۆ ماوەیەك جێی دەهێڵا تا بە تەواوی کولکەکە دەگەیشت. پێش ئەوەی کولکەکەش هەڵدڕێ، بە قسەی خۆش نەخۆشەکەی لە ڕووی دەروونیەوە هێور دەکردەوە، ئینجا بە چەقۆ شوێنەکەی هەڵدەدڕی و هەرچی پیسایی و خوێن و ئاوسان هەیە لە شوێنەکە دەریدەهێنا و پاکی دەکردەوە. پارچە دونگێك یان گیایەك هەبوو لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان لە بەهاران تا پایزان لە دەم کانی و ڕوبارەکان، یان لە ناو شینایییەکاندا هەبوو و ئێستاش هەیە کە پێی دەڵێن ڕێکێش. یەك لەو دووانەی بە مەبەستی خاوێن کردنەوە دەخستە سەر شوێنی برینەکە و دواتریش پارچە گۆشتێکی خاوێنی لەگەڵ زەردەچو دەکوتا و لە شوێنەکەی دەبەست بۆ ئەوەی شوێنەواری برینەکە بن بڕ بکا. زۆر جاریش دوکانە لەجیاتی ڕکێش و دونگ بەکاردەهات. دوکانە شتێکی وەك بلاروك بوو، بەڵام دوای کوڵاندنی شتێکی وەك سیکۆتینی لێ دروست دەبوو. ئەگەر کەسێك کولکێکی لێهاتبا، دوکانەیان لەسەر دادەنا و دوای ماوەیەك کولکەکەی دەتەقاند و هەموو خوێنە پیسەکەی دەکێشایە دەرەوە. دوکانە بۆ چارەسەر، زیاتر لەلای دۆمەکان بەکاردەهات.

جگە لە زامدار بوون یان چارەسەری نەخۆشی پێست، حاجی سادق چارەسەری نەخۆشیەکانی سك ئێشە و کۆخە و دەیان نەخۆشی تریشی دەکرد. زۆربەی ئەو دەرمانانەی کە بەکاری دەهێنان، لە گژ و گیای سروشتی کوردستان دروست کرابوون. پیاوێکی ئەوەندە شارەزا بوو، تەنانەت چارەسەری نەخۆشی لاڕەشە و تیراوە (گانگرین) و مووی دەکرد کە جۆرێکە لە کولك. لە چارەسەرکردنی نەخۆشی مووودا، هانای بۆ بەکارهێنانی مورووی شین دەبرد کە جۆرە دەرمانێك بوو لە موسل ئامادە دەکرا. شەکریشی بۆ چارەسەرکردنی برین بەکاردەهێنا. حاجی سادق هەرگیز پارەی لە خەڵکی هەژار و دەست کورت وەرنەدەگرت.

هەرچەندە من بچوك بووم، بەڵام زۆر شتی سەیرم لە حاجی سادق بینی. ئەگەر مار بە کەسێکی وەدابا، بە خێرایی چارەسەری دەکرد. بە موس شوێنی مار پێوەدانەکەی بریندار دەکرد و پارچە گۆشتێکی خاوی دەخستە ناو دەمی خۆی و بە کەلە شاخ ژەهرەکەی دەمژی. ئینجا پارچە گۆشتەکەی ناو دەمی ژێر خاك دەکرد، دەیگوت ژەهراوی بووە و گەر گیانلەبەران بیخۆن، دەمرن! بەردەوامیش شیری دەدایە کەسەکە و ئەویش دەڕشایەوە. لە وەرزی بەهارانیشدا، بە کەلە شاخ خوێنی لەو کەسانە بەردەدا کە توشی نەخۆشی سەر ئێشەی بەردەوام دەهاتن و بەم خوێن بەربوونە زوو چاك دەبونەوە.



نەخۆشێکی پەککەوتە

بۆ چارەسەری دەم کولی، دەمی نەخۆشی بریندار دەکرد و جۆرە گیراوەیەکی دەستکردی خۆی لە دەمی مرۆڤەکە دەدا کە سەرجەم ددانەکانی نەخۆشەکە رەش دەبوون. ئینجا دوای ئەوەی نەخۆشەکەی چارەسەر دەکرد، جۆرە گیراوەیەکی تری بە نەخۆش دەدا بۆ سپی کردنەوەی ددانەکانی. ئەم گیراوەیە لە خەڵوزی کوتراو و خوێ پێکهاتبوو. من یەکێك بووم لەو کەسانەی دوچاری نەخۆشی دەو کولی بووم و چارەسەری بۆ کردم.

بۆ چارەسەرکردنی قوڕباقە، بیبەری کوتراوی دەخستە سەر پەنجەی خۆی و پەنجەکەی دەخستە ناو گەروی نەخۆش و گرێکەی دەتەقاند. بۆ خوێن راگرتنیش، خوێ و ناوی دەدا بە نەخۆشەکە بۆ ئەوەی غەرغەرەی لەناو دەمی پێ بکا و دوای دوو رۆژیش نەخۆشەکە چاك دەبوەوە.

لە ساڵی ١٩٣٩، نەخۆشخانەی لای مزگەوتی حاجی بریم لە شەقڵاوە دروست کرا. دوای ئەوەی نەخۆشخانەکە کرایەوە، میری دکتۆرێکی خەڵکی شاری موسڵی بۆ شەقڵاوە بەرێکرد. هەر زوو حاجی سادق ئاگادارکرایەوە کە نابێ چیتر چارەسەری نەخۆش بکا. بە سەرپێچی کردنیش لەم بریارە، سزایەکی مادی گەورە دەدرێ. بەڵام خەڵك وازی لێنەدەهێنا، چونکە زیاتر باوەریان بە چارەسەریەکانی ئەو بوو وە هەرگیز دەستبەرداری نەدەبوون. بۆ نموونە فاتیمەی خوشکم کولکێکی گەورەی لە گەردەنی هات و باوکم بۆ چارەسەر باوەری بە حاجی سادق زیاتر هەبوو وە بردیە لای ئەو. حاجی بە پێکەنینەوە

گوتی گەر سکاڵام لەسەر تۆمار نەکەی، چارەسەری ناسانە. بەڵام چونکە کولکەکە زۆر گەورە بوو و لە کاتی دەرکردنیدا، گەرووی خوشکم کون بوو و لە ملی هەناسەی دەخورادەوە و دەنگی زڕ ببوو. حاجی جارێکی تر بە باوکمی گوت کە سکاڵای لەسەر تۆمار نەکا. باوکیشم پێی گوت "هێنایتمە لای تۆ تا چارەسەری بکەی، گەر بشمرێ بە قوربانی تۆ بێ". ئەویش بۆ ماوەیەکی کەم چارەسەری کرد و چاك بووەوە.

کابرایەکی ئەرمەنی بە ناوی کریکۆر لە کوشتارەکەی ئەرمەنیەکان بە دەستی تورکە ڕەگەز پەرستەکان گولەیەك بەر ڕانی دەکەوێ و بە سەختی بریندار دەبێ. کریکۆر بە حاڵ لە لێواری مەرگ ڕزگاری دەبێ. ئەو کابرایەکی زۆر دەوڵەمەندیش بووە و دواتر شوێنی برینەکەی لێ پیس دەبێ. بە مەبەستی چارەسەرکردنیش، سەردانی ئەڵمانیا و بەریتانیا و زۆر لە وولاتانی ڕۆژئاوا دەکا، بەڵام هەر وەك خۆی بەبێ چارەسەر دەمێنێتەوە. لەو سەردەمیش ژینگەی شەقڵاوە ژینگەیەکی پاك و پڕ لە سەوزایی بوو. بە هۆی دڵ ڕفێنی ناو و هەواکەی و بوونی ئەم هەموو کانیاوە سازگارە، هاوینە هەوارێکی کەم وێنە بوو و هەندێك کەس، بەڵام زۆر بە دەگمەن بۆ پشودان ڕوویان لە شەقڵاوە دەکرد.

کریکۆر یەکێك بووە لەو گەشتیارانەی بە مەبەستی خۆ لەبیرکردن و کەم کردنەوەی نازارەکانی جەستەی هاتۆتە شەقڵاوە. کاتێك هەواڵی شارەزیی حاجی سادق لە بواری پزیشکی دەزانێ، سەردانی دەکا. حاجی سادق کە چاوی بە برینەکە دەکەوێ، پێدەکەنێ و دەڵێ من چارەی دەکەم. بەڵام بە مەرجێك تۆ بەرگەی نازاری چارەسەرکردنەکە بگری. کریکۆریش دەڵێ تەنیا چارەسەرم بکە، هەر چی دەتەوێ بیخوازە و بەرگەی هەموو نازارێکیش دەگرم. حاجی چوار سنگ لە زەوی دادەکوتێ و چوار مەچەك کریکۆر لەم سنگانە بە گوریسێکی لە موو دروستکراوی پتەو دەبەستێتەوە. ئینجا دەست دەکا بە خاوێن کردنەوەی برینەکە بە چەقۆ. هەرچی گۆشتی پیسی دەوروبەری برینەکە هەیە فڕێ دەدا تا دەگاتە سەر ئێسکەکە و دەست دەکا بە ڕنینی ئێسکەکە بە چەقۆ. دەڵێن ئەم بەستەزمانە یەك بە دەنگی خۆی هاواری کردوە، کە لەو سەردەمدا لە شوێنە دوورەکانی شەقڵاوە خەڵك گوێی لە هات و هاوار و قیژەی ئەم پیاوە بووە. دوای تەواو بوون لە کارەکەی، گیراوەیەکی تۆزی لە گژ و گیا دروست کراو دەخاتە سەر برینەکە. کریکۆر لە هۆش خۆی دەچێ و خەڵکی پێی دەڵێن حاجی ئەو کابرایە مرد. حاجیش دەڵێ نەمردوە، تەنها سڕمکردوە. دوای لە هۆش چوونی بۆ ماوەیەکی زۆر، کریکۆر بە ئاگا دێتەوە. حاجی بۆ ماوەی مانگێك ڕۆژانە برینەکەی بۆ دەرمان دەکا و دوای مانگێك ئەو کابرایە بە

تەواوی چاك دەبێتەوە و شوێنەواری برینەکەی نامێنێ. بۆیە کریکۆر بڕیار دەدا هەر لە شەقڵاوە بمێنێتەوە خۆی و ئامۆزایەکی بە ناوی سیمۆن بۆ یەکەم جار لە شەقڵاوە دوو چێشتخانە و میوانخانە بە ناوی کریکۆر و سیمۆن دەکەنەوە. تا ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی ڕابردووش هەر لە شەقڵاوە دەمێننەوە. من کریکۆرم باش دەناسی، بەڵام زانیاریم نەبوو دەربارەی چۆنیەتی هاتنی بۆ ناوچەکە. نوسەری بەڕێز مامۆستا زرار سەرتاشی شەقڵاوە ئەو بەسەرهاتەی بۆ باسکردم. مامۆستا زرار هەردەم خوولیای کۆکردنەوەی زانیاریە دەربارەی بەسەرهاتە کۆنەکانی ناوچەکە.

نەخۆش لە زۆر شوێنی جۆراوجۆری کوردستان ڕوویان لە شەقڵاوە دەکرد بۆ چارەسەر کردن. هەندێك لەو نەخۆشانە نەخۆشیەکەیان کوشندە بووە یاخود برینەکەیان سەخت بووە و دەمردن. حاجی سادق گۆڕستانێکی تایبەتی لەسەر ڕێگای هاملتۆن، بەرامبەر بە میوانخانەی خانزادی ئێستا بۆ ئەم مردوە غەریبانە هەبوو، کە سەرجەمیان لەوێ بە خاك دەسپاردران. گۆڕستانەکە تا ئێستاش ماوە بە گۆڕستانی شێخ گوڵێ بەناوبانگە.

زۆر شتی سەیر و ڕوودا و و بەسەرهاتی ترم دەربارەی حاجی سادق بیستوە. بە ڕاستی مرۆڤێکی بەتوانا بوو و مایەی هەڵوەستە لەسەر کردنە. ئەوەی من باسم کردوە، مشتێکە لە خەرمان. حاجی سادق و هاوشێوەکانی لەسەردەمی خۆیاندا، خزمەتێکی گەورەیان پێشکەش بە مرۆڤایەتی دەکرد و ئازارەکانیان کەم دەکردنەوە. هەروەها جگە لە حاجی سادق، پزیشکێکی تری مەسیحی هەبوو چارەسەری ئەو کەسانەی دەکرد کە مار پێیوەدابون. لەم بوارەشدا زۆر شارەزا و لێهاتوو بوو و ناوی بیای مارمژ بوو.

شتی زۆر سەیر دەربارەی فاتیمەی بەیتار دەگێردرانەوە، بۆ نمونە جارێکیان میرانی بایز بەگ، دوچاری نەخۆشیەکی سامناك دەبێ و ڕانی بە شێوەیەك دەئاوسێ کە ناتوانێ بە هیچ شێوەیەك بڕوا. دایکی حاجی قادر دەبەن بۆ چارەسەر کردنی، ئەویش بەبێ ئەوەی دۆش دابمێنێ، دەڵێ بڕۆن سێ هێلانە بەردەکوڕە بێنن و لەناو ناوی گەرم داینێن. دوای توانەوە، بە گەرمی بیخەنە سەر ڕانی میر. بۆ بەیانی کە ئەوە دەکەن، میر چاك دەبێتەوە.

بەردەکوڕە باڵندەیەکی بچوکە و لە شاخ دەژێ. هێلانەکەی بە شێوەیەك دروست دەکا کە زۆر سەرسوڕهێنەرە. بنیشتە تاڵ لە دارەبەن هەڵدەگرێ و لە بەردی دەدا و قوڕی لەگەڵ تێکەڵ دەکا. پاشان ڕیخی چێڵی لەناوەوە لێ دەدا و بە سینگی خۆی ناو هێلانەکە لوس دەکا. بە پووش یا مووی درێژیش، بنی

هێلانەکە دادەنێ و کونێکی بچوکی لولەکی، بەڵام کەمێك درێژ لە سەرەوە دەهێڵێتەوە. کە وشك بوەوە، وەك بەرد ڕەق دەبێت. هێلانەکەش لە شوێنی وا سەخت دروست دەکا کە هەرگیز مار نەیگاتێ و بارانیش نەیگرێتەوە. بەزۆریش لە پارچە شاخێك دروستی دەکا کە ژێرەوەی لە شێوەی هەیوان هەڵکەوتبێ. بە جۆرێك ئەگەر مار لە سەرەوە خۆی بۆ هێلانەکە شۆڕ بکاتەوە، پێش ئەوەی بگاتە هێلانەکە، بەردەبێتەوە. ئەگەر لە خوارەوش هەوڵبدا، ئەوا دیسان مارەکە ناتوانێ سەرکەوێ.

بۆ چارەسەرکردنی شەوتا، خەڵك هاتایان بۆ ئەو کەسانە دەبرد کە دوو ژنیان هەیە و لە بەردەمی ماڵیان بە شیعر دەیانگوت "بە شەو دەگرێ تا، بە ڕۆژ بەردەدا، ماخۆی چوار چاوان، جەوابێ وەدە" ئەویش ناوی خواردنێکی دەهێنا و دەبوایە ئەم خواردنە بۆ نەخۆشەکە ئامادە بکرێ تا چاك ببێتەوە. ئەو کات خەڵك زۆر سادە بوو و باوەڕەکە وەها بوو.

ئێلیا ڕەقۆ و دنحا شوان و حەمەدئەمین کوێستانی و حەمەد گۆڕەشێریش زۆر وەستای چاك بوون بۆ چارەسەرکردنی شکەست. ئەگەر کەسێك لەشی کوترابا، جا بە هۆی بەربونەوە، لە بان کەوتن، یان ئەگەر کەسێك دارکاری کرابا، ئەوا مەڕێکیان سەر دەبڕی و کابرای نەخۆشیان لە پێستەکەی دەگرت.

ئەحمەدی کوڕی یوسف کامەلا و شەماشە بنیامێن و حەمەدی حەیشە کەڕ کاری ددان کێشانیان دەکرد، بەڵام شەماشە خوێندەواریش بوو و لە هەموویان زیاتر ئەو کارەی دەکرد. زۆر کەسی تریش هەبوون ئەم کارەیان دەکرد، بەڵام تەمەن وای لێ کردووم کە ناوی زۆر کەسم لە هزر نەمێنێ.

# فەلەکناسی و کەشناسی

سەرەڕای نەبوونی نامێری پێشکەوتوو لە بواری کەشناسی و فەلەکناسیدا، میللەتی ئێمە هەمیشە گرنگی بەو بوارە داوە و کەسانی وا هەبوون بە پێی ئەو ئەزموونەی کە هەیان بووە، هەروەها بە هۆی سوود وەرگرتن لە کەرەستە سەرەتاییەکان، مرۆڤی بە توانا بوون لەم بوارەدا. ئەگەر چاوێك بە مێژووی ئەم بوارەدا بخشێنین و پێوانەیەکی مەیدانی بۆ بکەین، دەبینین کە ئەم هەموو پەند و هۆنراوەیەی دەربارەی کەشناسی لە سەر زاری پیرەمێرد و پیرەژنەکانمان بیستراون، گەر کۆبکرێنەوە، خۆیان لە دەیان پەرتوك دەدەن. بۆ نموونە لە شەقلاوە مرۆڤە بە ئەزموونەکان سودیان لە جولە و هەڵس و کەوتی گیانلەبەرە کێویەکان وەرگرتووە، بۆ نموونەش مێیەی بزنە کێوی. مرۆڤێك هەبوو لە شەقلاوە بە ناوی یونس مامە شین، کە ڕاوچیەکی کارامە بوو، دەربارەی ئەم گیانلەبەرە کێویە چەندین زانیاری کۆکردبوەوە و لە بواری کەشناسیدا بەکاری دەهێنان. دەیگووت تا پێروو ناوا نەبێ مێیەی بزن نایەڵێ نێریەکە لێی نزیك بێتەوە. چونکە بزنە کێوی مەبەستی بووە کە بێچوەکانی لەو کاتەدا لە دایك ببن کە وەرزی سەرما بەسەر چووبێ و گژ و گیا لە زەوی سەری دەرهێنابێ.

پەندێك هەیە دەڵێ "پێروو ناوا بوو نیسك ساوا بوو". مەبەستی وا بووە کە نیسك لە وەرزی پایزدا دەچێنرێت. هەروەها، لە بارەی مانگە کوردیەکانیش چەندین پەند هەیە دەربارەی کەشناسی. "ڕەشەمە ڕەشکی ڕوان، بەتاڵ دەکا چارە و کەندوان بە شەڕ دێنێ بوك و خەسوان". مەبەست وا بووە لەو مانگەدا ڕۆژ درێژتر دەبن، خواردنی داکراو و هەڵگیراو بۆ زستان بەرە و تەواو بوون دەچن، جوتیارەکان زیاتر کاردەکەن، کە مرۆڤیش کاری کرد زیاتر خواردن دەخوات، بۆیە کەندوەکان بەروە بەتالی دەچن. هەروەها دەڵێن "کە دادێ ڕەشەمەو ئادار، دوو مانگ ئەبنە چوار، قەت دانایێ بەهار، کابان ئەبنە بەقال". مەبەست ئەوەیە کابانیماڵەوە بە مشتێك لێرەو لەوی چێشتێك ئامادەدەکا. یان دەووترا، "هەژدەی ڕەشەمێیە، قارژنی (سیێ) یە، گۆنەرێ بەفرێیە" (سیێ، باڵندەیەکە گەرمێن و کوێستان دەکات، زۆر جار وا ڕێکدەکەوت، ئەو باڵندانە بەرەو کوێستان دەچوون کەچی بەفر هێشتا دەباری). هەروەها دەربارەی مانگی ئازار پەندێك هەیە دەڵێ "ئادار ئەکا خەتەرێ، نیسان ئەینی زەرەرێ، هەر چەنگی باری کەرێ". مەبەست لەم پەندە ئەوە بووە گەر لە مانگی ئاداردا باران هەبێ و لە نیسانیشدا تەزرە بەروبوومی کشتوکاڵی دانەکوتێ، هەر چەنگە گەنمێك بەرهەمەکەی بە قەد باری کەر دەبێ.

دەربارەی مانگی نیسانیش دەووترا "نیسان بگاتە بیستی، گا تێردەخوا بەنوستی" واتا ئەوکات پەرە دەکەوێ و گیا زۆر شیندەبن.

بۆ دیاری کردنی کات، بە تایبەتی لە شەواندا زۆر پشتیان بە ئەستێرەی جەدی دەبەست. ئەم ئەستێرەیە لە شوێنی خۆی ناجولێت و دوو ئەستێرەی تر لە دەوریدا دەخولێنەوە شوێنەکانیان بە پێی جولەی ئەستێرەکان و گەیشتنیان بە شوێنەکانیان کاتەکانیان دیاری دەکرد. هەروەها کاروانچیەکان ئەم ئەستێرەیان دەکردە نیشانە لە کاتی کاروان کردنیان. بە هۆی ئەم ئەستێرەوە ئاراستەی ئەو شوێنەیان دیاری دەکرد کە بۆی دەچوون. دەگێرنەوە زۆر کەس لە شوێنی زۆر دووردا بەهۆی ئەم ئەستێرەیەوە گەڕاوەتەوە شوێنی خۆیان. بۆ نموونە مەلا چورچەی باڵەکایەتی بۆی گێرامەوە کە لە حەلەبەوە لە سەربازی ڕایکردوە و بەهۆی ئەم ئەستێرەیەوە گەیشتۆتەوە باڵەکایەتی. ئەو دەیووت ئێمە بە شەو بەهۆی ئەم ئەستێرەیەوە ڕێمان دەگرت و بە ڕۆژ خۆمان حەشاردەدا. هەروەها حاجی برایمی سەرگرد دەیگێرایەوە کە چۆن بە ڕێگای ئەم ئەستێرەیە گەیشتۆتەوە شەقلاوە.

ئەمە تەنها چەند نموونەیەکە کە من هێناومەتەوە، ئەگینا ئەو کات ئەستێرە ناسەکان دەیان ئەستێرەی تریان دەناسی و دەیانکردن بە پێگە بۆ ڕەو کردنیان. بۆ نموونە حەوتەوان کە حەوت ئەستێرەن، لە ئاسمانەوە کە ڕەو ئەکەن لە هاتندا. لەو کاتەی کە ڕۆژ ئاوا دەبێت چواریان لە پێشەوەن تا نیوە شەو، بەڵام کە شەو بەرەو بەرەبەیان شۆڕ دەبێتەوە، بە پێچەوانەوە سێ ئەستێرەی دواییان دەکەونە پێشەوە چوار ئەستێرەکەی تر لە پشتەوە. گەلاوێژیش ئەستێرەیەکە کە زۆر ڕەونەق دارە، کاتێك دەگاتە بەرامبەر قیبلە موژدەی هاتنی بەیانیە. ئەم ئەستێرەیە لە سەرەتای مانگی هاویندا بەدیار دەکەوێ. پەندێکی کوردی هەیە دەڵێ "گەلاوێژ بگری شەوێ، ئاو سارد دەبن لە هەرکەوێ، دەست بە باغەری مێوێ، ترێی بخۆ بە لێوێ". مەبەست وایە کە ڕۆژی هاوین گەرم دەبن، بەڵام شەو بەرەو ساردی دەچێ، ترێش پێ دەگا و خۆش دەبێ. ئەم ئەستێرەیە لە کۆتایی مانگی تەموزدا لە پێش بەیانیاندا هەڵدێ، تا وای لێدێ لە زستاناندا نامێنێ یان ئاوا دەبێ. هەروەها تەرازوو سێ ئەستێرەن لە ڕیزی یەکتری، ئەویش بەکاردەهات بۆ دیاریکردنی کاتەکانی شەو. ئەستێرەیەکی گەشی تریش هەیە کە بەیانیان هەڵدێ، ئەمەش زیاتر بۆ دیاری کردنی کات بەکاردێ.

شوێنی هەڵاتن و ئاوا بوونی ڕۆژیش بۆ زانینی وەرزەکانی ساڵ سوودی لێ وەردەگیرا، هەروها بە هەمان شێوە دەزاندرا کەی چلەی زستان و هاوین

دادەهات. زانینی ئەمانە زۆر سوودمەند بوون لەو کات، چونکە زۆربەی خەڵکی خەریکی ڕەز و باخ و چاندنی کشتوکاڵ بوون.

ئەستێرەناسی زۆر شارەزا هەبوون لە شەقلاوە، بە تایبەتی وەستا عەولای کورتان دروو، کە چاوەکانی لە نزیکەوە زۆر لاواز بوون و بە ئاستەم پێش خۆی دەدی، بەڵام بۆ دووربینی چاوەکانی زۆر باشبوون، کەشناس و ئەستێرەناسێکی زۆر بلیمەت بوو. دەیان نموونە هەن دەربارەی ئەم بوارە، بەڵام تەمەن بەرەو پیری دەڕوات و بوارم نادات وە یان لە بیرم چۆتەوە کە ئێستا ئاماژەی پێبکەم.

# بۆنەکان

شاری شەقڵاوە وەك زۆربەی شار و شارۆچکەکانی تری کوردستان لە ئەنجامدانی بۆنەکانی وەك: یاد کردنەوەی لەدایك بوونی پێغەمبەر (د.خ)، بوك گواستنەوە و مردوو ناشتن و پرسەکان تایبەتمەندی خۆی هەبووە. لەوانەیە لە هەندێك بواریشدا جیاوازی لەگەڵ زۆر ناوچەی تری کوردستان هەبووبێ.

## مەولود خوێندنەوە

تا ئەمڕۆش، ئەو نەریتە لە شەقڵاوە باوە و تایبەتمەندی خۆی هەیە. سەرەتای ئەم نەریتە لە سەردەمی سولتان موزەفەر لە شاری هەولێر بە شێوەیەکی یەکجار بەرفراوان بۆ ماوەی چەندین ساڵ پەیڕەو کراوە. سولتان موزەفەر، کاربەدەست و زانایانی موسڵمانانی لەم سەر تا ئەوسەری جیهانی ئیسلامی داوەت کردوە. ساڵانە ئەم نەریتەی دووبارە کردۆتەوە و هەر جارە چەند ڕۆژێکی خایاندوە. دیارە نزیکی شارەکەی ئێمەش لە شاری هەولێر، کاریگەری لەسەر مانەوە و بەردەوامبونی ئەو نەریتە جوانە هەیە لە شارەکەماندا. لە سەردەمی منداڵی من لە شەقڵاوە وا باو بوو کە کەسێك کارێکی کردوە و سودی لێ بینیوە، یان نزای کردوە کە مرازێکی بێتە دی، یان لەبەر پەروەردگار پاڕاوەتەوە کە نەخۆشێکی چاك بێتەوە، لەم کاتانەدا خوێندنەوەی مەولودی لەسەر خۆی کردوە بە ئەرك. ئەو کات و ئێستاش هەر دەڵێین "مەولودێکی لە خۆ گرت".

بۆ سازدانی ڕێوڕەسمی مەولودی پێغەمبەریش(د.خ)، هەر کەسە و بەپێی باری گوزەران و توانای خۆی مەولودەکەی دەخوێندوە، جا چ دەوڵەمەند بووبێ یان فەقیر. کەسی وا هەبوو پارەدار بوو و لە خوێندنەوەی مەولود چەندین گۆلك و مەڕی سەردەبڕی و خواردنێکی زۆری ئامادە دەکرد. میوانداری خەڵکانێکی زۆریشی دەکرد بۆ بەشداریکردن لەم یادەدا. خەڵکە دەستکورتەکەش چەند قەندە شەکرێکیان لەناو مەنجەڵێکی بە زنجیری گەورە دەتاواندەوە. شەکراوێکیان دەگرتەوە و لە دوای مەولود خوێندنەوەکە شەکراوەکەیان بەسەر خەڵکەکە دابەش دەکرد. ئەمەش هەر وەکو ئاماژەم پێ کرد زیاتر پەیوەندی بە باری گوزەرانی کەسەکەوە هەبوو. چەند کەسەکە دەوڵەمەند تر بوایە، ئەم یادکردنەوەیەی بە میوانداری زۆرتر ئەنجام دەدا. دوای نان خواردن، مەلایەك مەولودەکەی دەخوێنەوە و چەند فەقێیەکیش لە تەنیشتی دادەنیشتن و لە دوای

ئەو دەیانگێرایەوە. لە کۆتاییشدا شیرینی دابەشدەکرا. لەم چەند دەیەیەی ڕابردوشدا، مەلا وسوی خۆشەویستی شارەکەمان، ڕۆڵێکی مەزنی گێراوە لە جوانی و خۆشی و بەردەوام بوونی ئەم نەریتە.

## شایی و زەماوەند

ئەگەر بوك هەر لە شەقڵاوە بوایە، چەند ڕۆژان شایی کردن بەردەوام دەبوو و گەورەیی شاییەکە پەیوەندی بە توانای مادی و زۆری خزمی زاواکەوە هەبوو. زۆربەی میوانداریەکە لە ماڵی زاوا دەکرا و میوانە دورەکانیش بۆ نوستن هەر لەوێ دەمانەوە. بۆ ڕۆژی بوك گواستنەوەش، دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ و نوێژ کردن لە مزگەوت. مەلا و ڕدێن سپی و پیاوە ماقوڵەکان بەبێ ئامادەبوونی زاوا، دەچوون بۆ ماڵی بوك و بوکیان سواری ماین دەکرد و بەرەو ماڵی زاوایان دەبرد. ئەو کاتیش نەریتەکە وابوو کە ئەگەر ماینەکەت لە کەسەێك وەرگرتبا، دەبوایە لە کاتی گەڕاندنەوەی ماینەکە و وەك سوپاسێك بۆ خاوەناکەی، یەك دوو مریشك یان قەندە شەکر بە ماێناکە وەبکەی. لە بیرمە لە کاتی ژن گواستنەوەم لە ۱۹۵۲/۱/۱، ماینم لە حەسەنی بلەی وەرگرت. هاوڕێی خۆشەویستم سعیدە ڕەش بە سەرمای زستان و هەرچەندە بەفرێکی ئەستور باری بوو، چووە دەشتی هەریر و بەند بێژی هێنان. هەروەها کایەکی زۆری هێنابوو وە سەرباری ئەو قوڕو بەفرە، خۆی وە چەندین برادەری تر گۆرانییەکیان خۆشکرد و کایان پێداکرد و هەتا درەنگانی شەو شایی هەر دەگەڕا.



چەند پیاوێك لە بۆنەیەکدا

هەندێك جاریش، بەڵام زۆر بە دەگمەن مێرد منداڵێك دەرگای ماڵی بوکی کلیل دەدا و تا بەخشیشێکی باشی وەرنەگرتبا، دەرگاکەی نەدەکردەوە. بەم کارەشیان

دەگوت پشت دەرکانە و هەتا ساڵانی شەستەکانیش ناوە ناوە ئەم نەریتە دووبارە دەبووەوە. گەر ماڵی بوکیش لە ماڵی زاوا نزیك بوایە، ئەوا بوکەکەیان بە پێ دەبرد و دوو ژن شانی بوکییان دەگرت و پێیان دەگوتن بەربوك. پیاوەکانیش بە چەپڵە ڕێزان و گۆرانی گوتن لە پێش کەژاوەی بوك بەرەو ماڵی زاوا بەڕێ دەکەوتن. چەند گۆرانیەك هەبوون کە زۆر جار دەگوترانەوە، بۆ نموونە "شیرنێ لەیلانێ و لەیلانێ، شیرن هەم گوڵ هەم ڕەیحانێ، هەستە بابچینە سەیرانێ"، "بوکمان هێناو هاتینەوە، لەجۆگەلەی پەڕینەوە، شیوێ تێکەن ساردبێتەوە، ملاکی تێنێن قێتبێتەوە"، "بوکانە بوکانە بوکێ، ماینێ بوکێم شێیە، زینی زەردی لێیە، زاوای چاو لە ڕێیە"... هەروەها زۆر جاریش پیاوەکان بە تفەنگ تەقەی خۆشیان دەکرد. شایی گێڕانیش زۆربەی بە گۆرانی و بەند گۆتن بەڕێوە دەبران. ئەو کاتیش هەندێك بەند بێژی چاك هەبوون. بەڵام ئەگەر ماڵی زاوا دەوڵەمەند و هەبووی بان، ئەوا دەهۆڵ و زورناشیان دەهێنا.



ناهەنگی بوك
گواستنەوە
شەقڵاوە ١٩٥٦
لە ئەرشیفی قادر
حوتان وەرگیراوە

ئەگەر بوك گواستنەوەکە ژن بە ژنی بوایە، ئەوا شوێنێکی هاوبەش لە نێوان هەر دوو ماڵی زاواکە دیاری دەکرا و لەو شوێنەدا بوکەکان ناڵ و گۆڕ دەکران. هەندێك جار دەبوایە بوکەکان لە شوێنی ناڵ و گۆڕ کردنەکەدا دەرزیەك بگۆڕنەوە، گوایە بۆ بەخت کردنەوە بوو. جاری واش بووە خێزانەکان لەسەر دیاری کردنی شوێنەکە پێك نەهاتوون، یان لەبەر ئەوەی هیچ کامیان نامادە نەبوە هەنگاوێك زیاتر بێتە پێشەوە بۆ گۆڕینەوەی بوك، خزمایەتیەکەیان هەڵوەشاندۆتەوە. باوکم بۆی گێرامەوە کە ژن بە ژنی لەگەڵ خەڵکی هەریر کراوە و هەردوو لایان لەسەر تیشی میراوە بڕیار بوە یەکتر بگرنەوە، بەڵام کە گەیشتونەتە ئەوێ، لەسەر تیشی میراوە دوو بەردی نزیك یەك هەبوون و هەر دوو لایان پێداگریان لەسەر ئەوە کردوە کە لایەکەی تر کچی خۆیان بێننە بەردەکەی نزیك خۆیان. سەرەنجام خەریك بوە ببێتە شەڕە تفەنگ و ژن بە

ژنیەکەیان هەڵوەشاوەتەوە. جاری واش هەبووە لەسەر ئەوەی هیچ لایەکیان ئامادە نەبوە کچەکەی خۆیان لە ڕووبار بپەڕیننەوە، بوك گواستنەوەکە تێکچووە.

لە زەمانی منداڵی من، میرانی قادر بەگی شەقڵاوە ژن بەژنی لەگەڵ میرانی خورشید بەگی برای خۆی کرد کە لە قەڵاسنج دادەنیشت. کچی خۆی دایە نورەدینی کوڕی خورشید بەگ و کچی خورشید بەگیشی بۆ میرانی سەدیق بەگ خواست. لە کاتی گواستنەوەی هەر دوو بوکەکەشدا، من منداڵ بووم و لەگەڵ باوکم بەشداریمان تێداکرد. دەبوایە هەردوو لامان لە ڕووباری حوجران یەکبگرینەوە. کە گەیشتینە سەر ڕووبارەکە، لە بیرمە خورشید بەگ پێی لەسەر ئەوە داگرت کە دەبێ میرانی قادر بەگ کچی خۆی بپەڕێنیتەوە بۆ دیوی حوجران. هەرچەندە میرانی قادر بەگ برا گەورە بوو، بەڵام پیاوێکی مەند و ژیر بوو و ژن بە ژنەکەی هەڵنەوەشاندەوە، عەزیزە خانی کچی خۆی پەڕاندەوە ئەوبەری ڕووبار و جیهان خانیشی لەوان وەرگرت.

پێموابێ زەماوەندەکەی میرانی سەدیق بەگ لە ساڵی ١٩٣٦ بوو و لەوانەیە ئەو کات من تەمەنم لە دەور و بەری ١٠ ساڵان بووبێ. زەماوەندەکە لە گۆڕە تووەکەی پشت مزگەوتی ئێستای عوسمان بەگ بوو و چەند ڕۆژێکی خایاند. شاییەکە زۆر گەورە بوو وە زۆربەی پیاوە ماقووڵانی نەك هەر ناوچەکە، بەڵکو لە زۆر شوێنی کوردستان بەشداریان تێداکرد. لەبیرمە هەموو ئاغای دزەییان و خدری پاشا و ماڵی مەلافەندی هاتبوون. دەهۆڵ و زوڕنایان هێنا بوو و قەدۆ کۆر دۆرەنگیو بوو. کە کابرایەك دەهاتە شایی، گۆچانێکیان بە پێش دادەهێنا و پێشیان پاك دەکردەوە، ئەویش مەجبور دەبوو شاباشیان بداتێ. ئەو ڕۆژە جگە لە دەهۆڵ و زوڕنا، چوار کەسیش گۆرانیان دەگووتن. کاوێس ئاغا سەرێکی شاییەکەی گرتبوو وە عەوڵا کاوانیش سەرەکەی تر. حەمد مەندۆ و عزیز ئاغا لەوێ بوون کە ئەوانیش لاوك بێژی بەناوبانگ بوون و لەگەڵ کاوێس بە لاوك گووتن بەشداریان دەکرد، عەوڵا کاوانیش لاوکی زۆر خۆشی دەگووتن. ئەو کات وا باو بوو کە خەڵکە دەولەمەندەکە کورتەکی لە لۆکە دروستکراویان وەك شاباش دەبەخشیە دۆرەنگیو و زوڕنانگیو. لەبیرمە قەدۆکۆر و هاوڕێکانی، بە دەیان کورتەکیان وەرگرتبوون و هەموویان لە ناو دوولکەی دار توویەك لەسەر یەك کردبوونە گیشە و پاشان لە هەولێر فرۆشتنیانەوە.

ژن بە ژنی خۆی لە خۆیدا نەریتێکی دواکەوتوو بوو و سێ هۆکاری لە پشت بوون. هۆکارێکیان نەداری و هەژاری بوو وە خەڵك توانای نەختی دانیان نەبوو. هەندێك کەسیش دەیانەویست لەگەڵ بنەماڵەیەکی تر تێکەڵ ببن و پشت

و قوەت بۆخۆیان زیاد بکەن. هۆکاری سێیەمیشیان، گوایە هەردوو لایان لە مەسەلەی ناموس یەکسان دەبن. سەرباری ئەوەش، ئەریتێکی دواکەتوو تریش هەبوو لە کاتی ژن بە ژنیدا. ئەگەر هەردوو ماڵەکە خەڵکی هەمان شوێن بان، لە جیاتی ئەوەی خزمایەتی و دۆستایەتی لەگەڵ ئەو ماڵەی ژن بە ژنیان لەگەڵ کردوون دروست بکەن، لێیان دەبوە کێ و بەر کێ و دوژمنایەتی. هەر ماڵە و کچەکەی خۆی تێدەگەیاند کە خۆی تەسلیمی مێردەکەی نەکا و کامەیان زووتر بە زاوا بوایە، دەچوە سەربان و تەقەی دەکرد، گوایە ئەو پیاوتر بووە لە زاوا نوێیەکەی. بەڵام زۆربەی کەس ناموسی خۆی لا گەورەتر بوو لە و کارە قێزەوەنە. لەجیاتی پەیداکردنی دوژمنایەتی لەگەڵ ماڵی خوشکی خۆی و زاوا نوێیەکەی، خۆشەویستی لە نێوان خۆیان دروست دەکرد و دەبونە پشت و قوەتی یەکتر.

پێش گواستنەوەی بوك، شیرینی دەخورایەوە و جاران خەنانەش لەلایەن ماڵی زاوا بەسەر ماڵان دابەش دەکرا. لە پێش پەنجایەکانی سەدەی ڕابردوو، خەنانە بریتی بوو لە یەك دوو ئەسکووی خەنە. دوای ئەوەی شەکرۆکە و چوکلاتیش پەیدا بوون، ئیتر خەڵك ئەوانەی لە کاسەیەك لەجیاتی خەنە دابەش دەکرد. ئەو کاتیش وا باو بوو کە دەبوایە زاوا بڕێك پارە وەك ئەختی بوك بدا و دوو تا سێ کراس و کەوێش بۆ بوك بکڕێ. ئەگەر لە تواناشی دابا، چەند پارچە زێڕێکی بچوکیشی بۆ دەکڕین، وەك بلبلە و بسکۆکە و چۆچا و...

بۆ ڕۆژی گواستنەوەش پەڕۆیەکی ناڵوزەردی ڕەنگاوڕەنگ کە لە ناوریشم دروست کرابوو، بەسەر بوك دادەدرا و کە دەگەیشتە ماڵی زاواش، دەبوایە زاوا سەرپۆشەکەی سەری لابدا. هەر کە بوك دەگەیشتە ماڵی زاوا، منداڵێکیان لە کۆشی دادەنا، بۆ ئەوەی نوخشەی لێ بێ، پێشتریش یەك دوو دەرهەم دەدرا بە بوك بۆ ئەوی بیدا بە منداڵەکە. لە کاتی هاتنی بوك بۆ ماڵی زاوا، بارگەی بوکیش لەگەڵی دەهات کە بریتی بوو لە یەك دوو باوڵ کە ئەوکات لە کەرکوك دروستدەکران و چەند شتێکی تێدا بوو وەك: ووردە کەلوپەلی ناوماڵ و جلوبەرگی بوك و هەندێك جاریش بەرگ و نوینیشی لەگەڵ بوون. جگە لەمانە، دەبوایە بوك چەندین شتی وەك: لیفکە، کڵاو، سەرچادان، کلدان، دۆخین، دەسرۆك، گۆری... بۆ ماڵەکانی خزمی زاوا بە دیاری ببا. ئەوشتانە پێیان دەووترا (جیهاز). ئەگەر بوك شتی زۆر و باش و جوانی پێ با، ئەوا خەڵك دەیگووت "جیهازێکی باشی پێ بوو". شایانی باسە لە ڕۆژی بوك گواستنەوەش، هەندێك خەڵك دیاری وەك: سەرنان، خاولی، سابون، قەند، پارە... لەگەڵ خۆی بۆ ماڵی زاوای نوێی دەبرد.

لە ڕۆژی هافتانە، ئەو دیاریانەی بوکەکە لە ماڵی باوکی لەگەڵ خۆی هێنابوون، بۆ خزمەکانی زاوای دەناردن و هەر ماڵەو چەند پارچەیەکی بۆ دەچوو. لە بەرامبەریش ئەوانەی دیاریان بۆ دەچوو، هەر ڕۆژەی دوو تا سێ ماڵ خواردنیان بۆ بوك و زاوا دەکرد و بۆیان دەناردنە ماڵەوە.

## پرسە و مردوو ناشتن

دەتوانم بڵێم مەراسیمی مردووناشتن و پرسە لە ناوچەی شەقڵاوە، لەگەڵ زۆربەی شوێنەکانی تری کوردستان تا ئەمڕۆش جیاوازی هەیە. لە شەقڵاوە خاوەن مردوو کە کۆستی دەکەوێ و یەکێکی لێ دەمرێ، نە ئەرکی گۆڕ هەڵکەندن و نە ئەرکی خواردنی دەکەوێتە سەر. هەر کاتێك هەواڵی مردنی کەسێك بڵاو دەبێتەوە، زۆربەی خەڵکەکە بە بوونی ئایینی جیاوازەوەش، ڕوو لە گۆڕستان دەکەن و مردووەکەش بەرەو مزگەوت بەڕێدەکەن. لەوێ مەراسیمی کفن کردن و شوشتنی مردوو ئەنجام دەدرێ. لەلایەکی تریش گۆڕ هەڵدەکەندرێ و هەرکەسەو بۆ خێری خۆی هەوڵدەدا بەشێك بێ لەم گۆڕ هەڵکەندن و ناشتنە. ئەوکات موتەلیب و موستەفای کوڕی عوسمانی مەلا عەوڵای، ماوەریان هەبوو و لە بەرد شکاندن زۆر بەدەستوبرد بوون. دوو کارگەی بەردیش هەبوون، یەکێکیان لە بەرامبەر میرەسەن بوو لە دەربەندی شەقڵاوە و ئەوی تریان لە دامێن گەرووی مشتاغان بوو لە بەشە سۆرکی لای بانەنوك. ئەوانە بۆ خێری خۆیان بەردەکانیان دەشکاندن و ئامادەیان دەکردن. ئەوانەی هێستریشیان هەبوو، دەچوون بەردەکانیان دەهێنان. هەندێك جاریش بەردەکان پێشوەخت بۆ گۆڕستان دەهێنران، بەتایبەتی بەرلەوەی بەفر بباری، چونکە ئەوکات بەفر زۆر دەباری و کاری هێنانی بەرد قورستر دەبوو.

لە کۆن وا باو بوو کە دوای ئەوەی مردووەکە بە خاك دەسپێردرا، هەموو خەڵکەکە بۆ مەراسیمی پرسەکە ڕوویان لە شوێنی دیاریکراو دەکرد کە یان لە مزگەوتی حاجی برایم، یانیش لە تەکیە دادەنیشتن. تەکیە بەشێك بوو لە مزگەوتی گەورە و لە دوو ژووری درێژ پێکهاتبوو و بۆ سێ ڕۆژ پرسەکە لە یەکێك لەو شوێنانە دادەنرا. شایانی باسە لە کۆنەوە لە شەقڵاوە وا باوبوە کە لە ڕۆژی سێیەمی پرسە، خەڵکەکە و مەلایەکان دەست بەقسە و گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆش دەکەن، بۆ ئەوەی کەس و کاری مردوەکە کەمێك خۆیان لەبیر بکەن. لە کۆن تاکو سێ ڕۆژە تەواو نەبوایە، نابوو هیچ کەس کۆر (چل و سەرشوشتن)ی بکردبا، زۆر جاریش واهەڵدەکەوت پێش ئەوەی سێ ڕۆژە تەواوبێ، کەسێکی تر دەمرد و دیسان سێ ڕۆژی تر کۆرەکە دوادەخرا.

نەریتێکی تریش هەبوو لە دوای سێ ڕۆژە، یەکێك لە دۆستانی بنەماڵەی مردوەکە، سەرتاشێکی ڕادەسپارد کە بێت سەر و ڕدێنی کەسوکاری مردوەکە بتاشێ، بۆ ئەوەی پرسەکە برەوێننەوە.

جاری واش هەبوو بۆ سەرخۆشی کردن، بۆ ماوەیەکی زۆر لە ماڵەوە خەڵك هەر سەردانی دەکردن. بە درێژایی پرسەکە و بۆ نیوەڕۆ و ئێوارانیش، هەر کەسە و لە ماڵی خۆی سینیە خواردنێکی ئامادە دەکرد و بەرەو شوێنی پرسەکەی دەبرد، کە پێیان دەگوت "تەبەق و سفرە". هەر چەندە ئەمڕۆ بە پێی بڕیاری وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی پرسەکان کراون بە دوو ڕۆژ، بەڵام لە شەقڵاوە ئەم ئەریتە تا ڕادەیێك باوی هەرماوە.

# خواردن

جاران ئیمەی خەڵکی کوردستان بە بەراورد لەگەڵ نەتەوەکانی دەوروبەرمان، لە ڕووی فەرهەنگی خواردنەوە زۆر هەژار بووین. من لێرەدا بە کورتی باسی هەندێك لەو چێشت و خواردنانە دەکەم کە لە سەردەمی کۆن، یان لە سەرەتا و ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوو لە شەقڵاوە هەبوون.

زۆربەی چێشتی ڕۆژانەی ماڵەکان بریتیبوون لە: نیسك، ماش، نۆك، گەنمە کوتا و نانی گەنم و جۆ و بەرهەمەکانی تری گەنم وەك: ساوار، کاکڵە ساوار، ناو کاکڵ، پیرخەنی، ناردە ساوار و بڕوش. هەروەها بەرهەمە گیاییەکانیش بۆ چێشت لێنان سودیان لێ وەردەگیرا. ئەو کات ژیان ئەوەندە سەخەت بوو، تەنانەت هەندێك لەم خواردنانەش لە زۆر ماڵان بوونیان نەبوو. ئەوەی هەبوون (دەوڵەمەند) نەبوایە، برنج و چا و شەکری بۆ نەدەکڕا. ئەوانەی کاروانی بادینانیان دەکرد، چەڵتوکی برنجیان دەهێنا. سەرباری ئەوەش لە ڕێگای کاروان، حکومەت دەهاتە سەر ڕێ و زەریبەیان لێ دەستاندی. چەڵتوك لە گرگڕ دەدرا و کاکڵەکە بۆ پلاو بوو، وورتکەکەشی بۆ شۆربا و لەگەڵ ماش دەکوڵێندرا. ناردە برنجەکەش بۆ شوشتن و چەوری بردن لە نامان (قاپ و قاچاغ) زۆر چاك بوو.

بۆ شەوچەرەی زستان و پێخۆر مێوژ و گوێز، باوی، لەتە هەنجیر، لەتە هەرمێ، تووی ووشك... هەبوون. ئەگەر مێوانێکی خۆشەویست بهاتبایە، دۆشاویان بۆ دادەنا.

زۆر لە ماڵەکان هەر لە سەرەتای بەهارەوە، دوو یان سێ بزن و مەڕ، یانیش گۆلکێکیان دەکڕی و دایاندەبەست. لە پایزیش سەریان دەبڕی و دەیانکرد بە قەلیە بۆ زستان. هەندێك کەسیش ـ بەڵام بەزۆری جووەکان ـ گۆشتیان ووشك دەکرد و هەڵیاندەگرت بۆ زستان. بەم شێوازەی گۆشت ووشککردنیش دەگووترا باسترمە. بۆ باسترمە دروستکردن، گۆشتەکەیان تەنك لەت دەکرد و خوێیان پێدادەکرد، ئینجا لەسەر ڕستەیەك لەبەر هەتاو هەڵیاندەخست تا ووشك دەبوو. زۆربەی خەڵکیش مریشك و قەل و قازیان ڕادەگرتن، هەم بۆ هێلکەکردن وە هەمیش بۆ گۆشتەکەی. هەروەها زۆر لە ماڵەکان خاوەنی چێڵ (مانگا) بوون و گاڕانی شەقڵاوە هەتا دەور و بەری حەفتاکانیش هەر گەورەبوو.

بۆ دروستکردنی قەلیە، گۆشتەکە وورد و خوێ دەکرا، ئینجا لە مەنجەڵی گەورە دەکوڵێندرا و دواتر لە ناو ڕۆن سوردەکرایەوە. پاشانیش لەگەڵ ناوە

دۆنەکەی دەکرایە ناو کوپی تایبەت و لە شوێنێکی فێنك لە ژورەوە هەڵدەگیرا کە بۆ ماوەیەکی زۆر دەمایەوە و تێکنەدەچوو. بۆ پاککردنەوەی چەوریەکەش لە کوپی قەلیە، قوڕە سور لە کوپەکە دەکرا وە بۆ ماوەیەك لەبەر هەتاو دایاندەنا. قوڕەکە چەوری ناوکوپەکەی هەڵدەمژی و خاوێنی دەکردەوە. زۆر جار هەمان کوپ بۆ دۆشاو هەڵگرتنیش بەکاردەهات.

بەیانیان خواردنێکی وەکو نیسك یان ماش یان بڕوش دەخورا. نیوەڕۆیانیش بە دەگمەن نەبایە هیچ ماڵێك چێشتی نامادە نەدەکرد. ئەوەی زیاتر دەخورا، هەرمیشك (نان و ڕۆن و هێلکە و دۆشاو تێکەڵ دەکرێن) بە تایبەتی ئەو کەسانەی کاری سەختیان دەکرد دەیانخوارد، چونکە بە خواردنێکی ووزە بەخش دادەنرا. هەروەها ماست، هێلکە و ڕۆن، خەیار و تەماتە بە نان، یانیش مێوژ لەگەڵ گوێز دەکوترا وە بەنان دەخورا. زۆربەی ماڵەکان بۆ ئێوارە چێشتیان نامادە دەکرد، چونکە بەڕۆژ هەموو لەسەر کار بوون.

مێوژ و دۆشاو لە ناوچەی خۆشناوەتی دوو شتی زۆر باو بوون، هۆکاری ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە لەم دەڤەرەدا ڕەز و باغێکی یەکجار زۆری ترێ هەبوو. لە کاتی تەنگانە و گرانی، خەڵك هەوڵی داوە ڕەزی دێمەکار پێرابگەیەنێ، تاکو دەربازبێ لە گرانی و نەبوونی. ئەگەر جوان خزمەتی ڕەز بکرابایە، بە سێ ساڵ دەهاتە بەر. لە زەمانی منداڵی من لە ناوچەی شەقڵاوە، کەم کەس هەبوو ڕەزی نەبێ بە موسوڵمان و مەسیحیەکانیشەوە. ڕەز بە گوێرەی ماوەی گا و جوت کردن پێوانە دەکرا. خەڵك هەبوو ڕۆژە جوتەك و خەڵکیش هەبوو تا بیست ڕۆژ جوتی هەبوو. ئەوەی زۆری هەبا بەتەنیا پێی وەناو نەدەهات و بۆ بن مێو و ڕەز بڕین بە زبارە هاری کاری یەکتریمان دەکرد.

لە کۆتایی مانگی تەموز کە مەسیحیەکان بە مانگی بەرەکە ناوزەدی دەکەن، ترێ پێ دەگەیی و بەرە بەرە بە کاروان دەبردرا بۆ دەشتی هەولێر. دواتریش ترێی چاك و جوان دەکرا بە مێوژ، سپیەکەی دەکرا بە مێوژی سور، ڕەشیش دەکرا بە مێوژی ڕەش.

ترێیەکە هەمووی بە پشتی ووڵاخ دەگوازرایەوە و ڕەشەکەی دەبردرا بۆ موشتاغ (شوێنێکی تایبەتی تەخت و بەرڕۆژ بوو لە چیای سۆرك وە پێیان دەگوت گەڕوی مشتاغان) و ترێیەکە لەوێ هێشوو هێشوو ڕادەخرا. خەڵکم دەدی کە ١٥٠ بار ترێی ڕادەکرد و بۆ ماوەی یەك تا دوو مانگ ترێیەکە لەوێ دەمایەوە. ترێی سپیش دەهێنرایەوە ماڵ و لەسەر بان و حەوشە و شوێنی

راست ڕادەخرا، چونکە دەبوایە یەك لەدوای یەك هێشوەکانی ترێی سپیمان خۆش کردبان. بۆ خۆشکردنی ترێی سپی، خۆڵەمێش لەناو مەنجەڵ لەگەڵ ناو دەکوڵێنن، دوایی ساردی دەکەنەوە و خۆڵەمێشەکە دەنیشی، ناوێکی زەردی لێ پەیدا دەبێ، ئەو ناوە دەپارزنن وە دووبارە دەیکوڵێنن. دەبوایە هێشوەکانمان لەو ناوە کوڵاوە هەڵێنابا، بۆ ئەوەی پارماتی بدا لە زوو پوچەڵبونی وە ئەیدەهێشت ترێیەکەش برزێ. دوای ئەوەی ترێیەکە بە تەواوی ووشك دەبوو و دەبوو بە مێوژ، ئینجا دەست دەکرا بە پاك کردنەوە و جیاکردنەوەی مێوژی چاك و خراپ. پاشان مێوژەکان لە سەرەد دەدران (سەرەد کونەکانی لە بێژینگ گەورەترە)، ئینجا بەربا (بەبا) دەکرا و دارکەکە دەکەوتە لایەك و مێوژەکەش دەمایەوە.



جووتیارێك لە کاتی زەوی کێڵان

خۆشاویش لە مێوژ دروست دەکرا. هەندێك مێوژیان دەهێنان و دارکی مێوەکەیان لێ فڕێدەدا، ئینجا بۆ ماوەی دوو ڕۆژ دەیانخستە ناو هەندێك ناو. ناوەکە تامی مێوژەکانی دەگرت و دەنکە مێوژەکانیش دەگەشانەوە و وەك ترێی نوێیان لێ دەهاتەوە. خۆشاو لە شەوانی درێژی زستان لەگەڵ گوێز وەك شەو چەرە دەخورا.

ئەو ترێیەی کە بەرچاو وە باش نەبوو، دەکرا بە دۆشاو. چۆنیەتی دروست کردنی دۆشاویش بەم شێوەیە بوو. قەدی دارێکی گەورەیان دەهێنا و لە ناوەڕاست شەقیان دەکرد. ناوەکەیان دەکوڵی و دەیانکرد بە کوڵ، لە شێوەی نیوە بەرمیلێکی بە درێژی بڕاوە دەچوو. کۆڵەکەیان لەسەر دوو دار یان بەرد دادەنا، ئینجا ترێیان دەکردە ناو پارچە قوماشێك کە لە شێوەی گونیە وابوو و پێی دەگوترا ڕاوەك. ئینجا دەیانخستە ناو کۆڵەکە و دەستیان دەکرد بە گوشینی ترێکە بە پێ. لەلای خوارەوەی کۆڵەکە، ناوە گوشراوی ترێیەکە دەڕژایە ناو

تەشتێك و لەوێشەوە بە كۆتك دەكرایە ناو مەنجەڵی گەورەی سەر ئاگر تا بە تەواوی دەكوڵا.

جۆرە گڵێكی سپی تایبەت هەبوو كە لە تورەكەیەكیان دەكرد و دەیانخستە ناو مەنجەڵی پڕ لە شیلاوی ترێیەكە. گڵە سپیە كە دەبووە هەوێن بۆ ئەوەی شیلاوەكە ببێ بە دۆشاو. كە ناوی ترێیەكە دەبوو بە شلەیەكی پەیت، پێی دەووترا زێراو. زێراوەكەیان بە هێرەنگ یان بە پارچە قوماشێكی تەنك دەپارزنی، ئینجا سەر لەنوێ دەیانخستەوە سەر ئاگر و دەیان كوڵاندەوە، تا بە تەواوی پەیت دەبوو، ئەوكات دەیان گووت دۆشاوەكە هاتووە (پێگەیشتوە). هەندێك جار لە كاتی كوڵاندنی دۆشاوەكەش، باینجان و سێو و هەرمێیان لەت دەكرد و دەیانخستە ناو زێراوی دۆشاوەكە، بەمانەشیان دەگوت بەلەچەك كە شتێكی زۆر بەتام و خۆش بوو. جگە لە ترێ، زۆر ماڵیش دۆشاویان لە توو دروست دەكرد، بەڵام ئەمەیان وەك دۆشاوی ترێ بە هەرمێن نەبوو.

دوای ئەوەی دۆشاوەكە ئامادە دەبوو، دەیانكردە ناو كوپ و كودی (كولەكە)ی گەورە، كە ٢٠ تا ٣٠ كیلۆ دۆشاوی دەگرت. ئێستا ئەو جۆرە كولەكەیە لە ناوچەی ئێمە نەماوە كە ملەكەی هێندەی كاڵەكێك و بنەكەشی هێندەی تەشتێك بەرین دەبوو، بە تەڕی تەنكە سەر قەپاغی كولەكەكەیان لێدەكردەوە و ئاویان تێدەكرد، دوای سێ هەفتە ناوەكەی دەڕزی، ئینجا دەیانشوشت و پاشان لەبەر هەتاو دایاندەنا تاكوو ووشك دەبوەوە و دۆشاویان تێ دەكرد.

جگە لەوەی دۆشاو خواردنێكی سەرەكی بوو، بەشێكی زۆریشی بەهاران و پایزان بە كاروان لێ دەبردرا كوێستان و دەشتی هەولێر. دۆشاو بە دانەوێڵە و خوێ و ڕۆن دەگۆڕدرایەوە، یان بە پارە دەفرۆشرا. بۆ بە كاروانبردن، دۆشاو لەمەشكە (هیزە)دەكرا. هیزە جۆرێك بوو كە لەپێستی ئاژەڵ دروست دەكرا، یەكەم جار دۆشاوی تێدەكرا تاكو پێستەكە بەشێك لە دۆشاوەكەی هەڵدەمژت و نەرم دەبوەوە. لە ڕێگا بەهۆی ڕۆیشتن مەشكەكە دەشەقا و هەوای دەكرد، ناچار ناوە ناوە هەوایەكەیان لێ بەتاڵ دەكرد. دوای ئەمە دەكرا ئەم هیزەیە بۆ هێنانی ڕۆنیش بەكاربێت. لە بیرمە ئاڵوگۆڕی دوو بادیلە دۆشاو بەرامبەر یەك بادیلە ڕۆن بوو. شایانی باسە بەشێكیش لە ڕۆنی ئاژەڵ لە شەقڵاوە لەلایەن ئەو ماڵانەی كە خاوەنی مەڕ و بزن بوون دەستدەكەوت. زۆر لە ماڵەكانیش بە مەشكە ژاندن بەشە ڕۆنی خۆیان پەیدا دەكرد.

لە بەرهەمی ترێ خواردنێكی تریش دروست دەكرا كە پێی دەگوترا ترش و شیرین و وەك شەربەت دەخورایەوە. ئەمە لەو جۆرە ترێیە دروست دەكرا كە

بەشێکی پێگەیی و شیرین و بەشەکەی تری کاڵ و ترش بوو. ئەمەش بە هەمان شێوەی دۆشاو لەسەر ئاگر دەکوڵێندرا، بەڵام بە پێچەوانەی دۆشاو ئەو جۆرە گڵەی کە بۆ هەوێنی دۆشاو بەکار دەهات لە ترش و شیرین پێویست نەبوو. زۆر جاریش سرکە و دۆشاو تێکەڵدەکران و هەمان ترش و شیرینی لێ دروست دەبوو.

سرکەش لەهەناری ترش دروست دەکرا، بەتایبەتی ئەو هەنارانەی شەقبردو بوون و بارانی پایزیان پێکەوتبوو، چونکە هەمیشە پرئاو تر و بەتام تر بوون. بۆ دروستکردنی سرکە، چەند بارێك هەناریان دادەکوتا، پاشان وەك دۆشاو لە کۆلان دەگوشرا، ئینجا خێی تێدەکرا و ئاوەکەی لەسەر ئاگر دادەنرا تا پەیت دەبوو. لەکاتی کوڵاندن، کەفێکی لێ پەیدادەبوو پێی دەگوترا زفر کە لە سرکەکە جیادەکرایەوە. هەندێك کەس دەنکە هەنارە گوشراوەکانی خێ دەکرد و لەبەر هەتاو دایاندەنا لە شێوەی تۆپەڵەی خڕ وشکیاندەکردەوە، بەمەشیان دەگوت برمە و چێشتیان پێ لێدەنا. سرکە ئەمڕۆ بۆتە خواردنێکی سەرەکی زۆربەی ماڵەکانی کورد کە قەرە پڵاوی پێ ئامادە دەکرێ و بۆ زەڵاتە و گۆشت برژاندن بەکاردێ، هەروەها لە ئامادەکردنی زۆر خواردنی تریش سوودی لێ وەردەگیرێ.

بۆ ووشککردنەوە و دروستکردنی لەتکە (لەتە) هەنجیر، هەنجیریان بۆ ماوەی چەند رۆژێك لەبەر خۆر رادەخستن تا بە تەواوی ووشك دەبونەوە. ئەو هەنجیرانەی کە زۆر گەیی ببوون، لە شێوەی نان پانیان دەکردنەوە و بەوانیش دەگوترا نانە هەنجیر. بۆ ئەوەی هەنجیرەکان نەرم و شل بن وە بەرگەی رزینیش بگرن، مەنجەڵە ئاوێکی کوڵاویان دەهێنا وە هەندێك روونیان لەگەڵ دەکرد. هەنجیرەکانیان لە پێتەرازوێکی دەنا و لەناو رون ـ ئاوەکەیان هەڵدەهێنا. دواتر دووبارە لەبەر هەتاو ووشك دەکرایەوە، ئینجا دەیان کردە ناو هەمبان و لە زستان وەك پێخۆر بەکارمان دەهێنا. جگە لە هەنجیر، گەلێك مێوەی تریش هەبوون بەهەمان شێوە ئامادە دەکران، وەك هەرمێ و قەیسی و گەراز...

هەروەها لە وەرزی بەهار کە ماستی مەڕ زۆر دەبوو، ساواری وردیان تێکەڵ بە ماست دەکرد. شتێکی لە شێوەی کفتەیان لێ دروست دەکرد و لەبەر خۆر دایاندەنا تا ووشك دەبوەوە، بەمەش دەگوترا داندۆك. جگە لە داندۆك، دۆیین هەبوو کە بە کەشك ئامادەدەکرا. دەتوانم بڵێم تا چلەکانی سەدەی رابردوو، خەڵکی نەیاندەیزانی دۆڵمە و کفتە و مرەبا وە زۆر خواردنی تر ئامادەبکەن. تا ئەو کاتەی ئەرمەنیەکان هاتنە شەقلاوە و زۆر شارەزاییان لە زۆر بوار هێنایە شارەکەمان. ئەرمەنیەکان لە فەرهەنگی خواردن زۆر شارەزا و دەوڵەمەند

بوون، بەشێکی زۆری ژنانی شەقلاوە لەسەر دەستی ژنە ئەرمەنیەکان، فێری دروستکردنی زۆر جۆر خواردن بوون.

جگە لەمانەش لە بەهاران چەندین کیلۆ پەنیر سوێر دەکران و لەناو کوپی پڕ لە خێواوك (خوێ و ناو) هەڵدەگیران، هەروەها دۆشاوی تەماتە و لەتکە تەماتە و کودی و توو... ووشك دەکرا و ئەمانەش وەك خۆراك بەکار دەهاتن.

لە کۆنەوە تا پەنجاکانی سەدەی ڕابردووش، زۆرکەس بۆ بژێوی ژیان لە چیای سەفین چاڵە بەفریان لێدابوون. چاڵە بەفرەکان چەند مەترێك بەرین و قووڵ بوون و بەفر لەناویان هەڵدەگیرا و تا پایزان هەردەما. لە زستان خاوەن چاڵە بەفرەکان بە کۆمەڵ دەچوونە سەفین و بەفریان دەکردە گلۆرەی گەورە و بە پاڵدان دەیان کردنە ناو چاڵەکان تاکو پڕدەبوون. دوواتر چاك دەیانپەستەوە کە بەجۆرێك هیچ کەلێنێکیان نەدەهێشتەوە، چونکە ئەگەر هەوا بچوبایە ژوری، ئەوا بەفرەکە تەمەنی کورت دەبوو وە دەتوایەوە. دواتریش بەفرەکە بە کا دادەپۆشرا.

هەندێك لەو چاڵە بەفرانە زۆر گەورەبوون، بۆ نمونە چاڵە بەفری دارمازیێ نزیکەی ٦٠٠ بار بەفری لێ باردەکرا. ڕۆژی ٢٠ تا ٣٠ بار بەفر لە چاڵی جیا جیا دەهاتە شەقڵاوە. لە ماڵەوەش بە گوش و کا بەفرەکەیان دەپاراست، هەندێك جاریش خوێیان بەکاردەهێنا. بەم جۆرە بەفرەکە بۆ ماوەیەکی زۆر دەما. ئەو کات ڕۆژی ١٠٠ تا ٢٠٠ بار بەفر لە چیاکان دەچوو بۆ هەولێر. بۆ نمونە ماڵی عەزیز پاشا لە هەولێر، هەموو ڕۆژ بەفریان بۆ دەچوو.

# کەلوپەلی ماڵان

جاران ژیان وەکو ئێستا ئاڵۆز نەبوو، بگرە زۆر سادەبوو. داواکاری خەڵکی زۆر نەبوون، بەڵام لە هەمان کاتدا ژیان زۆر سەخت بوو. جگە لە کەلوپەلی خۆماڵی کە ئەویش بۆ هەموو کەسێك نەدەڕەخسا بیانکڕێت، زۆر بە دەگمەن شتێکی دەرەکی دەست دەکەوت. زۆربەی ئەو کەل و پەلانەی کە لە ماڵەکان بوونیان هەبوو، شتی زۆر سادە و ساکار بوون. بەشی زۆریان دەستکردی ماڵەکان خۆیان بوو یان هەر لە شەقلاوە دروست دەکران. ئەگەر شتێك زۆر پێویست نەبا، خەڵك نەیدەکڕی. لەبەر نەبونی، خەڵك گوێی بە کەل و پەلی جوانکاری ماڵ نەدەدا. لێرەوە ئاماژە بە هەندێك لەو کەلوپەلانە دەکەم کە لە زۆربەی ماڵەکان بوونیان هەبوو.

بەرهەمەکانی شوو (شوارك) زۆر سوودیان لێ وەردەگیرا. بۆ نمونە سەلە(سەبەتە)، بۆ مەبەستی نان ڕشاندن و ووشك کردنەوەی میوە بەکاردەهات. پێتەرازوو، بۆ شت لەناو هەڵگرتن وە هەروەها پێشکەش کردنی میوە بۆ میوانان بەکاردەهات. تریان، بۆ بە دەستگواستنەوەی بەروبومی ڕەزەکان، هەروەها وەك پێوانەیەکیش وابوو بۆ ژماردنی گوێز و هەنار و هەرمێ... قەرتارە و سەوی، بۆ کاروان بەکار دەهاتن. لە پشتی وولاغ قایم دەکران و ترێ و توو و جۆرەکانی تری میوەی بۆ هەولێر و دەوروبەری پێ دەگواسترایەوە. سەوەشیر، لەجیاتی ساردکەرەوە بۆ پاراستنی گۆشت، شیر، ماست، پەنیر... بۆ ماوەیەکی کاتی بەکاردەهات. سەوەشیر بە قەبارە گەورە بوو و لەسەر سێ بەرد بە ئەستونی دادەنرا، بە جۆرێك قۆرت (چاڵ)ێك لە بەینی سێ کوچکەی بەردەکان لێ دەدرا و پڕ ئاو دەکرا، بۆ ئەوەی هەوای ژێر سەوەشیرەکە فێنك بکاتەوە. هەر بۆ زانین ووشەی سەوەشیر ناوێکی لێکدراوە (سەوی - شیر)، سەویش مانی سەبەتە. ئەوانەی سەرەوە هەموویان لە شووی داری بی و بلاروك و قەرەقاج... دروست دەکران و لە کاتی منداڵی من بە یەك تا چوار عانە بوون.

قاپ و قاچاغیش هەندێکیان لە سفر دروست دەکران وەك: مەنجەڵ، بادی، قاپ، دەست مەنجەڵ، مەنجەڵی کورکردن(جل شوشتن)... زۆر شتیش هەبوون لە دار دروستدەکران وەك: کەوچك، ئەسکو، کۆتك، تەبەقی شەکر، تەبەقی نان، خوانە، کاسە کە بۆ هەویر شێلان بەکاردەهات.



چەند کوێنە کوتکێك

هەندێکی تریش لەو کەلوپەلانەی لە ماڵان بەدیدەکران: بێژینگ، هێرەنگ، تەشی، گوڵەژەن، زەمبیل، دێمکە و شەربە و گۆزەی ناو، هێزەی ڕۆن، مەشك و ڕبە. کوپیش بۆ هەڵگرتنی زۆر لە خواردەمەنیە شلەکان بەکاردەهات وەك دۆشاو، تەڕەساز، قەلیە، پەنیری سوێرکراو... قەندیلە (چرا ڕەشکە)، بۆ ڕۆناك کردنەوە بەکاردەهات و بە دەستی سەفارچیەکان دروست دەکرا، کەچە پەرۆیەکیان تێ هەڵدەکێشا و بە نەوت کاری دەکرد. پێش ئەوەی قەندیلەش پەیدابێ، گوێزێکیان لە سوژن هەڵدەکێشا و دەیانسوتاند. دواتر فانوس و لالە پەیدابوون و باوی ئەوانە نەما.

بۆ هەڵگرتنی قاپ و قاچاغ، دۆلاب بەکاردەهات کە لە دار دروست دەکرا و پێشەوەیان دانەدەخرا یانیش بە هێرەنگ دەگیرا، بەڵام زۆر بە دەگمەن ماڵ هەبوو دۆلابی هەبێ. ئەستەرك (ئەستێرك)یش، بریتی بوو لە چەند دارێك کە بە دوو داری دوولك ڕاگیرابوون، بە جۆرێك نزیکەی مەترێك بەرین و مەترێکیش لە زەوی بەرز و درێژیەکەشی دوو مەترێك دەبوو. لە زۆربەی ماڵەکان دوو ئەستێرك بەدی دەکران، یەکیان بۆ لەسەر دانانی نوێن و ڕایەخەکان و یەکیش بۆ هەڵگرتنی زەخیرە بەکاردەهات. زەخیرە لەناو هەمبان دەکران بە جۆرێك دەمی هەمبانەکە ڕوە و دەرەوە دادەنرا، تاکو کابانی ماڵ بە ئاسانی گرێیەکەی بکاتەوە و بەشی چێشتی لێ دەربێنێ. جگە لەمانەش زۆربەی ماڵەکان باولی دار، یان لە تەنەکە دروستکراویان هەبوو و بۆ هەڵگرتنی جل و بەرگ یان پارە و زێڕ بەکاردەهاتن، ئەمانە زیاتر لە موسڵ و کەرکوك دەهێندران.

لەسەر هەموو بانێك باگوردان هەبوو، بۆئەوەی لە کاتی باران بارین سەربانی پێ بپەسترێتەوە. هەروەها شەپارۆخ (بەفرماڵ)یش لە هەموو ماڵێك هەبوو بۆ ڕامالینی بەفر لەسەر بان و ڕێگەکان. ئەوکات بەفر زۆر لە ئێستا زیاتر دەباری. تەندوری نانیش لە زۆر ماڵان هەبوو، کاتێك تەندوور گەرم دەکرا،

پێنج تا شەش ژن بەزبارە (هەرەوەزی) نانیان دەکرد، دوو ژنیش نانەکانیان پێوەدەدان.

لە هەموو ماڵێك ئاگردان بۆ چێشت لێنان و ماڵ گەرمکردنەوە هەبوو، بەڵام ژوورەوەی هەموو دەکردە دووکەڵ. تەنها لە هەندێك دیوەخانەکان مەغارەی ئاگر هەبوو کە ئاگردانەکە لەناو دیوار بوو و دووکەڵەکە دەچووەدەرەوە. دواتر سۆپای داران لە ئێران هێندران. بۆ هێنانی داریش، لە بەهاران کە دار تازە پەلك دەردەکا، چەند کەسێك بە زبارە دەچوونە گزرەبڕین. لە جێگایەکی دوور لە ئاوەدانی یان لە چیا، گزرە داریان بۆ زستان دەبڕی. لە بەهاران دار ئاوی تێدەگەڕێ و بڕینی زۆر ئاسانترە. هەرکەسە و بەشی چل تا پەنجا بارە داری دەبڕی و بەجێی دەهێشت. ئیتر بۆ پایز ووشك دەبوون، ئینجا دەچوون و قەد قەدیان دەکرد و دەیانهێنانەوە. شەقڵاوە و دەوروبەری زۆر پڕدار بوو، تەنانەت کەم شوێن هەبوو داری لێ نەبێت. بۆ نموونە پاوانەکی حەمەدی حاسێ هەبوو کە هەزاران بار داری تێدابوو، نەڵێن خۆی ووتویەتی ساڵ هەبووە لەناو ئەو دارانە، دە شانەی مێش هەنگوینی دەرهێناوە. لە پاش سیەکان ڕەژوو کردن دەستی پێ کرد و ئیتر داروبار بەرەو قڕان چوو.

دەستاڕیش یەکێك بوو لە پێداویستیە گرنگەکانی ژیان و ئێستاش لە بەشێك لە گوندەکانی کوردستان هەندێك ماڵ هەر هەیانە. دوو جۆریشی هەبوو، گەورە و بچووك. دەستاڕ بۆ هاڕینی گەنم و خوێ و نیسك... بەکاردەهات. پێکهاتبوو لە دوو بەردی خڕ، کە بە چەکوش زۆر جوان ڕاست دەکران و ڕێك لەسەر یەك دادەنیشتن. بەردەکان زۆر بە بەرگە بوون و لە شوێنێکی تایبەت لە ناوچەی گوندی کاموسەك دەهاتن. تیرەی هەریەك لە بەردەکانی دەستاڕی گەورە، نزیکەی ٤٠سم و ئەستوریەکەیان١٠سم دەبوو. بەردەکان لەسەر یەکتر دادەنران و ئەوەی بنەوە کونێکی دوو ئینجی لە ناوەڕاست دابوو کە دارێکی تێ دەگیرا، بەو دارە دەووترا کولیە. سەرەکەی تری کولیەکە بەرز دەبووەوە بۆ ناو بەردەکەی سەرەوە کە کونێکی گەورەتری لە دارەکە تێ دابوو و دارەکە لەگەڵ ڕۆخی لای سەرەوەی بەردی سەرەوە مشت دەبوو. ئەو شتەی کە مەبەست بوو بهاڕدرێ، لە کەلێنی دارەکە و کونەکە ڕەوانەی خوارەوە دەکرا. کونێکی تریش لە نزیك ڕۆخی دەرەوەی بەردی سەرەوە دەکرا، دەسکێکی داری تێ دەگیرا بۆ سوڕاندنی دەستاڕەکە.

دەستاڕ بۆ هاڕینی گەنم بەکاردەهات، دواتریش ساوار و بروش و کاکر و پیرخەنی و ئاردە ساورەکەش بە هێرەنگ و بێژینگ لە یەك جیادەکرانەوە. هەندێکی تریش لەو شتانەی لە دەستاڕ دەکران بریتی بوون لە نیسك، خوێ،

نۆك... دەستاڕی گەورە بە دووکەس کاری پێ دەکرا و بەرامبەر یەك تر دادەنیشتن. زۆری خەڵك ئەم کارەیان بەهەرەوەز دەکرد، زۆر کەسیش بۆ خێر دەیانکرد، چونکە ماندوبوونی زۆربوو. دەستاڕی بچوکیش بە هەمان شێوە بوو، بەڵام بە یەك کەس کاری پێ دەکرا.



دەستاڕ

گرگر، وەك دەستاڕ وابوو، بەڵام لەجیاتی بەرد لە دار دروست دەکرا. کەلێنەکەی سەرەوەی لە دەستاڕ بەرین تر بوو. لەبەر بەهێزی دارەکە و بەرگەگرتن و زۆری کێشەکەی، گرگر لە داری تو دروست دەکرا. دوو دارەکان لەسەر یەك دادەنران، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر لووس بوون، قیریان دەهێنا و گەرمیان دەکرد و پارچە پارچە بە سەر و بنی دارەکانیان وەدەنا، تاکو گری گرێی لێ پەیدا بکەن. گرگر بە زۆری بۆ چاککردنی چەڵتوکی برنج بەکاردەهات.

جۆنی، پێداویستیەکی تری گرنگ بوو لە ژیانی ئەو کات، کە بۆ کوتان و وورد کردنی هەندێك لە خواردنەکان بەکاردەهات. لە شێوەی ناونێکی گەورە بوو، بەڵام دەسکەکەی زۆر گەورەتر بوو. جۆنی دوو جۆری هەبوون، جۆنی دار و جۆنی بەرد. جۆنی بەرد لە بەردێکی پان و قوڵ دروست دەکرا. چاڵێك لە ناوەڕاستی بەردەکە لێدەدرا کە نزیکەی ٢٥سم قوڵ و بەرینیەکەی نزیکەی ٢٠سم بوو. دیواری ژورەوەی جوان لوس دەکرا و دەسکێکی لە بەردی خڕیشی بۆ دەکرا. تیرەکەی دەسکەکە نیو ئەوەندەی چاڵەکە بوو، بەڵام درێژیەکەی دوو ئەوەندەی قوڵاییەکەی بوو. جۆنی داریش بە هەمان شێوەی بەردەکە چاکدەکرا، بەڵام دەسکەکەی هەر لە بەرد بوو. جۆنی بۆ کوتانی سماق و مێوژ و گوێز و تووی ووشك و بیبەر و شتی ناسك بەکاردەهات، زۆر جاریش ساوار و برنجی پێدەکوترا. زۆربەی ماڵان هەیان بوو و خەڵکیش دەچوونە ماڵی یەکتر بۆ بەکارهێنانی جۆنی.

# گژوگیا

سروشتی ناوچەی ئێمە زۆر دەوڵەمەندە و سەدان جۆر گژوگیای سوود بەخشی لێیە و بەشێکی زۆریان بۆ خواردن دەشێن، بەشێکی تریشیان لە دەوا و دەرمانی پزیشکی بەکاردێن. کاتی خۆی مەسیحیەکانی شەقلاوە لە ڕووی ناسینی جۆری گژوگیا، خەڵکی زۆر شارەزا و پسپۆریان هەبوو. ئەوان لە ماوەی ئەو پەنجا ڕۆژەی کە لە پێش جەژنی قیامەت بە ڕۆژوو دەبن، تەنها لەسەر بەروبومی گیایی دەژین و هیچ بەروبومێکی ئاژەڵی ناخۆن. هەر ئەمەش هۆکاری سەرەکی بووە کە ئەوان زۆر گرنگی بە خواردنی گیایی بدەن و ئەم بۆشاییەی لە کاتی بەڕۆژوو بووندا دوچاری دەبن، پڕی بکەنەوە.

ئەو گیا خۆراکانەی کە من بیرم دێن و لە چیا و دەشت دەمانکردن، جگە لەوەی زۆر سوود بەخش بوون، خەڵکێکی زۆریشیان لە برسیەتی و گرانی ئەوکات دەرباز کرد. من بەو شارەزاییە کەمەی کە هەمە دەربارەی ئەو گیایانەی کە لە منداڵی پێیان ئاشنابووم، لێرەدا ناویان دەهێنم و هەندێکیان بە کورتی باس دەکەم. هەندێك لەو گیایانە بریتیبوون لە: ڕێواس، ترشۆکە، سۆریاز، کەنگر، سمرکە مەرجاپیلك، پیفۆك، مام ڕێواس، گێزبەلە، شیرمژۆك و کاردی. کاردیش چەند جۆرێکی هەن، کاردی ریشۆری، کاردی شاخی، کاردی بەرخۆرەی و کاردی ڕیخنە.

هەندێك لەم جۆرە گیایانە، خەڵکی زۆر بە گرنگیەوە بەدوای دەگەڕان و دەیانگووت بۆ مرۆڤ زۆر سوود بەخشن. بۆ نموونە گەپرۆکە کە گیایەکی تەمەن کورتە و هەر کە لە زەوی دەیپچڕێنی، دەبێ دەم و دەست بیکوڵێنی، چونکە بە ماوەیەکی کەم زەرد دەبێ وە کەڵکی خواردنی نامێنێ. ئەگەر کەسێك داوایەکی خراپی بۆ کەسێکی تر خواستبا، پێی دەگووت "تەمەنت بە تەمەنی گەپرۆکەی بێ". هەروەها دەووترا "گەپرە بە نانی، گۆشتی بەرانی. گەپرە بە خێیە، گۆشتی بەرخێیە. گەپرە بەماستی، چێشتی بەڕاستی".

کوارگ (قارچك)یش چەندین جۆری هەبوون وەك: کوارگی ئەسپیندار، کوارگی دارەبی، کوارگە ڕەش، کوارگی عەجەم، کوارگی دۆمبەڵان... گیابرژانەش زۆر جۆری هەن وەك: پێ کۆترۆکە، گیا سورکە، پێ مریشکۆکە، شیلم شاترە، مام دەرزیلە، مام گێژنە، گیا گەنمۆکە، پرپینە (پەلپینە)، گیا قجیلە... کاتی خۆی بە تێکەڵی دەمانکردن و هەندێك خوێ و ناومان پێدادەکردن، ئینجا لەسەر سێڵ (ساج) دەمان برژاندن و بە ناوبرێشك ئەمان پەستا. تامی گیابرژانە زۆر لە تامی گۆشت خۆشتر بوو. دوای چەندین ساڵ ژیان لە ئەمریکا، میرانی ساڵح

بەگ گەڕایەوە شەقڵاوە. لەبیرمە کە خەڵکی گوندی ترگارە سەردانیان کرد، داوای لێ کردن گیا برژانەی بۆ پەیدا بکەن.

لە خەرتەلە و گیا پەرچێوە، تەڕەسازمان دروست دەکرد. پونگیش بۆ چارەسەری نەخۆشی و لە هەمان کاتیشدا لەگەڵ چێشت لێنان بەکاردەهات. کوڕادە و بەندۆکە و ترنجۆك و کوزەلەمان وەك سەوزەی تەڕ بەکار دەهێنان. سێ بسکۆرە و کوریك سپیلك، کوریك حاجیلە و کەربەشە بە ساوار لێ دەنران. هەندرێشەش لەگەڵ ماست دەخورا. دەڵێن "هەندرێشە و ماست خواردنی میرانە". من ئەم خواردوە، چونکە زۆر دەگمەن دەست دەکەوت.

گۆرمزەش بە گیایەکی زۆر سوود بەخش ئەژمێردرێ. جاران دەیانگووت کوریکەی گۆرمزە بۆ منداڵ زۆر سوود بەخشە و خێرایی گەشەکردنی زیاد دەکات. دەڵێن دەرمانی دژە ژەهریشە لەناو جەستەی مرۆڤ. دەیانگووت ئەو کاتەی کیسەڵ مار دەخوا، لە دوای ئەو گۆرمزە دەخوا بۆ ئەوەی ژەهری مارەکە کاری تێ نەکات. بەشێك لەو گیا و گوڵانەی ئاماژەم پێکردن، لە ئەمریکاش دەستم دەکەون وە هەندێکەشیان لە بازار دەفرۆشرێن.

جاران زۆر لەو گیایانەمان بە مەبەستی داو و دەرمان بەکاردەهێنان، بۆ نموونە تۆلەکە کە لە شەقلاوە بە تورکە ناوزەد دەکرێ، بۆ چارەسەرکردنی سك ئێشە بەکارمان دەهێنا. ڕکێش، کە ناوەکەی هەر لەخۆیە و بۆ ڕاکێشان و هێنانە دەرەوەی پیسی لە ناو برین یان بۆ دەرکردنی کولك بەکاردەهات. ئەستریلك، مەسیحیەکان بۆ دروستکردنی کر سوودیان لێ وەردەگرت، کە لە کریان دەدا، ئەوا ڕەق دەبوو وە قەدی نەدەشکا. گێنی و گیا کەتیرە، لەجیاتی سیکۆتین بەکاردەهاتن. دەیان جۆرە گژوگیای تر هەبوون کە بەداخەوە پیری لە بیری بردومەتەوە.

لە سیەکانی سەدەی ڕابردوو لە دەور و بەری شەقڵاوە و چیای سەفین، دار یەکجار چڕ بوون. بەروبومی زۆر داری خۆڕسکیش دەست دەکەوتن وەك: باوی، حاجی باوی، بلاروك، گێوژ، کرۆسك، بەڕو... گیاندارە کێویەکان لە زستانان لە دوای بارینی بەفرێکی زۆر، بەروبوومی ئەو دارانەیان دەخوارد و سکی برسی خۆیان پێ تێر دەکرد. لە نێوان حاجی بایز و دەربەندی شەقڵاوە، زەویەك هەبوو پێیان دەووت زەوی کرۆسکان کە بنە کرۆسکی زۆر گەورەی تێدابوون. (کرۆسك، جۆرە مێوەیەکە و لە ڕەگەزی هەرمێیە). کرۆسك ووشك دەکران و بۆ نالیك لەگەڵ کاو جۆ دەدران بە گیانداران. باوکم دەیگێڕایەوە کە کرۆسك لە گرانی گەورە، زۆر کەسی لە مردن ڕزگارکردوە. کاتێك خەڵك نانی

نەبووە بیخوا، کرۆسکیان ووشك کردوە و لەگەڵ گەنم و جۆدا لە ناش هاڕیویانە و کردویانە بە نارد. لە گرد نۆمەری نزیك پردی ڕووسارك کە زەوی ماڵی ڕەسول بەگی پێدەووترا، چەندین بنە داری زۆر گەورەی کرۆسك و گێوژ هەبوون و سێبەریان یەك جار تێربوو. خێڵەساتی وەك خەیلانی و باڵەکی و مام سار، یەك لە دوایی یەك دەهاتن و لەوێ دەمانەوە. جاری وا هەبوو بەفریش دەکەوت، ئەوان هەر لەوێ بوون.

## ئاشی ئاو

مێژووی ئاشی ئاو لە کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ سەدان ساڵ بەرلە ئێستا و پێداویستیەکی سەرەکی بووە لە ژیانی باب و باپیرانمان. یەکێك لە خۆراکە سەرەکیەکانی مرۆڤ دانەوێڵەیە و ئەوانیش بەشێکیان پێویستیان بە هاڕینە بۆ ئەوەی بتواندرێ لە ئامادەکردنی نان و چێشتی جیاواز سودیان لێوەربگیرێ. ئاش لە ناوچەی ئێمە زیاتر بۆ هاڕینی گەنم و جۆ و چەڵتوك بەکاردەهات و بەرهەمەکانی بریتی بوون لە: ئاردی گەنم و جۆ، ساوار، بروش، گەنمەکوتا، پیرخەنی، برنج و ئاردە برنج...

لە شەقڵاوە چوار ئاش هەبوون و هەموویان کەوتبونە سەر ئاوی ئاوەنجی. ئاش لە شوێنێك دروست دەکرا کە سەرچاوەیەکی ئاوی باشی هەبوایە. هەوڵیش دەدرا کە ئاوەکە دیوارێکی بۆ هەڵندرێ لە شێوەی بەنداوێکی بچووك. ئەو جێگایانەی لە شەقڵاوە بۆ ئاش هەڵدەبژێردران، خاکەکەیان تەموّخ یان شاخ بوو. ئاشەکە لە قوڵایی و لە خوار ئاوەکە دادەمەزرێندرا، تاکو ئاوەکە بە گوڕ لە پەڕەکانی بدا و بیسوڕێنێ. بۆ ئەوەی ئاوەکە کۆنترۆڵ بکرێ، لەسەرەوە بە کۆلی دار بی دەهێندرایە خوارەوە. تا شوێنی ئاوەکە بەرزتربوایە، باشتربوو. داری بی لە ناو ناو تەمەنی درێژترە لە دارەکانی تر، بۆیە بۆ دروستکردنی کۆلەکان بەکاردەهێندرا. کۆلەکان بە تاقی بەرزاییەکەی پشت ئاشەکە، یەك لە دوای یەك لە شێوەی لولەکێکی درێژ قایم دەکران و هەڵدەپەسێردران، بە تەختەش سەرەکەیان دەگیرا. ئاوەکە بەناو کۆلەکە دەهاتە خوار و لای خوارەوەشی تەسك کرابوەوە بۆ نزیکەی سێ ئینج و ئاوەکە بەتین لە پەڕەکانی ئاشەکەی دەدا. ئەو کونەی خوارەوە پێی دەڵێن پۆسکە وە زۆر جار بە پەلك و دار دەگیرا. پەندێك لای ئێمە باوە کە کەسێك دڵی ناسك بێ و زوو توڕەبێ دەڵێن "پۆسکەی گیرا". لەبەر بەهێزی ئاوەکە، ڕۆخی پۆسکەکە ئەستوربوون بۆ ئەوەی بەرگەی تەقان بگرێ. داری توو زۆر دارێکی بەهێزە، بۆیە پەڕی پەروانەی ئاشەکە لە داری توو دروستدەکران. پەڕەکان بە شێوەیەکی لار لە سەری قەدی دار توویەکی ئەستور دەدران، کە کون کون کرابوو و پەڕەکانی لێ گیر دەکران و پەروانەیەکی لێ دروست دەبوو. پەروانەکە بەشێوەیەکی تەخت دادەنرا و لە ناوەڕاستی سەرەکەی تری قەدەکە کە بە ئەستونی بەرز دەبوەوە، شەفتێکیش بە ئەستونی لە ناو دارەکە گیردەکرا. کە ئاو لە پەروانەکەی دەدا، قەدەکە و شەفتەکەی دەسوڕاند. سەرەکەی تری شەفتەکەش بۆ ناو ژوری ئاشەکە بەرز ببوەوە.



پەڕی ئاشی ئاو

لە ژوری ئاشەکە سەکۆیەك دروستکرا بوو و دوو بەرداشی خڕ لەسەر یەك و لەسەر سەکۆکە داندرا بوون، کە تیرەکەیان نزیکەی مەترێك دەبوو. ڕوی سەرەوەی بەردی ژێرەوە، لەگەڵ ڕوی خوارەوەی بەردی سەرەوە، زۆر جوان لووس دەکران و هەندێك کەلێنی دڕیان لێ دروست دەکران. بەردی ژێرەوە جێگیرکراوە و جوڵەی نیە و لەبەر زۆری سەنگەکەی و نەبونی ئامێری گواستنەوە، پێکهاتبوو لە چوار پارچە بەردی سێگۆشە کە بەدەستی وەستا جوان چاك دەکران. کە چوار سێگۆشەکان کە لە تەنیشت یەك دادەندران، بازنەیێکی خڕی لێ دەردەچوو و بەهۆی تۆقێکی ئاسن، هەرچوار بەردەکان لە شێوەی بازنە بەیەکەوە دەبەسترانەوە. لە ناوەڕاستی بازنەکە کونێکی تێ دەکرا، وە شەفتەکە بەناو سەکۆیەکە و بەناو کونی بەرداشی ژێرەوە تێدەپەڕێ. دەوری شەفتەکە لە کاتی تێپەڕینی بەناو بەردی ژێرەوە، بە پەڕۆیەك دەگیرا و دوونگی مەڕی لێ دەدرا تاکو بەرهەمی ئاشەکە لە کەلێنەکان نەچێتە خوارەوە و بەفیڕۆ نەڕوات. هەروەها شەفتەکە بەهەمان شێوە بەناو بەردی سەرەوە دەڕوات، ئەویش بەهەمان شێوەی بەردی خوارەوە لە چوار پارچە پێکهاتبوو. بەڵام کونی بەردی سەرەوە، تەواوێك گەورەتر بوو لە شەفتەکە، بۆ ئەوەی دانەوێڵە لە کەلێنەکان بچێتە ژورەوە و لە بەینی دوو بەردەکە بهاڕدرێ. لە ڕوی لای سەرەوەی بەردەکە، کەلێنێك لەمبەر بۆ ئەوبەری کونەکە کرابوو، هەروەها کونێکیش لە قەدی شەفتەکە لە هەمان شوێن کرابوو و پیمێکی ئاسن بە کەلێنی بەردەکەو بەناو شەفتەکادا ئاوا دەبوو بۆ کەلێنەکەی ئەوبەری شەفتەکە، بە جۆرێك تا بەردەکە و شەفتەکە لە یەك گیرببن. لەکاتی سوڕانی شەفتەکە، تەنها بەردی سەرەوە دەسوڕا. هەروەها لە ڕوی سەرەوەی بەرداشی سەرەوە، بازنەیەکی گەورەتر لە کونەکە و بە بەرزایی چەند سانتیمەترێك لە گەچ یان لە هەویر دروستدەکرا، تاکو دانەوێڵە زیاتر هەڵبگرێت.

ئەگەر چوار بەردەکانی بەرداش شلکەیان لەبەین دروست ببوایە، ئەوا زەمۆمە (تەلیشە)ی لە داری توو لە بەینی تۆقەکە و بەردەکان دەکوترا تاکو توند ببنەوە. لە دەورەی سەکۆیەکە، دیوارێکی بە بەرد و گەچ یان بە تەختەی دار لە هەرچوار لا بەرز دەکرایەوە و تەنها لە پێشەوەی کەلێنێك جێ دەهێڵرا بۆ ئەوەی بەرهەمی ناشەکەی لێ کۆببێتەوە و بتواندرێ بەئاسانی لەناو تەلیس (گونیە)بکرێ. لە سەرەوەی بەردەکانیش کۆلێکی گەورە هەبوو کە لە دار دروست کرابوو. لای سەرەوەی کۆلەکە لە شێوەی چوارگۆشەیەکی گەورەی مەتر و نیوی بوو و چەند تەنەکەیەك دانەوێڵەی دەگرت. چوار دیوارەکانی کۆلەکە لە ژێرەوە لە یەکتر نزیك بوونەوە و کونێکی بچوکی لێ دروست ببوو. سولاوکەیەك لە خوارەوەی کۆلەکە گیر کرابوو و سەرەکەی تری سولاوکەکە دەهاتە سەر کونی ناوەڕاستی بەرداشەکە و پەتێکی لێ بەسترابوو. پەتەکە بۆ ئەوە بوو کە بتواندرێ سولاوکەکە بەرز و نزم بکرێ و کۆنترۆلی چەندیەتی هاتنە خوارەوەی دانەوێڵەکە بکا و پێی دەگوترا "سێرە و دانە". سولاوکەکە، پارچە تەختەیەکێ پێدا هاتبوە خوارەوە بۆ سەر بەردی ناشەکە کە پێی دەگوترا "چەقێنە". لەگەڵ لەرزینەوە و سوڕانی بەردەکە، چەقێنەکە سولاوکەکەی دەلەرزاند و بە گوێرەی پێویست دانەوێڵەکان دەهاتنەخوارەوە.

دارێك لە تەنیشتێکی سەکۆیەکە لە ژێرەوەی ناشەکە هاتبوە ژورەوە و بۆ عەیاردانی بەردی ناش بەکاردەهات کە پێی دەووترا "پێ". پێیەکە بە تەلیشە دارێك بەرزو نزم دەکرا، بە گوێرەی پێویستی درشت و ووردی بەرهەمەکە. پەندێك هەیە دەڵێ "پێی لێ بڵندکردیە"، بۆ کەسێك دێ کە زوڵم یان کارێکی نابەجێ یانیش قسەی زۆر گەورە بکا.

ئەو دوونگەی لە دەوری شەفتەکەیان دەبەست، زۆرجار لەگەڵ گەرمبونی شەفتەکە شل دەبوەوە و گەنمی لێ دەچووە خوارەوە و دەگوترا "دەبنی برد". پەندە کۆنەکە لەوە هاتوە کە دەڵێ "دەبنی برد" بۆ کەسێك دێ کە زەرەر لەماڵی خۆی بدا. بەردناش لە گوندی کاموسەکی ناوچەی خۆشناوەتی دەهێندران. بەردی ئەوێ زۆر تایبەت و ڕەق و بە سەنگ بوون و بە وولاغی زۆر بەهێز دەهاتن. دوای ماوەیەك بەردی ناشەکە کۆر دەبوون و دەیان هێنانە خوارەوە و بە چەکوش کەلێنی دڕی دوبارە لێ پەیدا دەکرانەوە، ئەوکات دەگوترا "بەرداش تیژە". وەستا مستەفای ناشەوان باشترین کەسی ئەوکات بوو بۆ دروستکردنی بەردی ناش و دامەزراندنی ناش.

چەپەرە دار لە زارکی سەرەوەی کونی کۆلە دارەکان دادەنران کە ناویان بۆ پەڕی ژێرەوەی ناشەکە دەبرد، بۆ ئەوەی ڕێگەی ناو نەگیرێ و فلتەری پەلکی

دار و شتی تر بکا، چونکە کە پۆسکەکە دەگیرا، ناش ڕادەوەستا. یان ئەگەر کۆلەکە کونی تێ ببا، کایان تێ دەکرد تاکو کونەکان قەپات بکات. لە دوای چلەکانی سەدەی ڕابردو، بەرمیل پەیدابوون و لەجیاتی کۆلی دار، بەرمیلیان بەکاردەهێنا. بەرمیلەکان بە یەکەوە چەسپدەکران و نیتر کارەکان بۆ ناش وەستا ئاسانتر بوون.

هەرچەندە لە شەقڵاوە چوار ناشی لەم جۆرە هەبوون، بەڵام هەردەم چاوەڕوانی بۆ نۆرەی ناش گەلەك زۆر بوو. هەر کاتێك ناش چۆڵ ببایە، ناشەوان بانگی ڕادەهێلا "ڕەحمەت لەوی لە بابێوی، ناش بەتاڵە، ناش بەتاڵە"، زۆر کەس ئەو هەڵەی دەقۆستەوە و دەچوو.

بۆ کرێی ناش، هەندێك گەنم وەردەگیرا کە پێیان دەگوت مز. کۆتکێك هەبوو کە پێوانەبوو بۆ وەرگرتنی مزەکە و پێی دەگوترا "کەپولە"، لە هەر تەنەکەیەك کەپولەیەك وەردەگیرا. ناش وەستا حەفتەی جارێك یان لەکاتی پێویست دەهات و پێداوەستیەکانی ناشی جێبەجێ دەکردن. بۆ کرێی ئەویش، ڕۆژانی جومعە ناش بەتایبەت بۆ ئەو دەگەڕا و مزەکەی بۆ ئەو بوو. زۆربەی ناشەکان بەهاوبەشی چەندکەسێك بوون. زۆری ماڵی ناشەوانەکانیش لەتەنیشت ناش بوون. سەربانی ناش و ماڵی ناشەوان، هەردەم پڕبوون لە میوەی ووشك کراو، چونکە زۆر کەس کە دەچوونە ناش، بەتایبەتی خەڵکی دێیەکانی دەوروبەر، شتێکیان بۆ ناشەوان دەبرد وەك: میوە، سەوزە، هێلکە...



ناشی ناو

ناشی بچوکتریش هەبوون کە شێوازەکایان جیاواز بوو و بەردەکانی یەك پارچەبوون. لە ساڵی ١٩٥٧، ناشی ئاگری کە بە نەوتی ڕەش کاری دەکرد لەلایەن میرانی عوسمان بەگ و حاجی سەلیم هێنرایە شەقڵاوە، نیتر ناشی ناو باوی نەما.

# پیشە و پیشەکاران

لەگەڵ پێشکەوتنی مرۆڤ، بەردەوام پیشەی تازەتر دروستدەبن و ئەوانەی کۆن کەم بایەخ دەبن و زۆرجاریش بەتەواوەتی لەناو دەچن. کاتی خۆی لە ناوچەی ئێمە چەند پیشەیەك بوونیان هەبوو و لێرەدا ئاماژە بەهاندێکیان دەکەم و ئەو پیشەکارانەش کە لە کۆن هەبوون و لەبیرمن باسیاندەکەم.

## کارەکدرو

ئەو زەمان لە شەقڵاوە کارەك (پێڵاو) تەنها لە چەرم (پێست)ی گامێش دروستدەکران. ئەوکات چەرم لە ئێران دەهێنران و دەبردران بۆ موسڵ، چونکە لەوێ دەباخانە هەبوو و پێستەکان خۆش دەکران. باشترین کارەکدرو لە شەقڵاوە سێ برا بوون، حاجی سەعید و قادۆ و حاجی ڕەشیدی حاجی خدری. حاجی ڕەشید لە هەردوو براکەی تری وەستاتر بوو. من کارەکم هەر بە ئەو دەدورین و بۆ پینە کردنیشیان دەمبردنە لای برایەکانی ئەو. وەبیرم دێ چەندین قالبی داریان هەبوون کە قەبارەکەیان جیاواز بوون. قالبی داری ئەسپیندار لوس و جوان بوون، بەڵام قالبی داری توو باشتر و قایمتر بوون. چەرمەکەیان ڕادەخست و قالبە دارەکەیان لەسەر دادەنا. ئینجا لەلای سەرپەنجەکانەوە، چەرمەکەیان دەنوشتاندەوە سەر قالبەکە و بە کشتەك دەیاندووری. ڕوی سەرەوەشیان بە بەن دەنەخشاند. لە ناوەوەش پارچە قوماشێك دادەنرا و بە چەسپێك گیردەکرا کە لە گێنی و گیا کەتیرە دروستدەکران. بەو جۆرە پێڵاوانە دەگووترا کارەکی ڕشتی. جۆرێکی تر هەبوون پێیان دەگووترا کارەکی کۆییانی کە سەرەکەیان بە ئاوریشم دەچنرا و گوڵینکەی لێ دەدران. کەلێنێك لە پاشەی کارەکەکان دەهێڵرایەوە، بەتایبەتی لەبەر کاروان کردن. لەبەر قوڕی زستان، قایشێك لە کەلێنەکە دەخسترا تاکو پێڵاوەکە لەپێی دانەکەنێت. ڕێگەوبان ئەوکات زۆر بەرەزالەت بوون، چەندین جار هەبوو کەر بە بارەوە لە قوڕ نقوم دەبوون و بەچەند کەسێك و بەهۆی گوریس و دار دەریان دەهێنان. یەك لەو شوێنانەی زۆر خراپ بوو، کانیێ ئاغان بوو لە نزیك پیاوچاکی باوباپیران.

جارێك لەگەڵ هاوڕێیەکم لە کاروانی هەولێر دەگەڕاینەوە. هاوڕێکەم پێڵاوێکی تازەی لەبەربوو، کاتێك گەیشتینە پیرمەم، بەفرێکی زۆر باری بوو. لەبەر نەبوونی و گرانی پێڵاو، هاوڕیەکەم پێڵاوەکانی دانان و بە دەستیەوە هەڵیگرتن. هەتا شەقڵاوە بەبێ پێڵاو لەناو بەفر ڕۆیشت، من زۆر تکام لێی کرد

ئەو کارەنەکا، چونکە دەمزانی ئازاری پێدەگا. بە داخەوە دوای ماوەیەك لە گەڕانەوەی، هەموو پەنجەکانی پێی لەدەستدان.

بۆ کارەك دروستکردن بەزۆری پێستی گامێش بەکاردەهات، چونکە زۆر قایم بوو، هەروەها پێستی چێڵ (مانگا)ش بەکاردەهات. زۆر جار ئەگەر کەسێك چێڵێکی بکوژتبایەوە، زۆر کەس داوایان لێ دەکرد کە بەشی کارەکێك پێستەیان بداتێ. لە زستان کا لەناو کارەك دەکرا بۆ ئەوەی بەرگەی سەرما زیاد بکا.

زۆری کارەکدروەکان توانای پێستە کڕینیان نەبوو. حاجی برایمە دۆم دەیزانی حاجی ڕەشید پیاوێکی بە دەست و بردە، بۆیە پێستەی لە موسل بۆ دەهێنان. دواتر حاجی ڕەشید کەوتە سەرپێی خۆی و بووە یەکێك لە دەوڵەمەندەکانی شارەکەمان.

لە چلەکان، تاك تاك کاروانچیەکان لە ئێران و لە موسڵ پێڵاویان دەهێنان. لە نیوەی دووەمی چلەکانیش عەلی بەربەر هامشۆی شاری موسڵی دەکرد و منیش جار و بار ڕامدەسپارد کە پێڵاوێکی ڕەزوقیم بۆ بهێنێ. ئەوکات ئەو جۆرە پێڵاوە باشترین جۆر بوو وە هەرچەندە بەقیمەتیش بوو، بەڵام من حەزم لە پێڵاوی جوان بوو. ئەو جۆرە پێڵاوە بە دوو دینار و حەفت سەدو پەنجا فلس بوو، کەچی ڕۆژە کرێکاری بە چوار درهەم بوو.

## ئاسنگەری

وەستا حەمەد عەلی پەریان کاری ئاسنگەری دەکرد و پاشان وەستا عەبدوڵای کوڕی شوێنی ئەوی گرتەوە. ئەمانە کورەکەیان لەلای کانی خمان بوو، پاشان وەستا عەبدوڵا کورەکەی گواستەوە بۆ بەرامبەر قوتابخانەی کاوێس ئاغا. ئەم باوك و کوڕە هەموو پێداویستیەکانی خەڵکی شەقڵاوە و دەوروبەریان دابین دەکرد وەك: بیور، تەورداس، داسوك، قازمە، دوودەو، پێمەڕە، ماوەر، باریە...

## سەرتاش (بەربەر)ی

حەمەدی حەیشە کەڕێ و پاشان عەبدوڵای کوڕی و ئێستاش ئەوەکانی هەر لەسەر ئەم کارە بەردەوامن. هەروەها حەمەد عەلی سەمەدی و پاشان مستەفا

بەربەری کوڕی لەسەر هەمان پیشە بەردەوام بوو. نیستاش فەرهەنگی کوڕی مستەفا یەکێك لە سەرتاشە باشەکانی کوردستانە. عەلی بەربەر خەڵکی قەڵاسنج بوو پاشان لە شەقڵاوە جێگیر بوو، بەڵام زوو وازی لە پیشەکەی هێنا و دەستی بە تەراحی کرد. عەلی بەربەر هاموشۆی لای هەوراماني دەکرد و گوێزی دەکڕین، هەروەها لە پایز میوەی جیا جیای دەکڕین و زۆربەی جار لە موسڵ دەیفرۆشتن. هەندێك جار کەلوپەلی ماڵانیشی لەوێ دەکڕی و دەیفرۆشتەوە بە خەڵکی، پیاوێکی زۆر کاسب بوو. عوسمان بەربەر یەکێکی تر بوو لە سەرتاشەکانی ئەو سەردەم. عەوڵا خەنجەریش، پیاوەکی پۆشتەو جوان و ڕدێن سپی بوو و هەمووکات چاو و برۆی ڕەش دەکردن. ئەوکات زۆر لە پیاوە بەتەمەنەکان برۆ و چاویان ڕەش دەکردن. مام عەوڵا سەرتاش بوو تورێکی لە مل دەکرد کە کەلوپەلەکانی سەرتاشی لەناو هەڵدەگرتن و دەگەرا، بە زۆری لەسەر جۆگەلەی مزگەوت سەری دەتاشین. مام عەوڵا دوو جۆر گوێزانی هەبوون و پرسیاری دەکرد بەکامەت بۆ بتاشم. یەکیان زۆر تیژ بوو و بە عانەیێك بوو، ئەوی تریش بە دوو فلس بوو. هەسانێکیشی پێ بوو هەر زوو زوو گوێزانەکانی تیژ دەکردنەوە.

## دارتاشی

حاجی مستەفا و حەسۆی حاجی سلێمانی باشترین دارتاشی شارەکەبوون. نیر و نامور و هەموو پێداویستیەکانی جووت وگا لە لایەن ئەو دوو کەسانە دروستدەکران. هەروەها پێداویستیەکانی کەلوپەلی جوتیاری وەك ئەسپەرە دەسکی بێڵ، قازمە، پێمەڕە... زیاتر لەلای ئەو دوو کەسە دروستدەکران. بۆ دروستکردنی دەرگا، پەنجەرە، دۆریخی دەرگا، کلیلی دار، بەفرماڵ، دەسکی باگوردان، تراشینی ئەستوندەکە، داری ڕایەلی خانو...هەر ئەوان بوون. کاتێك حکومەت پێویستی بە دروستکردنی حەوشێکی گەورە بوو بۆ تەوێلەی وڵاغەکانی پۆلیس و سەرباز لە پشت قشڵە، داوایان لە حاجی مستەفا کرد ئەو کارەیان بۆ بکا. شوارەکانی ئەو حەوشە زۆر ئەستور بوون وە بە ئاسانی نەدەچەماتەوە و حەوشەکەش زۆر بەرز بوو. حاجی مستەفا زۆر دەست ڕەنگین بوو و حەسۆی حاجی سلێمانیش زۆر قسە خۆش بوو، خەڵك حەزی دەکرد کاری بکەوێتە لایان. ئەحمەدی کوڕی حاجی مستەفا زۆر شارەزا بوو لەم کارە، بەڵام بەهۆی پێشمەرگایەتی وازی لەم کارە هێنا.

زۆرجار حاجی مستەفا بەبێ بەرامبەر کاری دەکرد یان پارەیەکی کەمی وەردەگرت. خۆی دەروێشی تەکیەی ماڵی کاکی هیران بوو. ئەو کاتانەی بە

مەبەستی سەردانی مەزارگاکانی هیران بکەوتبا ڕێ، کەلوپەلی دارتاشی وەك تەپشو و مکارە... لەگەڵ خۆ دەبردن و پێداویستی جوتیارانی ئەو گوندانەی دەکەوتنە سەرڕێی هەموو جێبەجێ دەکردن.

دارتاشێکی هەولێری بۆ کارکردن لە دیوەخانی ماڵی میر هاتە شەقڵاوە و کوڕێکی هەبوو ناوی یاسین. کوڕەکەی زۆر شارەزا بوو وە زۆربەی کانتۆری ماڵان و سندووق لەسەر دەستی ئەم وەستایە دروستکران. کابرایەکی زۆر دەست ڕەنگین بوو وە نەخش و نیگاری زۆر جوانی لەسەر کانتۆرەکان دروستدەکردن. مێزێك و چوار کورسیشی لە ساڵی ١٩٥٥ بۆ من دروستکردن و تا هاتم بۆ ئەمریکا لە ساڵی ١٩٩٦ بەرگەیانگرت و بۆ یادگاری هەڵمگرتبوون.

## سەفارچی

ئەوکات بەشێك لە کەلوپەلەکانی ناو ماڵ لە کانزای سفر دروستدەکران و هێشتا فافۆن پەیدانەببوو. قاپ و قاچاغیش هەر لە موسڵ دەهاتن بۆ ناوچەکە. دواتریش وەستا محەمەد و وەستا ساڵح سەفارچی کە برا بوون، سفریان لە موسڵ دەهێنا و خۆیان شتیان دروستدەکرد. ئەو دوو برایە، کەسانی زۆر دەست ڕەنگین بوون لەو بوارەدا. مەنجەڵ، دەسمەنجەڵ، مەسینە، دەست شۆر، بادی، سنی، گومگومە، مەنجەڵی کۆرکردن، بەشێك بوون لەو شتانەی کە بەدەستی ئەوان دروستدەکران. مەنجەڵەکان سەرپۆشیان نەبوو، بەڵکو دەرخونەیەکی لە داریان بۆ دروستدەکردن. کەلوپەلی سفر زوو زوو جۆرە کەڕوو (بەکتریا)یەکی ژەهراوی ڕەنگ شینی دەگرت و دەبوایە لە هەموو پایز و بەهاران خاوێن بکرێنەوە. وەستاکانی ناوچەکە و هەندێك جاریش خەڵك لە هەولێر دەهاتن و بە گوند و شارە بچوکەکان دەگەڕان و کاری سەفارچیەتیان دەکرد. دەبوایە قۆرتێك بەگوێرەی مەنجەڵەکە، تەشتەکە... لێبدەن و زیخی ووردی تێ بەکەن و مەنجەڵەکەی تێ بگرن. ئینجا هەندێك زیخ و نۆشاتر و دەرمانێکی تریش دەناو مەنجەڵەکە دەکران و پارچە بوزیەکیان دەخستە ناوی. وەستاکە بە هەردوو پێیان دەچووە ناو مەنجەڵەکە و خۆیان بەولا و بەولا دەسوڕاند هەتا جوان پاك دەبووەوە. پاشان بە کورەی ئاگر زۆر گەرم دەکرا و دەرمانێکی سپیکردنەوەی بە بوزیەك لێدەدرا، ئینجا هەموو پاشماوەی بەکتریایەکە لەناو دەچوو و ڕەنگی جوان دەبووەوە. ئەم بەکتریایە کاریگەریەکی زۆر نێگەتیڤی لەسەر تەندروستی مرۆڤ هەبوو. هەربۆیە دوای پەیدابوونی فافۆن، کەلوپەلی سفر کۆتاییان پێ هات و بازاڕی ئەو وەستایانەش نەما.

## زێرنگەری

جاران وەستا عەولای موسلی دوکانی زێرنگەری هەبوو، دواتریش وەستا حەمەد عەلی چەکوچی کوڕی بەردەوام بوو لەسەر پیشەکەی باوکی. وەستا حەمەد عەلی شتی زۆر جوانی دروستدەکردن وەك: خەناوکە، بسکۆکە، تاس، بازن، دوگمە... لەبەر دەستکردە جوانەکەی، خەڵك لە ناوچەکانی دەوروبەریش دەهاتنە لای ئەو.

## بەننایی

شێخ محەمەد وسو کامەلا، وەستا حەننا، مستەفا وەسمانە ڕەش، برایم ڕەشید جەردە و سەید ئەحمەد بەننای چاك بوون، بەڵام سەید تالب بەننایەکی کارامە بوو و وەك ئەندازیاری ئەو سەردەم بوو. قوتابخانەی کاوێس کە هەتا ڕووخانی سەدام لە ساڵی ٢٠٠٣ بە شاکاری بیناسازی لە شەقڵاوە دادەنرا، لەسەر دەستی سەید تالیب دروستکرا بوو.

## باگوردان و جۆنی

برایم بنعارد کابرایەکی زۆر وەستا بوو لە بەرد شکاندن. ئەو پیاوە شارەزاییەکی تەواوی هەبوو لە دۆزینەوەی کارگە بەردەکانیش. سەرەتا شوێنەکەی خاوێن دەکردەوە و ئینجا بە باریە و ماوەر دەستی بە بەردشکاندن دەکرد. ئەگەر بەردەکان بۆ جۆنی و دەسکە جۆنی یان باگوردان دەستیان بدابا، ئەوانەی لێ دروستدەکردن، ئەگینا بۆ بەردی خانوو دەیشکاندن. بەردی جۆنی و باگوردان دەبوایە زۆر گەورەبن و مام برایم زۆر بە ووردی ئەو بەردانەی چاك دەکردن و لێی دروستدەکردن. چونکە ئەم بەردانە زۆر قورس بوون، دەبوایە بیانخەنە ناو گونیە، ئینجا بەردکێش لەسەر ووڵاغ دابنێن و ووڵاغەکە ببەنە بن کەندەرانێ و گونیەکە بخزێننە ناو لایەکی بەردکێشەکە. دەبوایە بەردێکی تریش بە هەمان قورسایی بخەنە لایەکەی تری بەردکێشەکە هەتا بارەکە لاسەنگ نەبێ. باگوردان و جۆنی دوو کەلوپەلی زۆر پێویستی ئەو سەردەم بوون و خەڵك لە شوێنی تریش بۆ کڕینیان دەهاتنە لای مام برایم. دوای مام برایم، وەستا سەدیقی کوڕی تا ماوەیێکی زۆر بەردەوامی بەکارەکانی باوکیدا و لەزۆر لایەنیتریش پەرەی بە کارەکاندا.

## خەڕات (تۆڕنەی دار تاشین)

لە شەقلاوە چەند بنەماڵەیەك كاری خەڕات گێرانیان دەكرد، ئەمانە بە بنەماڵەی دۆمەكان ناوزەد دەكران. هەرچەندە لە بنەچەدا دۆم نەبوون، بەڵام چونكە كاری ئەوانیان دەكرد، پێیان دەگوتن دۆم. حاجی برایمە دۆم و مستەفا وەسمانە ڕەش زۆر دەست ڕەنگین بوون لە دروستكردنی كۆتك، تەبەقە شەكر، كەوچكی دار، جۆنی دار، كوتكی ساوار كوتانەوە، كۆلی دۆشاو و سركە، كاسە، تەبەقەی نان، خوانەی نانكردن... حاجی برایم مەكینەی خەڕاتی چاكی هەبوو وە بەرهەمەكانی جوان و پوختە بوون و خەڵكێكی زۆر ئەم بەرهەمانەی لەو دەكڕین.

زۆر جار ئەركی گرانی خەڕاتگێران لە ئەستۆی ژنان بوو و بە چوار كەس خەڕاتەكەیان بەگەڕدەخست. بە جۆرێك كە دووانیان لە لایەك قایشێكیان ڕادەكێشا، یەكێكیش لە لایەكەی تر قایشەكەی بۆ ئاودیو دەكردنەوە. قایشەكە دارێكی دەسوڕاند كە لەسەر دوو داری دولك داندرابوو، ئەویش دەبووە هۆی سوڕاندنی دارێكی تر كە بەرهەمەكەی لێ دروستدەكرا. وەستای خەڕاتیش دارێكی بە دەستەوە بوو كە نووكێكی تیژی لە ئاسن دروستكراوی بەسەرەكەوە بوو پێیان دەگوت "لێسكە". وەستا لەسەر دارەكە كاری دەكرد و وورده وورده لەگەڵ سوڕانی قایشەكە و دارەكە لێسكەكەی دەدایەبەر و كەم كەم دەیتاشی و بەپێی ویستی خۆی ئەو پێداویستیەی دەیویست دروستی دەكرد.

## جل و بەرگ

ئەو قوماشانەی كە بۆ جل و بەرگ و پێداویستیەكانی ماڵ بەكاردەهاتن، بەشێكی دەستكردی خۆماڵی بوون. بۆ نموونە كر و زۆر شتی تر هەبوون كە بە جۆلا دروستدەكران. جۆلا لە زۆر شوێن هێشتا باوی ماوە و لە زۆر پەڕتوك و نوسراوی تر ئاماژەی پێكراوە، بۆیە لێرە نامەوێت بە درێژی باسی لێ بكەم. زۆربەی ئەو بنەماڵانەی لە شەقلاوە كاری جۆلاییان دەكرد، لە مەسیحیەكان بوون. هەندێك لەو بنەماڵانە تاكو١٠ تا ١٥ ساڵ بەر لە ئەمڕۆش لەسەر كارەكانیان بەردەوام بوون، بەڵام بە داخەوە ئەم پیشەیەش وەك زۆربەی پیشەكانی تری دەستكرد بەهۆی پێشكەوتنی تەكنەلۆژیا بەرەو نەمان چوون. بەداخەوە ئەوەی من بزانم ئێستا هیچ بنەماڵەیەك لە شەقلاوە ئەماوە كاری جۆلایی بكات.



جۆلا

جل و بەرگە خۆماڵیەکانی پیاوان بەزۆری ڕانك و چۆغەڵی کر و کورتەکی لۆکەبوون. مەسیحیەکان مەرەزیان دەکڕی و بە ژنە مەسیحی و موسڵمانەکانیان دەڕست. هەریەك کیلۆی مەرەز بە دوو یان سێ عانە بە تەشی دەڕسترا. ئینجا ئەم ڕیسە ڕایەڵ دەکرا و پاشان بە جۆلا دەکرا بە ڕانك و چۆغەڵ. دوو جۆر ڕانك و چۆغەڵیش هەبوون، جۆرێکیان زۆر تایبەت بوو و لە مەرەزی زۆر باریك و جوان ڕستراو و چڕ دروستکرابوو. ئەم جۆرەیان بە دوورینەوە بە پێنج درهەم بوو کە دەیکردە یەك روبعە دینار. بە جۆرەکەی تریان دەووت رایەجی کە داوەکەی درشت تر بوو، ئەمەیان بە سێ درهەم بوو ئینجا بە زۆرکەسیش نەدەکڕا. ئەوکات ڕۆژانەی کرێکار بە یەك درهەم بوو کە یەك قەندە شەکر لەگەڵ یەك شقارتەی پێ دەهات.

پیشەی زۆرینەی جووەکان خم (رەنگ)کردنی کر و قوماش و لۆکە و جل و بەرگ و خوری بوو، ڕەنگەکانیش بەزۆری خۆماڵی بوون وە لە گیا دروستدەکران. بۆ نمونە ڕەنگی زەرد لە سەندەر و ڕەنگی سوریش لە رووناس دروستدەکران. دواتر دەرمان و ڕەنگی کیمیاوی پەیدا بوون و ئیتر هەر ئەوان بەکاردەهاتن.

بۆ جلی ژنانیش، لە ساڵانی سیەکان لۆکەیان دەکردە کراسی جانگ و ناوەڕێس. بۆ دروستکردنی ناوەڕێس لۆکەیان لە چڕك دەدا. کابرایەکی بەتەمەن هەبوو ناوی مینۆی شاقوڵی بوو و کاتی خۆی سەربازی تورك بوو. مینۆی شاقوڵی پیاوەکی سور و سپی و بەژن باریك و دەم و چاو ووردی سمێڵ باریك بوو، دەزگایەکی چڕکی هێنابووە شەقڵاوە کە لۆکەی لە دەنکەکەی جیادەکردەوە. پێشتریش لۆکەکە لە قوزاغ (گوڵی لۆکە) جیاکرابووەوە. چڕك بریتی بوو لە سەندوقێك کە دارێکی خڕی لەناو بوو وە نووکی ئاسنی پێوەبوون. دەسکێکی پێوەبوو لە شێوەی پەیدان و هەرجارەکی بتسوڕاندبا، دارەکەی پێنج تا شەش جار دەسوڕاند. لۆکەی دەدرایەبەر و دەنکەکان دەکەوتنە لایەك و لۆکەکەش دەکەوتە لایەکی تر. ڕێوە ڕێوە و بە بەردەوامی وەستا مینۆ بە دەستێکی

دەیسوڕاند و بەدەستەکەی تریش لۆکەی دەدایەبەر. دواتر لۆکەکە بە خەرەك دەرێسرا کە ئەویش دەزگایەکی تر بوو وە لە دار دروستکرابوو، بە هەمان شێوەی چرك دەسوڕا، بەڵام ئەو دەزگایە زۆر بوو و تەنانەت هەندێك کەس لە ماڵی خۆی هەیبوو. دواتریش ڕیسەکە بە جۆڵا دەکرا بە قوماش. لۆکە بۆ زۆر شتی تر سوودی لێ وەردەگیرا وەك دروستکردنی دۆشەك و بالیف... دەبوایە ناوەش لۆکەکانت دەرهێنابان و پەڕمبکرابانەوە، ئەگینا لۆکەکە دەنوسا و رەق دەبوو، خەڵکیش هەبوو لە ماڵان دەگەڕان و کاری پەڕەیان دەکرد.


دەزگای چرك

جاجم و پەشمین و بەرماڵ و خرار و تێرك بە جۆڵای دروستدەکران. بەڕە مافوریش بەتەون دروستدەکرا، هەروەها خەڵکیش هەبوو لبادی دروستدەکرد. زۆر شتیش لە شارەکانی تری کوردستان یان لە سوریا و ئێران و تورکیا دەهێنران. ئەحمەدی زەخێ یەکەم کەس بوو کە مەکینەی دورمانی هێنایە شەقڵاوە و جل و بەرگی بۆ خەڵك دەدورین، چونکە پێشتر هەر بە دەست دورمان دەکرا. ئەحمەد پیاوێکی درێژ و بەژنێکی باریکی جوانی هەبوو و لە پیشەکەی خۆیدا زۆر بە توانا بوو. وەستا عەولای برای کورتاندرو بوو و کاسبیەکی چاکی هەبوو. هەموو خەڵکی ناوچەکە دەهاتنە لای ئەو و بازاڕێکی زۆر بە هەرمێنی هەبوو. عەلی مەعروفیش کە خەڵکی کۆیە بوو، دوکانی بەرگدروی کردەوە و مەکینەیەکیشی لە ماڵەوە هەبوو و کورتەکی بە لۆکەی دروستدەکردن، کە بە زستان هەرمێنی لەسەر بوو.

## بەرهەماکانی شوو (شوارك)

زۆر لە پێداویستی ماڵەوە لە شووی داری بی و بلاروك و قەرەقاج دروستدەکران، شواشینك و مورتکیش بۆ نەقش و جوانی دەخرانە ناوی. هەندێك لەو بەرهەمانە بریتی بوون لە: سەلە، پێتەرازوو، تریان، قەرتارە، سەوی، سەوەشیر... ئەوانە لە کاتی منداڵی من بە یەك تا چوار عانە بوون. ماڵی خاڵەکانم، حاجی عەزیز و بەکر و مەحمود لە هەموو کەس تۆکمەتر و

جوانتر ئەوشتانەیان دروستدەکردن. بەرهەمەکانیان نەك هەر لە ناوچەکە هەرمێنی لەسەر بوو، بەڵکو بۆ شارەکانی تریش بە کۆمەڵ دەبردران. بۆ ماوەیەکی زۆریش کوڕەکانیان بەردەوامیان بە کارەکاندا، بەڵام دوای پەیدابونی فافۆن و پلاستیك، بەرهەمەکانی ئەوان ڕەواجی لەسەر نەما.

## قەسابی

لەبەر نەبوونی ئامێری ساردکەرەوە و بەستەرەکان، هەبوونی قەساب ئەوکات زۆر پێویست بوو. من لەبیرم نایێ، بەڵام دەیانگێڕایەوە کە لە کۆن ئەحمەدی هۆری قەساب بووە. دواتر سەعید قەساب پیشەی قەسابی دەکرد، کە لە بنەڕەتدا خەڵکی شاری کۆیە بوو و هاتبوە شەقڵاوە. سەعید قەساب لەگەڵ باوکم هاوڕێ بوو و پیاوێکی زۆر دڵخۆش بوو و هەر بۆیە بەردەوام لەگەڵ عەلی فلەیحی شاری هەولێر، هاوسەفەری کاوێس ئاغا بوون لە کاتی سەفەرەکانی بۆ تۆمارکردنی قەوانەکان. دەنگە خۆشەکەی سەعیەد قەسەب، لە هەندێك لە قەوانەکانی کاوێس ماوە. لەدوای خۆشی کوڕەکان و نەوەکانی هەر بەردوام بوون لەسەر پیشەی قەسابی. هەر ئەو هەستەی سەعید قەسابە بوو کە حەمید قاسابی کوڕی هاندا لە تەمەنێکی گەورە هەوڵی فێربوونی مۆسیقا بدا لە دوای ژیانی پێشمەرگایەتی. من لەو باوەڕەدام کە کەم کەس هەبێ پیشەی قەسابی بێ و لەتەمەنێکی باڵادا ببێ بە یەکێك لە میوزیکژەنە هەڵکەوتوەکان. شایانی باسە کاتێك کە هونەرمەند حەسەن زیرەك لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوو سەردانی شەقڵاوەی کرد، میوانی حەمەی کوڕی سەعید قەساب بوو.

ئەو خەڵکانەی کە ڕەز و باغیان نەبوو و لە کارکردن خاوەنی بەهرەیەکی تایبەت نەبوون، دەبوایە کاروان بۆ خەڵکی یانیش کرێکاریان بکردبا. لە کاتی منداڵی من ڕۆژانەی کرێکار بەچل فلس بوو. لەبیرمە تازە ماوەیەکی کەم بوو پارە گۆڕدرابوو بۆ دینار و فلس، باوکیشم کۆسپیندارێکی دەچاند، بەڵام کرێکاری دەست نەدەکەوتن. ناچار لە مزگەوت و لە دوای نوێژ بانگی ڕاهێڵا و ووتی بەیانی من کرێکاری دەکەمە دەرهەمێك و شەکر و چاشی ئەدەمێ تاکو چا لۆخۆی لێبنێ. بۆ بەیانی هەژدە کەسی بۆ هاتنە ئێش و دوای ئەو ڕۆژە کارکردن بۆهەموو کەسێك بوو بە یەك دەرهەم کە دەیکرد پەنجا فلس.

چەند دوکانێکیش لە نزیك مزگەوتی گەورە هەبوون. سەعید بەقاڵ یەکێك بوو لە دوکاندارەکان کە بە بنەچە خەڵکی سنەی کوردستانی ڕۆژهەڵات بوو. بەهاران باغەکانی شەقڵاوە پڕ دەبوون لە وەنەوشە و مام سەعیدیش ئەو

گوڵانەی بە کۆمەڵ دەکڕین. لەبیرمە زۆر لە نێمەی منداڵان دەسك دەسك دەمانچنین و دەمانبردن بۆ دوکانی ئەو، ئەویش لێیدەکڕین و ووشکی دەکردنەوە. دواتر دەیبردن بۆ بەغدا و بە جووەکانی دەفرۆشت. چەنگی بە عانەیەکی لێ دەکڕین، جاریش هەبوو پێنج فلس و دوو یان سێ دەنك قەسپی دەداینێ. وەنەوشە بە ووشك کراوی دەخرایە ناو چا و تامی چایەکەی زۆر خۆش دەکرد. مام سەعید پیاوێکی زۆر دڵ گەورە بوو و هەر کەسێکیش مردبایە، ئەو یەکەم کەس بۆ گۆڕ هەڵکەندن بە کەلوپەلەوە دەگەیشتە گۆڕستان.

# کاروان

کە جەنگی جیهانی دووەم لە ساڵی ١٩٣٩ دەستی پێکرد، مرۆڤایەتی بە گشتی لە ڕووی بژێوی ژیان، دوچاری تێکچوونی باری گوزەران بوو، بە تایبەتی کوردستان، کە وڵاتێکی بێ کارگە و دوور لە دەریا بوو. ووشکە ساڵیش سەربار و بنبار. ئەو ساڵ دەشتی هەولێریش هیچی لێ شین نەبوو. زۆربەی خەڵکی ئەوەی هەیانبوو خواردیان. ئێمەش باری ئابووریمان ڕۆژ دوای ڕۆژ بەرەو خراپی دەچوو و دوای تەواوبوونی ئەو گەنمەی کە هەمانبوو، دەستمان کرد بە خواردنی نانی جۆ و خەریك بوو ئەویش بەرەوە تەواو بوون دەچوو. ئەوەی جێگەی ئومێدی ئێمە بوو، بۆ ساڵی دواتر بارانێکی باش باری و لە کوردستان گەنم هاتی بوو.

سەرەڕای بچوکی تەمەنم، باوکم پێی گوتم دەبێ چارەیەك بکەی و بچی بۆ کاروان و پێویستە هەندێك گەنم پەیدابکەی. لە ڕەزی قەشان تایەك تریی سپی و لەناو باغەکەشمان تایەك خۆخم داگرت. باوکم پێی گووتم لە هەر شوێنێك کریار هەبوو بیفرۆشە و تەنەکەیەك گەنمی پێ بکڕە.، بە تایبەتی لە کۆڕێ و بەنی پیرمەم کە دوو سەربازگەی لێ بوون و ئەگەر لەوێ نەفرۆشرا بیبە بۆ هەولێر. دەرهەمێك و چەند ئانێکم لەگەڵ خۆمبرد و ووڵاغەکەم دایە پێشخۆم. چونکە زۆربەی کاروانچیەکان دەچوون بۆ هەولێر، لە ڕێگا بڕیارمدا نەچمە ئەوێ و تا دەشتی هەولێر نەوەستم، بەڵکو بە گەنمی زیاتر ئاڵوگۆڕی پێبکەم، لەبەر ئەوەی تازە خەرمانی گەنم و جۆ کۆکرابوونەوە.

ڕێگای گوندی باقرتە و کەسنەزانم گرتە بەر و لەوێ میوەکەم بە شەش تەنەکە گەنم گۆڕیەوە! ماڵە خانەخوێیەکەش خەڵکی باشبوون و داوام لێکردن گەنمەکەم بۆ چاکبکەن. لە گەڕانەوەدا لە کۆڕێ ئاشێکی لێبوو و گەنمەکەم لە ئاش کرد و کردم بە ئارد. بەرەو شەقلاوە گەڕامەوە کە باوکم ئەو هەموو ئاردەی بینی، توند لە باوەشی گرتم و زۆر ماچی کردم.

بەر لەو کاروانە یەك دوو کاروانی تریشم کردبوون، بەڵام ئەوە یەکەم کاروانم بوو بۆ دەشتی هەولێر دواتریش دوو جار کاروانی موسڵم کرد، پایزان هەرمێیەکی زۆرمان هەبوون و لەوێ باش دەفرۆشان. کاتێك قات وقڕی لە ساڵی ١٩٣٩ پەیدا بوو وە ماوەی ١٢ مانگ هیچ باران نەباری. لەبیرمە مەڕدارەکان هاتنە ناوچەی ئێمە و بەرخ و کاوڕ و مەڕ زۆر هەرزان ببوون وە باوکم کۆمەڵێکی کڕین بۆ قەلیەی زستان. خەڵك بەناچاری دەچووە کوێستان بۆ

گەنم کڕین. لەوێ زۆر شت دەست دەکەوت، کەچی لە عێراق هیچ شتێك چنگ نەدەکەوت. ئەگەر پارەشت هەبوایە دەغڵ و دان نەبوو بیکڕی.

پێش کاروانەکەی هەولێر و هەر لە ساڵی ۱۹۳۹، کاروانێکی کوێستانم کرد بۆ شاری نەغەدەی کوردستانی ڕۆژهەڵات. ئێمە دە تا دووازدە کەس دەبووین، یەکێك لەوانەی هاوڕێی من بوو لەو کاروانە، مەلا ئەحمەدی حاجی برایم بوو. کە گەیشتینە نەغەدە، ئەو شارە ئازاد بوو وە کوردایەتی لەوێ دەستی پێکردبوو. هەروەها، دەرچوو حاکمی شار مەلایە و کاتی خۆی لەگەڵ مەلا ئەحمەد بەیەکەوە فەقێ بوون. یەکێك لە پاساوەنەکانی شار هات و داوای سەرانەی لە ئێمەکرد. گوایە ئەگەر ئەوان نەیان پاراستباین، ئەوا ڕێگر ڕووتیان دەکردینەوە و بە سەلامەتی نەدەگەیشتینە شار. مەلا ئەحمەدیش خۆی گەیاندە لای حاکم و شکایەتی کرد. حاکم خۆی هات و بە بەرچاوی ئێمە چەند شەقێکی لە پاسەوانەکە هەڵدا!



قەتاری کاروانچیان

لە کاروانی نەغەدە، من مێردمنداڵە بووم وە بەتەمەن لە هەموویان گچکەتر بووم. لە نەغەدە گەنمم کڕی و گەڕامەوە، بەڵام لەبەر کەم شارەزایی من لە کاروان کردن، گەنمەکە زۆر بە نرخێکی گران لەسەر من وەستا و زەرەرم پتربوو لە قازانج، ماندووبوونیش سەربار و بنبار. لەکاتی گەڕانەوەماندا، بینیم هەریەك لە هاوڕێکانم بەشی یەك کارەك چەرمی گامێشیان کڕیبوو، هەرچەندە لە شار دەرچووبوین بەڵام ساڵحە لار (لاڵ) لەگەڵم گەڕایەوە و شوێنی چەرم کڕینەکەی پیشاندام. منیش بەشی یەك کارەك چەرمم کڕی و هێنام بە وەستا حاجی ڕەشیدم کرد بە کارەك و ماوەیێکی زۆر بەرگەی گرت.

لە شەقڵاوە چەند کەسێك هەبوون کە کار و پیشەیان تەنیا کاروان کردن بوو و هاموشۆی نێوان ئێران و موسڵیان دەکرد. بۆ نمونە لە بەهار بۆ ئێران

دەچوون و لە نەغەدە پێستە گامێشیان دەکڕین و دەیانبردن بۆ موسڵ. لە پایزیش بۆ گرتك و ڕوست لە بناری حەساڕۆست دەچوون و هەرمێ و سێوێکی یەکجار زۆریان دەهێنا و دەیان برد بۆ موسڵ. هەنگوینیشیان هەر لە ناوچەی باڵەکایەتی دەکڕی و لە موسڵ دەیانفرۆشتەوە. حاجی برایم، ناسراوبوو بە حاجی برایمە دۆم و خاوەنی مزگەوتی حاجی برایم بوو لە دامێنی قشڵە. پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، جگە لەوەی خۆی کاروانیدەکرد، قەتارچی (کاروانچی)شی هەبوون. ئەو کات هەر کەسێك خاوەنی چەندین ووڵاغ بووایە، قەتارچی بەکرێ دەگرتن و کاروانی پێدەکردن. قەتارچیەکان هەر شەش مانگ جارێك دەستە جلێکیان لەلایەن خاوەن ووڵاغەکان بۆ دابیندەکرا، بەڵام پێڵاو بەپێی پێویست بوو، چونکە ڕۆیشتنەکە هەر بە پێ دەکرا. لە ترسی ڕێگرەکانیش، کاروانچیەکان بە کۆمەڵ کاروانیان دەکرد. زۆربەی کاروانچیەکان خەڵکی نەداربوون و پارەیان بە قەرد وەردەگرت. کە من منداڵ بووم، باوکم زۆر هاوکاری خەڵکی دەکرد، بە تایبەتی کە کەسێکی هەژار ووڵاغەکەی لە دەست بدابا و پارەی بە قەرز و بەبێ بەرامبەر پێدەدا بۆ کڕینەوەی.

قادر عەمەربەگ برادەری باوکم بوو و لە کەرکوك نەوتی دەهێنا، زۆرجار باوکم ڕایدەسپارد کە حەڵوا و نارنج و خورمای بۆ بهێنێ. باوکم زۆر بە خۆشی دەژیا و حەزی لە خواردن بوو. ئەو جووانەی کاری خمکردنیان دەکرد، خمەکەیان لە موسڵ بۆ دەهات و لەناو قوتویەکی مەحکەم دابوون. ماڵە جوویەکمان جیران بوو کە قوتوی خم بەتاڵ دەبوو دەیدا بە باوکم. باوکیشم پایزان چەند قوتویەکی زۆر جوان دەشوشتن و دەیدان بە ڕەزاقی کاروانچی تا لە ڕوستێ هەنگوینی بۆ بێنێ و یەکێ لە قوتوە هەنگوینەکانی ساڵانە پێشکەش بە کاوێس ئاغا دەکرد.

لە چلەکان جارێك لەگەڵ وسو ڕەحمانی حەمەی، سێو و گەرازمان بەکاروان دەبردن بۆ دەشت. دەمان ویست بچینە حاجی کەندی بندیانان، لە مەخمور تێپەڕین، کابرایەك بە سواری ماین بەغار بەرەو ئێمەدەهات. ووتی مام خۆشناوینە دەی خوابکا سێو و گەرازتان پێبێ، ووتمان بەڵێ. زۆر دڵی خۆش بوو ووتی، قوربانتان بم من وادەچمە مەخمور ئۆتۆمبێلێکی ڕابسپێرم کە لە هەولێر ئەوانەمان بۆ بێنێ، هەموو گوندەکەمان بەگرانەتا کەوتوە و پێویستیمان بە ترشیە. کە گەیشتینە گوند، کوێخا پێشوازیکردین و ووتی مام خۆشناوینە وابکەن بەرهەموو خەڵکەکە بکەوێ، بەخۆی لەگەڵمان ڕاوەستا تا هەموومان دابەشکرد. گەنمەکی زۆر و جوانیان لەجیاتی داینەوە. کوردەواری دەڵێ "کاروان هێلانە کەوە" بەمانای ئەگەر دۆزیتەوە ئەوا ڕەنج بەخەسار نابیت. زۆر جار هەبوو چەند گوند دەگەڕاین و هیچمان بۆ نەدەفرۆشا. هەندێك

جاریش کاروانی بادینانمان دەکرد و ترێمان بە چەڵتوك دەگۆڕیەوە. بە درێژی چەندین ساڵ لە سەری پایز تا بەهاران هەفتەی دوو کاروانی هەولێرم دەکرد. هەرجارە و شەش هەزار گوێزم دەبردن و لەوێ بە نزیکەی بیست وچوار دەرهەم دەمفرۆشتن.

زۆر جار کە دەچووم بۆ کاروانی هەولێر، سەردانی کابرایەکم دەکرد کە بازرگانێکی زۆر زیرەك بوو، پێموابێ جوو بوو، ناویشی نەسیم بەغدایی بوو. هەموو کات دەیان موشتەری لەبەر دووکان بوون و ڕۆژ هەبوو سەد فەردە شەکری قەندی دەفرۆشت. ئەوکات شەکری وورد نەبوو، تەنها شەکری قەندی هۆڵەندی هەبوو. یەك فەردە ٣٦ قەندی تێدابوو و لە ناو پوش بە پەتێك جوان پێچرابوو. نەسیم بەغدایی لەهەر قەندێك یەك فلسی قازانج دەکرد، بەڵام موشتەری گەلێك زۆر بوون. لێم پرسی، چۆن قازانج دەکەی کە ئەوها بەهەرزان دەیفرۆشی؟ وەڵامەکەی نەسیم بۆمن دەرسێك بوو، گووتی "جگە لە فلسەکە، من هەموو ڕۆژێك سەد گوش و کندرم بۆ دەمێنێتەوە و هەریەکەی بە نیو درهەم دەیانفرۆشم... بۆخۆشت لێکیدەوە"! دوکانەکەی تەنیشت ئەو، ڕۆژی تەنها پێنج قەندی دەفرۆشت، کە لە هەر قەندێك تەنها نیو درهەمی قازانج دەکرد.



قەڵاتی هەولێر لە سەرەتای ساڵانی ١٩٣٠

# ئینگلیز و هێنانی ڕادیۆ و سینەما

بەر لەوەی حکومەتی ئینگلیز هەر سێ ویلایەتەکانی بەسرە و بەغدا و موسڵ لە ساڵی ١٩١٨ داگیربکا، دیارە بەرنامەیەکی تۆکمە و مەحکەمی بۆ ئەو داگیرکردنە پتر لە سەد ساڵ بەر لەو ڕۆژە داڕشتبوو. کاتێك کە ئینگلیز وڵاتی هیندستانی داگیرکرد، تاکە ڕێگە لە نێوان ئەو دوو دەوڵەتە ڕێگای ئاوی دوورو درێژی سوڕانەوە بە دەوری کیشوەری ئەفریقیا بوو. ئەو ڕێگایەش پتر لە هەشت مانگی دەبرد، هەتا پاپۆڕێك دەیتوانی پۆستەی یەك لا بگەیێنێتە لایەکەی تر. بۆیە ئینگلیز بیریان لە ڕێگایەکی نوێ و بەکارهێنانی بەشێك لە عێراقی ئەمڕۆ کردبووەوە. لە ناوەڕاستی ساڵانی ١٧٠٠ەکاندا، دەستیان کردبوو بە هێنانی پۆستەکەیان بۆ شاری فاو و لەوێش بەسواری ووشتر و بەتەنیشت ڕووباری فوراتدا سەریاندەخست و هەندێك جار دەیان گەیاندە دەریای سپی ناوەڕاست و لەوێش بە پاپۆڕ دەیان گەیاندە ئینگلستان. هەندێك جاری تریش، هەر بە کاروان دەیان گەیاندە ئینگلستان. ئەو ڕێگا نوێیەش، ڕێگا دەریاییە دووره هەشت مانگیەی باشوری ئەفریقیای بۆ سێ مانگ کورت دەکردەوە.

هەروەها ئینگلیز بۆی دەرکەوتبوو کە ویلایەتەکانی بەسرە و بەغدا، خاکێکی زۆر بە پیت و بەرەکەتیان هەیە و لە نێو خۆیاندا ووتویانە کە ئەگەر ئەو دوو ویلایەتە داگیربکەن، ئیمپراتۆریەتی ئینگلیز قەت جارێکی دی پەکی ناکەوێ و برسی نابێ. ئینگلیز گەیشتبوونە ئەو ڕاستیەش کە خەڵکی عێراقی ئەمڕۆ زۆر سەرسەختن و ئەوان ناتوانن بە ئاسانی کۆنترۆڵیان بکەن. هەربۆیە، بەرنامەیان وابوە خەڵکی خۆیان لە هیندستان بێنن و لەوێ نیشتەجێیان بکەن، هەتا کشتوکاڵ لەسەر ئاستێکی فراوان تر بەرهەم بێنن. دروستکردنی بەنداوی هیندیە و دابەشکردنی ڕووباری فوڕات بە دووبەش لەوێ، بەشێك بوە لەو بەرنامەیە و بەنداوەکەش بە ناوی ئەو کابرا هیندیە کراوە کە ئینگلیز لەوێ نیشتەجێیان کردوە و کشتوکاڵێکی یەکجار زۆری چاندوە. هەروەها ئەخشەی خوارووی عێراقی ئەمڕۆ و بەرتەسککردنەوەی ڕووبەرە ئاویەکەی و دورستکردنی دەوڵەتی کومیت، هەر بۆ کۆنترۆڵکردن بووە. ئینگلیزەکان لە نێوان خۆیاندا ووتویانە کە ئەو وڵاتە وەك شوشەیێکی پڕ شەڕاب لێ دەکەن و هەرچەند سەرەکەی تەسکتر بکەن، ئاسانتر بە یەك تەپەدۆری بچوك کۆنترۆڵ دەکرێ.

بەر لە داگیرکردنی ویلایەتەکانی بەسرا و بەغداش، ئینگلیز تەماعی زیاتری لەلا دورست بووە و پاش ئەوەی زانیویانە ئەوتێکی زۆر لەو ویلایەتە هەیە، بەرنامەی داگیرکردنی ویلایەتی کورد نیشینی موسڵیشی داڕشتوە. پاشان

کوردیشیان ڕازی کردوە کە دەنگ بە لکاندنی ئەو ویلایەتە بە عێراق بدا. ئینگلیز بەرنامەیان وابوە ڕاستەوخۆ حوکمی عێراق بکەن، بەڵام دوای ماوەیەك تێگەیشتن کە ئەم کارەیان بۆ ناچێتە سەر. ئینجا حکومەتێکی بە زۆر سەپاندراویان لەو دەوڵەتە نوێیە دورست کرد و فەیسەلیان لە عەرەبستان وەك تاکە کەس هێنا و کردیان بە مەلیك، هەتا نەتوانێ لە گوێی ئەوان دەربچێ. ئینگلیز زۆر دەترسا کە ئەو خەڵکەی لێ هەڵسێ و بەرژەوەندیەکانی، بەتایبەتیش ئەوتی لێ بکەوێتە مەترسی. چونکە دوای ئەوەی مەلیك فەیسەلیان هێنایە دەوڵەتە نوێیەکە، ئەو، ٦٠٠ ئەفسەری کورد وعەرەبی بەدوای خۆی گەڕاندبووەوە و کاروباری ئەو دەوڵەتەیان کەوتبوە بەردەست. ئەو ئەفسەرانەش زۆربەیان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا دەورەیان لە ئەلمانیا دیتبوو، زۆریش سەرسام بوون بە هێزی سەربازی ئەوێ وە ڕقێکی زۆریشیان لە ئینگلیز بوو. هەر بۆیە، دوای ئەوەی هیتلەر لە ساڵی ١٩٣٣ هاتە سەر حوکم و هێزی سەربازی خۆی بەهێزکردەوە، زۆربەی ئەو ئەفسەرانە هیوایان بە ئەلمانیا زۆر بوو وە داوای سەربەخۆیی عێراق و دژایەتی بەرنامەی ئینگلیزیان دەکرد.

پاش ئەوەی جەنگی جیهانی دووەمیش (لە ساڵی ١٩٣٩ تا ١٩٤٥) هەڵگیرسا، ئینگلیز ئەو ترسەی زۆر زیادی کرد، بە تایبەتیش چونکە زۆربەی هەرە زۆری هێزی ئینگلیز خەریکی بەرەکانی شەڕبوون لەگەڵ ئەڵمانیا. هەربۆیە لە ساڵی ١٩٣٩، ئینگلیز دەستی بە پروپاگەندە بۆ خۆی کرد. پێدەچێ هێنانی ڕادیۆش بۆ یەکەم جار بۆ شەقڵاوە لە درێژەی ئەو بەرنامەیە بووبێ. ڕادیۆکەیان لەناو قوتابخانەی تەنیشت قشڵە دانا و ڕۆژانە لە سەعات شەشی ئێوارە هەتا نۆی شەو بەرنامەی پەخش دەکرد. هەر شەوە و یەکێك لە پۆلەکانی قوتابخانەیان دەهێنا بۆ ئەوەی گوێ لە بەرنامەکان بگرن. بەڵام چونکە ڕەشید عالی گەیلانی بوو بە سەرۆکی وەزیران و ئەو زۆر دژی ئینگلیز بوو، هەروەها بەربەرەکانی نێوان رەشید عالی گەیلانی و نوری سەعید دەستی پێکرد بوو، ڕادیۆکە لە دژی ئینگلیز بەکاردەهات و زۆربەی کاتیش ڕادیۆی بەرلین دەکرایەوە. پاشان لە ساڵی ١٩٤١، رەشید عالی گەیلانی کودەتایەکی کرد و بە ئاشکرا پەیوەندی لەگەڵ ئەلمانیا دورست کرد. ئیتر هەر ڕایۆی ئەلمانیا دەکرایەوە و ئەوکاتیش خەڵك بە گشتی حەزیان دەکرد ئەڵمانیا سەرکەوێ.

پێشکەشکەری بەرنامەکانی ڕادیۆی ئەلمانیا، کابرایەك بوو بەناوی یونس بەحری. ئێستاش دەنگی ئەوم لە گوێ دەزرینگێتەوە. ئەو کابرایە دەنگیکی زۆر گەورە و بەحەماسی هەبوو، کە دەیووت "هنا برلین"، دەنگی دەدایەوە و

هەستمان دەکرد ئەرز لەگەڵی دەلەرزی! ڕۆژێکیان لە ساڵانی حەفتاکان، وابزانم ساڵی ١٩٧٦ بوو، سەردانی شاری بەغدام کرد و لە مەیدانی تەحریری بەغدا، حاجی کامەلای برازای حاجی سەلیم، کابرایەکی باریکی بەژن درێژی نیشاندام و ووتی "قادر ئەو کابرایە درێژە دەبینی، ئەوە ئەو یونس بەحریەیە کە تۆ لە چلەکاندا گوێت لە دەنگی دەگرت".

قشڵەی شەقڵاوەی ئەوکات زۆر گچکەتر و هەر نیوەی ئەوەی ئێستا دەبوو. قوتابخانە کۆنەکەش هەر لە تەنیشت قشڵە کۆنەکە بوو بەلای کانی خمان، بەشێکی ئەو شوێنەش هێشتا هەر گۆڕستان بوو. قوتابخانەکە چەند ژوورێکی هەبوون و ڕادیۆکە لە ژوورێکی لای پێشەوەی قوتابخانەکە دانرابوو. ئەو ژوورە تەنها یەك پەنجەرەی بە لای سەرەو هەبوو و ڕووی لە سەفین بوو. چونکە ڕادیۆ شتێکی نوێ بوو لەو شارە و خەڵك ئەو شتەی نەدیبوو، هەموو خەڵك لەوێ کۆدەبوونەوە. من لە بیرم نەماوە کام وەرزی ساڵ بوو، بەڵام دەزانم هەموو ماڵ لە گوندی بوون. چونکە خەڵکیش بێ ئیش بوون، پیاو هەبوو سەعاتێك یان دوو سەعات ڕۆژ دەما دەچوو بۆ بەردەم پەنجەرەکە. سەیر لەوەدا بوو هیچ شتێکیش تێنەدەگەیشتن، چونکە جگە لە مەلا حوتان و مەلا ئەحمدی تەها فەندی، کەسی تر زمانی عەرەبیان نە دەزانی. ئەگەر ئەو دوو کەسە لەوێ بونایە، ئەوا هەندێك لە هەواڵەکانیان بۆ خەڵك دەکردە کوردی. کابرایەك هەبوو یەك ووشەی عەرەبیشی نەدەزانی، بەڵام لە هەر هەمووان بەپەلە تر و پێش هەموو کەس لەوێ ئامادە دەبوو و شیشەی پەنجەرەکەی توند دەگرت، هیچ قووەتێکیش نەبوو دەستی لەو پەنجەرەیە بەربدا!

کودەتایەکەی ڕەشید عالی گەیلانی زۆری نەخایاند، چونکە گەیلانی دەستی بە ناردنی نەوت بۆ ئەلمانیا و هاوپەیمانانی کرد. لەبەر ئەوە، ئینگلیز زۆر بەپەلە کەوتە خۆی و هێزێکیان لە بەسرە دابەزاند کە زۆربەیان سەربازی هیندی بوون و هێزێکی تریشیان لە فەلەستین ڕەوانە کرد. هێزە ئاسمانیەکەی ئینگلیزیش لە حەبانیە، کە بۆ ماوەی پتر لە مانگێك بە هێزی گەیلانی گەمارۆ درابوو، هێرشی بەرامبەری دەستپێکرد و هێزە عێراقیەکەی شکاند. دوو مانگ پاش کودەتایەکە، ڕەشید عالی گەیلانی ڕایکردە ئێران. چونکە ڕەزا شا ئەو کات دۆستی ئەلمانیا بوو، ئینگلیز ڕەزا شای گۆری و کوڕەکەی لە شوێنی دانا. ڕەشید عالی گەیلانی بە ناچاری ڕایکردە ئەلمانیا و پاش تەواو بوونی جەنگیش چووە عەرەبستانی سەعودی.

پاش ئەوەی کۆنترۆڵی عێراق کرایەوە و دوای ڕاکردنی ڕەشید عالی گەیلانی، جگە لەو هێزە هیندیەی پێشتر، ئینگلیز هێزێکی سەربازی گەورەی لە هیندستان هێنا و لە دەوری بیرە نەوتەکانی کەرکووك و موسڵی جێگیرکردن. ئینگلیز هیچ بڕوایەکی بە خەڵکی عێراق (بە کورد و عەرەبەوە) نەمابوو وە ئەی دەویست جارێکی تر بەرژەوەندیە نەوتیەکانی بکەونەوە مەترسی. بۆ ئەوەی ئەو هێزەش بێزار نەبێ، کەمپێکیان لە سەرمەیدانی شەقڵاوە بۆ دورستکردن وهەر دوو هەفتە جارێك هەزاران کەسیان بۆ پشوودان دەهێنانە ئەوێ. من ماوەیەکی باش لەو کەمپە کارم کرد و زمانی ئوردوو زۆر باش فێربووم.

دوای ڕاکردنی ڕەشید عالی گەیلانی، ئینگلیز پروپاگەندەی خۆی زیاد کرد و هەر بە ڕادیۆ نەوەستا و دەستیان بە هێنانی سینەمایەکی سەفەری کرد. پارچە قوماشێکی سپیان لە دیوار دەدا و دەیانکرد بە شاشەی سینەماکە. بەزۆریش لە سێ شوێن لە دیواریان دەدا. دیواری مزگەوتی گەورە، دیواری قشڵە، هەروەها کلێسەیەکی گچکە لەکانی خمان هەبوو، لەو گۆشەیەی کە پێچی دەدایەوە و بۆ لای قوتابخانەی کاوێس. کلێسەکە شوێنێکی بچوك بوو و زیاتر وەك شوێنی دانیشتنی مام قەشە و بۆ خوێندنیش بەکاردەهات. سینەماکەیان دەبردە شارەکانی تری کوردستان و هەر شەوە لە شوێنێك هەڵیاندەدا و زوو زووش نۆرەی شەقڵاوە دەهاتەوە. جگە لە فلیمی بەرەکانی جەنگ لەگەڵ ئەلمانیا و تەنها لایەنی سەرکەوتنەکانی بەرەی ئینگیز، هیچ شتێکی تریان نیشان نەدەدا. بەڵام چونکە خەڵك بێ کار بوون، زۆربەیان دەهاتن بۆ بینینی سینەماکە.

دوای ماوەیەك، پێموابێ ڕەسوڵ کاکۆ یەکەم کەس بوو ڕادیۆی بۆ چایخانەکەی خۆی کڕی. زۆربەی گەنجەکانیش دەچوونە چایخانەی ئەو، کە بە زستانان لە تەنیشت قشڵە بوو بە لای مزگەوتی گەورە وە بە هاوینانیش لە بەرامبەر هۆتێل نەورۆزی ئێستا بوو. پاشان ڕەسوڵ کاکۆ ئەم شوێنەی کرد بە هۆتێل. ڕادیۆیەکی عەرەبی لە فەرەنسا هەبوو گۆرانی زۆر خۆشی لێدەدان. گۆرانی بێژێکی کچی سوریش هەبوو بەناوی سهام ڕفقی کە هەم کچێکی جوان بوو و هەم دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو. ئێمەی گەنجانیش زۆرمان حەز لە دەنگی ئەو دەکرد، بەتایبەتیش من و سەعیدە ڕەش و ساڵحە بۆر. ناوە ناوە نامەیەکیشمان بۆ ئێزگەکە دەنارد و داوای گۆرانیەکانی ئەو کچەمان دەکردن. پاشان کچەکە شوی کردو وازی لە گۆرانی بێژی هێنا.

دوای ڕەسوڵ کاکۆ، خەڵکی تریش دەستیان کرد بە ڕادیۆ کڕین بۆ چایخانەکانیان. بەڵام کارەبا ئەو کات لە شەقڵاوە نەبوو وە ئەو ڕادیۆیانەش بە

پاتری گەورەی وەکو ئەوانەی ترومبێل کاریان دەکرد. دەبوایە هەر چەند ڕۆژ جارێك، ئەو پاتریانە بۆ شەحنکردن ببەنە هەولێر. هەربۆیە حاجی برازای حاجی سەلیم و مام تەهای کاوانی، موەلیدمیەکی کارەبایان لە ساڵی ١٩٤٥ کڕی و پاتریان بۆ خەڵك زۆر بە هەرزانتر لە هەولێر شەحن دەکردەوە. پاش کڕینی ئەم موەلیدمیە، زۆر خەڵکی تر ڕادیۆیان بۆ خۆیان کڕی. منیش یەکەم ڕادیۆم لە حەمەدی کوڕی خاڵی خۆم لە ساڵی ١٩٥٩ کڕی. ئەو کات دوکانێکی بچووکی لەناو ڕەزی ساڵحی مەلا قادری هەبوو، لە بەرامبەر ماڵی عوسمانەفەندی. ڕادیۆکەش مارکەیەکی چینی بوو وە وێنەی هەرسێکی پاندای لەسەر بوو. بەڵام چونکە خەڵك ئەو جۆرە ئاژەڵەیان نەدیبوو، ناویان لەو جۆرە ڕادیۆیە نابوو "ئەبوالکەلب".



ڕادیۆی پاندا

# کات بەسەربردن

لە کۆندا شتێکی وانەبوو خەڵکی کاتی پێ بەسەر ببەن، بۆیە ئەگەر کەسێك بەسەرهاتی کۆن یان چیرۆکی لا دەستکەوتبان، یاخود کەسێك بەند و حەیران یان لاوکی بزانیبایە، ئەوا خەڵکەکە لە دەوری کۆدەبونەوە و گوێیان لێی ڕادەگرت. نمونەی چەند کەسێك دەهێنمەوە کە لە شەقڵاوە خەڵکی بەتوانا و شارەزا بوون لەم بوارە.

من منداڵ بووم کە جارێکیان کاوێس ئاغای لاوك بێژ لەگەڵ چەند پیاوە ماقوڵی شەقڵاوە، نانی ئێوارەیان لە ماڵی ئێمە خوارد. پاش نان خواردن، کاوێس ئاغا دەستی بەلاوك گووتن کرد. لەبیرمە مانگە شەوبوو ماڵمان پڕببوو لە خەڵك، لە ژوورەوە جێگە نەمابوو و بەڵکو حەوشەی دەرەوەشمان پڕببوو. ئەو میوانانەی کە لە بیرمن زوبێرئاغا، أحمد لالۆ، سەعید قەساب، احمد سمایل بەگ، حەسەن عبدالقادری یاری.

جگە لە کاوێس ئاغا، لاوك بێژی تر هەبوون لە ناوچەی تریش هەبوون کە جار و بار دەهاتنە شەقڵاوە. ئەوانەی لەبیرمن، حەمەد مەندۆ، عەزیز ئاغا، عەلۆ پارانی. هەروەها ڕەشیدی بایزیش لە شەقڵاوە هەبوو وە ئەحمەد وسو کە لە ترگارە دادەنیشت، هەردووکیان دەنگیان زۆر خۆش بوو. یەکێك لە حەیران بێژەکان، ڕەبەنی سۆمەی مەسیحی بوو کە دەنگی زۆر خۆش بوو. خدرە سۆریش بەند بێژێکی شارەزابوو، هەروەها حەکایەتی مەم و زینی زۆر بە لەزەت دەگێرایەوە.

هەندێك لە حەکەیات خوانەکانیش بریتی بوون لە عەولا ڕەش، مام تەها کە خەڵکی لای پشدەر بوو وە مەلا قادر حەکایەتی ئەسکندەری مەقدۆنیی دەکرد. وەستا عەوڵا کوێر حەکایەتی زۆر خۆشی دەگێرایەوە، بە تایبەتی لە شەوانی زستان. وەستا عەوڵا پیاوێکی زۆر بلیمەت و زانا بوو، تا ئەم دواییەش زۆر شتی لەبیر بوون، هەرچەندە بە تەمەن زۆر گەورەش بوو. بیناییشی لەدەست دابوو، بەڵام بەگۆچانەکەی دەیتوانی بۆ هەموو شوێنێك بڕوا. زۆر جاریش لەگەڵ مەلایەکان گفتو گۆی دەکرد، هەندێك جار زانیاری زیاتریشی لە مەلایەکان لا دەست دەکەوت، کەچی نەخوێندەواریش بوو! تاکو لە ژیان مابوو من زوو زوو سەردانم دەکرد و زۆر شتی کۆنی بۆ دەگێرامەوە. زۆر جار وەستا عەوڵا دەهاتە لای زوبێر ئاغا یان دەچووە ماوەران لای سەلمان ئاغا و جاری وا هەبوو لە زستانان حەفتەیەك دەمایەوە. شەوان خەڵك کۆدەبونەوە و دەست بە حەکایەت گێرانەوە دەکرا. تا سەعات ١٢ی شەو بە سعاتی ئینگلیزی

دادەنیشتین. ئەوکات سەعاتی عەرەبی بەکاردەهات ئەوەك سەعاتی ئینگلیزی. لە سیستەمی سەعاتی عەرەبی مەغریب لە سەعات ١٢ی شەوە، کە بە سەعاتی ئێستا دیکرد شەش یان حەوتی ئێوارە. تەنها قەشە جبرائیل سەعاتی ئینگلیزی هەبوو، ئەگەر پرسیارت لێ کردبا سەعات چەندە، هەردوو سەعاتی عەرەبی وە ئینگلیزی پێ دەگووتی.

مام تەها لە زستان چیرۆکی زۆر خۆشی لە چایخانە دەکردن. سەرەتای حەکایەتەکانی بەم شێوەیە دەست پێ دەکرد: یادی بەیادی، تەختی مرادی، کاردی بەساردی، خەوی سەر لبادی، ناوی لە دیمکی، سێبەری بن کەپکی، ماچکردن لە کیژێ خەلکی. بە مەلای گەرمیانی، بە فەقێی کوێستانی، نۆبال بە ئەسکورد (مل)ی ئەو مامۆستایەی کە ئەمن لێم زانی. ئینجا ئاغا مەپرسە چ ناسك سەنەمێك بوو، خۆخ بەدەمێك بوو، هەنار مژێك بوو. بە لوتفی شیرینی، بە زمانی شەکەری، دایم گوڵی لە لێو دەباری. بگەڕابای، هەڵکشابای، داکشابای، شۆخ و شەنگێ، نەرم و نۆڵێ، خڕو خۆڵێ، عەجیب لەنجە و لاو کوژی وا پەیدا نەدەبوو. چاوی دەتگۆ پیاڵەیە، لووتی دەتگۆ فندەقە، ددانی دەتگۆ سەدەفە، چەنەگەی دەتگۆ گۆیە، گەردەنی دەتگۆ بلوری سێ نمرەیە دانایسێ. سنگی دەتگۆ کاغەزی سەمەر قەندیە، دوو لیمۆێ لێ نەسب کرایە یەکیان تامی شەکری لێدێ، یەکیان تامی هەنگوینی.

ئەوە سەرەتای چیرۆك بوو. ئینجا چیرۆکی پەهلەوانانی دەگێرایەوە و کە دەگەیشتە شەڕی پەهلەوانان دەیگووت "ئەو گورزی هەڵسوڕاندەوە و دەیهێنا لە گەڵ ئەستێرەکانی جووت دەکرد و پروشکی ئاگری لێدەباری. لە سەری ئەو مەلعونەیدا و جووتە چۆکێکی ئەوتۆی لە دەفەی سنگیدا و یەکێکی ئەو تۆی لێ بەردا، گاسنی پێ سۆر بکرێتەوە". من کاتی خۆی ئەو بابەتە و زۆر شتی ترم دانە مامۆستا عەلائەدین سوجادی و هەندێکیان لە ڕشتەی مرواری بڵاوکرانەوە.

حەکایەت خوانێکی تریش لە بالیسان هەبوو قادر بەگیان پێ دەگووت. کە دەهاتە شەقڵاوە، خەڵك بە یەکتری ڕادەگەیاند کە قادر بەگی بالیسانی هاتووە و هەموو دڵمان زۆر خۆش دەبوو. حەکایەتی قارەمانی بە کوردی و بە فارسی دەکرد و دەیڕازاندەوە "وەك ئاو لەسەر بەردی مەڕمەڕ کوفارە (شەپۆل)ی دەکا...". ئەو هەموو حیکایەتەکانی وەك شیعر دەگووت. کە دەهاتە سەر ئەوەی چۆن لەشکرکێشی بۆ سەر هیند دەچوو، دەیگووت "کە شام بەرکە شام شمشێر رەشیدان سەرپون بە دەیمون بە سیدەم دەسی بەر بلال لەکۆسی داستانێدا سەرێ نیزە و بەیداغ و عەلەمان ڕاکشا، هەر عەلەمەو نیشانەیە بۆ

ئەوەندە هەزار ئەفەرە". من نازانم فارسیەکەم چەند ڕاست و دروستە، چونکە من ئەوانەم لە منداڵیەوە لەبەر کردون و ئێستاش بە گوێم دەزرینگێنەوە.

لە کوردستان هەر ناوچەیەو لە ڕووی ئاخاوتن و شێوەی قسەکردن، تایبەتمەندی خۆی هەیە. ئەگەر لە شێوەزاری ئاخاوتنی شەقلاوە وردبیەوە، دەبینی خاوەنی شێوەیەك قسەکردنە کە جیاوازە لە هەموو ناوچەکانی تر. هەر دوو زاراوەی کوردی کرماجی سەروو و کرمانجی خواروو تا ڕادەیەك تێدا بەدی دەکرێ. هەروەها شەقلاوە شوێنێکی گەشتیاریە و چونکە کەوتۆتە سەر ڕێگای هاملتۆن، کاریگەری زمانی عەرەبی و فارسیشی بەسەرەوەیە.

میرزا قادر کابرایەکی خوێندەوار بوو و دایکی دووەمی من کچی ئەو بوو. ئەو نامەی بۆ خەڵکی دەخوێندنەوە و دەنوسین، هەروەها نوسەری میرانی قادر بەگیش بوو. جگە لەوەش میرزا قادر ئەکتەرێکی شانۆیی زۆر بە توانا بوو. لە کاتی دابەش کردنی ئیجازەی مەلایەتیدا لە حوجرەی فەقێیان، شانۆگەری پاشا و فەقێی پێشکەش دەکرد. ئەو زاراوەیەی کە لە کاتی پێشکەش کردنی شانۆگەریەکەدا بەکاری دەهێنا، بە زمانی فارسی بوو. هەروەها بەهۆی ئەوەی چەندین کەسی خەڵکی ناوچەکە عەسکەری تورك بوون، زۆر زاراوەی تورکیش لە کۆنەوە تێکەڵ بە زمانی ناوچەکە بوون. دوای ئەوەی کەمپی بەریتانیەکان هاتە شەقلاوە، زۆر ووشەی ئینگلیزی و هێندیش تێکەڵ بە شێوەزاری شەقڵاوە بوون. هەر بۆیە ئەوەی ئەختێك شارەزایی لە شێوەزارەکان هەبێ، لە هەر شوێنێك بگاتە کەسێکی خەڵکی شەقڵاوە و بەبێ ئەوەی پرسیار بکا دەزانێ کە خەڵکی شەقڵاوەیە.

لە سەردەمی منداڵی من تەلەفزیۆن و ڕادیۆ نەبوو و لە هەموو شوێنێك چیرۆك دەگێردرایەوە، بەتایبەتی لە چایخانەکان. ڕۆستەمی زاڵ، فەلەك ناس، شێرەوی، قەهرەمان و قەیتەران، ئەمیر ئەرسەلان، ئەسکەندەری مەقدۆنی، برایمی زیندینان، لەیل و مەجنون، خەج و سیامەند، مەم و زین، لاس و غەزال، لاس و مارمار هەندێکن لەو چیرۆکانەی ئەو سەردەم. خەڵکیش کەم دەچووە چایخانە، بەڵام کە چیرۆك ئەخوێنرایەوە خەڵك زۆرتر دەچوون.

مام ڕەشید دۆستێکی نزیکی باوکم بوو. زۆر جار دەهاتە لای باوکم و حەکایەتی لەیل و مەجنونی بە کوردی بۆ دەکردین. دێتەوە بیرم کە دەیگووت سەرۆك عەشیرەتەکان دەچنە لای باوکی لەیل و دەڵێن هەرچی ئەتۆ بڵێی ئێمە ئامادەین جێبەجێی بکەین، تەنها لەیل بدە مەجنونی. ئەویش دەڵێ ئەگەر توانیتان

داواکاریەکانی من جێبەجێ بکەن، ئەوا لەیلی پیرۆزبێ. دەڵێن فەرموو بڵێ، ئەویش بە شیعر دەڵێ:

سەد جۆتم دەوێ جۆتی مێروستان
هەوجار قرۆمی گاسن نۆ باتمان
جۆتی پێ بکرێ لە چینی کوێستان
شاهێد ڕاستوەبێ ئەبێ زەرەردار
قیمەتێ بابێ لەیلێ نوندەتا
کەس نەڵێ بابێ لەیلێ دەگری هەنجەتا

سەد مەڕم دەوێ مەڕی کەویسار
سەد گورگم دەوێ لە گورگانی هار
وێکڕان بگەڕێن کوێستان و گەرمیان
شاهێد ڕاستوەبێ ئەبێ زەرەردار
قیمەتێ بابێ لەیلێ نوندەتا
کەس نەڵێ بابێ لەیلێ دەگری هەنجەتا

سەد کچم دەوێ کچانی نازدار
سەد کوڕم دەوێ کوڕی چاردە سار
وێکڕان بگەڕێن لە دەشت و کێوان
شاهێد ڕاستوەبێ ئەبێ زەرەردار
قیمەتێ بابێ لەیلێ نوندەتا
کەس نەڵێ بابێ لەیلێ دەگری هەنجەتا

حوشترم دەوێ لە سەر منارەی سەرچۆپی بکێشێ
بەربیتەوە بە چۆکان بەردی بقەرێشێ
شاهێد ڕاستوەبێ چ جێی نەهێشێ
قیمەتێ بابێ لەیلێ نوندەتا
کەس نەڵێ بابێ لەیلێ دەگری هەنجەتا

خێم دەوێ لەسەر بەردی شین ببێ
حەوت کەدان بدا هەرکەدی نۆ عەربەی لەبن بکەوێ
قیمەتێ بابێ لەیلێ نوندەتا
کەس نەڵێ بابێ لەیلێ دەگری هەنجەتا

ئیتر مەجلیسەکە هەڵدەستن و دەڕۆن، چونکە داواکاریەکان لە توانای مرۆڤ نین.

ڕەحمان سورچی شاعیرێکی شەعبی بوو و زۆر شیعری هەبوون کە لەناو خەڵك زۆر باو بوون. هەندێك لە شیعرەکانی کران بە بەند و لە کاتی درونە و ڕەز بڕین خەڵك دەیان ووتنەوە. ڕەحمان سورچی زۆر زیرەك بوو و هەر شتێکی سەیری لەکەسێك بینیبا، شیعرێکی لەسەر دادەنا.

نەلەمان کوردی خەڵکی کۆیە بوو، حەکایەتی دەکردن و مەجلیسی زۆر خۆش بوو. کابرایەکی تۆزێك شێت بوو. کە قسەی دەکرد، باسی ملیۆنەها لیرەی دەکرد وە چۆن مەلیك فەیسەڵ لیرەی بۆ ناردون. بەڵام پیاوێکی زۆر نەمین بوو و هەموو کات دڵی خۆش بوو. کیلۆی هەڵوژەی بەیەك درهەم دەکری، بەڵام بە هەرزانتر دیفرۆشتنەوە! پێیان دەگووت بۆ وادەکەی؟ دەی گووت "هەردەست بسوڕێ بەسە". کە هەژاریش بوو یارمەتی لە کەس وەرنەدەگرت، بەڵام دۆستایەتی لەگەڵ من زۆر خۆش بوو. جارێك بابەتێکم خوێندەوە بەناوی "شێتی لە ژیری خۆشترە". مرۆڤ هەوڵدەدا بگاتە کامەرانی، نەلەمان کوردی گەیشتبوو بە کامەرانی. بەم دواییە محەمەد زەردان چیرۆکی خۆشی دەگێرانەوە، بەڵام چیرۆکەکانی نەو تازە بوون و پیاوێکی زۆر ڕەوان و قسە خۆش بوو. هەروەها لە نێو برا مەسیحیەکانیش چەند چیرۆك خوانێکی بە توانا هەبوون وەك مام باسە عبدلنەحد و مام شموون...

کۆنترین چایخانە لە شەقڵاوە چایخانەی محەمەدی چایچی ڕواندزێ بوو. شوێنێك لە ژێر دوو دەرانەکەی ماڵی میر هەبوو پێیان دەگۆت تەویلە، چایخانەی محەمەد چایچی لەوێ بوو. لە دوای نەو نەحمەد عەلی چایخانەی کردەوە. چایخانەی حەمەد مەلا یونسیش لە ژێر خانەقای مزگەوتی گەورە بوو. لەو سەردەم شوێنی خۆشوشتن لە ماڵان نەبوو، بەڵکو خەڵك دەچوون لە شوێنێکی تایبەت کە پێیان دەگووت "فەرشان" لە مزگەوتی گەورە خۆیان دەشوەشت. لەو چایخانەیەش چایەکی گەرمیان دەخواردەوەو و خۆیان گەرم دەکردەوە، بۆیە زستانان هەرمێنێکی باش لەسەر نەم چایخانەیە هەبوو. حەمەد مەلا یونس لە شارەوانی شەقڵاوە مووچەی هەبوو، نەو پیاوە دەنگی زۆر خۆش و گەورەبوو. نەوکات میری سەرانەی لەسەر هەموو شتێك دانابوو، هەتا لەسەر کەر و ووڵاغیش! کە کاتی وەرگرتنی سەرانە دەهات یان هەر ناگاداریەك هەبووایە، نەو بانگی ڕادەهێشت. کاتێك شێخ سافی کاکی هیرانیش بە سەردان دەهاتە شەقڵاوە، حەمەد مەلا یونس لە پێش کاکی هیران دەڕۆیشت

و سەڵاواتی لێدەدان. دوای ئەوان ساڵحی سمایل بەگیش چایخانەیەکی تری لە تەنیشت مزگەوت دانا.

پاشان مستەفا حەلاق ناسراو بە مستەفا بەربەر لە خانوی خۆی چایخانەیەکی دانا. عەوڵا رەش کە خزمی خۆی بوو دەهات و لەوێ حەکایەتی دەگێرانەوە. شوێنی چایخانەی حاجی حەسەن لەبن کۆشکی خۆی بوو بەرامبەر دەرگای قشلە. لە چلەکان، زۆر جار حەسەن چاوەش لەو چایخانەیە سیرەت نەلنەبی (ژیاننامەی پێغەمبەری) بە تورکی دەخوێندەوە. من تەنها ئەو خەتەم بیرماوە "بیر قلیچ ووردی، نیکی پارە ئیلایەدی، جانی جەهەننەمە گیتی" بە مانای شیرەکی لێدا، کردیە دووپارچە، روحیشی چووە جەهەننەمێ. مستەفای حاجی وسوی هەمووی لەبەرکردبوو، چونکە هەشت تا نۆ ساڵێك بوو دەخوێندرایەوە و زۆر جار ئەویش بە کوردی هەمان حەکایەتی دەگێرایەوە. لە کۆتایی سیەکان بوو یانیش لە سەرەتای چلەکان کە خەتی تەلەفۆن بۆ شەقڵاوە و رەواندز رۆیشت. کاری حەسەن چاوەش بەسەرکردنەوە و چاککردنی هێڵی تەلەفۆن بوو. نێردەبان و کەل و پەلی پێ بوون و بە ووڵاغ هەر لە مەسیف تا هەریر و سپیلك لە ژێر چاودێری ئەودابوو. لەو کاتانەش کە دەرفەتی دەبوو، لە چایەخەنە دادەنیشت.

مەلا قادر چایخانەیەکی لای مزگەوتی گەورە کردەوە، بەڵام زۆر درێژەی نەکێشا. ئەوکات مەلا قادریش موچەی میری وەردەگرت و شەوانە فانوسی هەرلە گەرەکی باوباپیران تا گەرەکی کانی خمان بە مەبەستی رۆناککردنەوە هەڵدەواسین. داری تایبەت بۆ ئەو مەبەستە چەقێندرابوون و فانوسەکانیش قفڵدەکران. دواتر رەسول کاکۆش چایخانەی کردەوە. ئەوەی من بەبیرم دابێ، ئەو دوو چایخانەیە سەندوقی قەوانیان هەبوو. زۆرجار شەوان دەچووینە چایخانەکان و تا درەنگ دەماینەوە، ئینجا دەچووین بۆ راوە قاژوو.

سەرەتا تاوڵە و دۆمینە نەبوون، تەنها کاغەز هەبوو. یاری پێنج پەر و سێ پەر و ئالتمش ئاڵتی و تۆپ دەکران. هەروەها یاری کەرەمستانە و کڵاو کڵاوانێ و سنی و زلفانە (سنی سنیانێ)ش دەکران. منداڵ نەیاندەتوانی بچێتە چایخانە، بەڵام لە پشت پەنجەرە گوێیان لە قەوان و شتی تر دەگرت.

ساڵێکیان ساباتێك بۆ چایخانە لەسەر ناوی ناوەنجی دروستکرا. بەڵام هەر زوو ئاگری تێ بەردرا و سووتێندرا. دوای ئەمانە، سعید چایچی پەیدا بوو. سعید چایچی خەڵکی ئاقوبان بوو و چایخانەیەکی زۆر خۆشی هەبوو. ئەوکات دۆمینە و تاوڵە پەیدابوون. لەساڵی ١٩٣٩، بۆ یەکەمجار رادیۆ هێنرایە شەقڵاوە و

پاشان ڕەسول کاکۆ ڕادیۆی بۆ چایخانەکەی کڕی و ئیتر خەڵك زیاتر دەچوونە چایەخانە.



ڕادیۆیەکی ساڵی ۱۹۳۹

لە ساڵانی سیەکان بازاری شەقڵاوە زۆر بچووك بوو و چەند دوکانێك لە دەوروبەری مزگەوت هەبوون. جگە لەوێش، شوێنێك لەلای قشلە هەبوو پێیان دەگووت بن تاوکان. چونکە شوێنێکی سێبەر بوو، لە هاوین خەڵك لەوێ کۆدەبونەوە و دادەنیشتن. تەراح (دارفرۆش)ەکان داری خانویان لەوێ دادەنان و دەیانفرۆشتن. خەڵکیش لە شوێنی دوور دەهاتن و دەیانکڕین. هەر لە نزیك ئەوێ، شوێنێکی تریش هەبوو که زستان خەڵکی لێ کۆدەبوەوە و ناوی بەربەرۆچك بوو. ئەو شوێنە داری کەم بوو و خەڵکی لەبەر هەتاو دادەنیشتن و ڕۆژەکەیان دەبردەسەر. ناوی "بەربەرۆچك" لە "بەر ڕۆژ" هاتبوو. ژنەکانیش دەچوون بۆ سەقاو کە لە خواروی مزگەوتی گەورەبوو.

لە بنتاوکان و بەربەرۆچك، زۆرجار لەلایەن بە تەمەنەکان کێبەرکێی جۆرەها یاری وەك کورتانانێ و دامە دەکران، هەروەها سوار سوارانەی ئەسپیش دەکرا. گەنجان و منداڵانیش، یاری جۆراوجۆرمان دەکردن وەك: کێلە بەردانێ، کەلایانێ، پەلیکانێ، حەفت بەردانێ، خەت خەتانە و قورت قورتانە. جگە لەمانەش یاری مەزرەح دەکرا و کە دەسوڕا دەمانگووت " زاری بەران، زاری بەران، بە قوەتی خوا و پێغەمبەران، کۆلێ بشکێنم ترمتەم ئێ خۆبێ". هەروەها قاشۆیانێ دەکرا کە هەروەك یاری گۆڵفی سەردەمی ئێستابوو. زۆربەی ئەو یاریانە، لەسەر مێوژ و گوێز دەکران. تەنها یاری کە لە کاتی منداڵی من لە دوکانەکان دەست دەکەوت فرفرۆکەی ڕەنگاو ڕەنگ بوو، ئەوانەی تر هەمووی لە شتی سادە و خۆماڵی دروست دەکران.

هەرچەندە تەکنۆلۆژیا نەبوو و دونیای ئێمە تەنها ئەو هاوڕێ و برادەرانە بوون کە لەدەوری یەکتر بووین و لە زۆر لایەنیش ژیان یەکجار سەخت بوو، بەڵام تام و چێژی ئەو یاریانەی منداڵیم ئێستاش هەر لە خەیاڵ ماون.

# باڵندەکان

ژینگەی شەقڵاوەی کۆن وەك ئێستا ویران نەبوو. ئەگەر لە شوێنێکی بەرزی وەك لوتکەی سەفین یان لە چیای سۆرك تەماشای ناو شەقڵاوە بکرابایە، یەك پارچە لە سەوزایی و ڕەز و باغ بوو وە زۆر بە دەگمەن مرۆڤ دەیتوانی ماڵێك لەناو ئەو شارە بەدی بکا. شوێنێکی ئەوەندە خۆش بوو کە هەرگیز هیچ ووشەیەك ناتوانێت باس لە جوانی و خۆشی بکا. لەبەر سەوزی و ناوە سازگارەکانی، شەقڵاوە پڕ بوو لە جۆرەها باڵندەی جیاواز. بوونی ئەم هەموو جۆرە باڵندەیە لە ناو ڕەز و باغەکانی شەقلاوە، خۆی لە چەند ئەگەرێك دەدۆزێتەوە:

یەکەم، زۆر لە باڵندەکان بەمەبەستی زاوزێ دەهاتنە ئەم شارە تا هێلانەکانیان لە سەر دار و درەختە جیا جیاکان دروست بکەن. هەر جۆرە باڵندەیەکیش حەزی دەکرد لەسەر جۆرە درەختێك هێلانەکەی دروست بکا.

دووەم، بەدەست هێنانی خۆراك لەم شارە بۆ باڵندەکان زۆر سانا بوو، بە تایبەتی ئەو باڵندانەی کە میوە خۆر بوون دەیانتوانی لەسەر بەری ئەم دارانە خواردن بەدەست بێنن. باڵندەکان پێویستیان بە خۆراکی زۆرە بۆ بەخێوکردنی بێچوەکانیان و جۆرەها میوە لە شەقلاوە هەبوو و هەروەها، بەهۆی زۆری ناویش لەم شارەدا، جۆرەها کرم لەناو ڕەز و باغەکان هەبوون.

سێیەم، ناو و هەوای شارەکە پاڵنەرێك بوو بۆ ئەو باڵندانەی کە حەز لە کەش و هەوای فێنك دەکەن. بە پێچەوانەشەوە، ئەو باڵندانەی حەزیان لە شوێنی سارد و بەستەڵەکە، دەهاتنە شەقڵاوە. چونکە شەقلاوەی ئەو سەردەم بەفرێکی زۆری لێ دەباری، وای کردبوو ئەو جۆرە باڵندانە لە زستانان ڕوو لەم شوێنە بکەن.

چوارەم، بە مەبەستی خۆحەشاردان و خۆ پاراستن لە دوژمنەکانیان، لە ناو چڕ و پڕی باغەکانی ئەم شارە دەمانەوە.

پێنجەم، شەقلاوە وەك وێستگەی بەیەك بەستنەوەی گەرمیان و کوێستان بوو. ئەو باڵندانەی کە کۆچیان لە کوێستانەوە بۆ گەرمیان دەکرد یان بەپێچەوانەوە، لەناو دارستانەکانی شەقلاوە ماوەیەك پشوویان دەدا. هەندێك لەو باڵندانە ماوەیەکی کورت دەمانەوە و هەشبوو چەند ڕۆژێك و باڵندەی واش هەبوو بۆ ماوەی مانگێك یان زیاتر، یا ئەوەتا بە درێژایی یەکێك لە چوار وەرزەکان

دەمانەوە. ئەم باڵندانە جارێکی تر لە شەقڵاوە خۆیان تێر و قەڵەو دەکرد، ئینجا دەکەوتنە ڕێ تا بەرگەی سەفەری دوور بگرن.

شەشەم، باڵندەکان لەبەر هێمنی شوێنەکە و کەمی دانیشتوانەکەی ڕوویان لە شەقلاوە دەکرد. بۆ باڵندەکان، ئەو شوێنانەی کە ئاوەدانی کەمە لە ڕووی چڕی دانیشتوانەوە، شوێنی هێمن ترن بۆ مانەوەیان و بەخێوکردنی بێچوەکانیان، بەڵام زۆربەی باڵندەکان توانای خۆ گونجاندنیان لەگەڵ دەروبەرەکەیان هەیە.

لێرەدا بە کورتی باس لە ناوی هەندێك لەو باڵندانە دەکەم کە لە شەقلاوەدا هەبوون. بەداخەوە، لەبەر کەم بوون یان هەر نەمانی خۆراکی زۆربەی باڵندەکان، ئێستا زۆربەیان ڕوو لەم شارە ناکەن. هەروەها زۆربوونی داو و دەرمانی ژەهراوی بۆ شینایی و ڕشاندنی ڕەزو باغەکان، کە بۆتە هۆی لەناوبردنی خواردنی باڵندەکان یان ئەوەتا ئەم باڵندانە خواردنە ژەهراویەکە دەخۆن و دەمرن. لە دوای پەرەسەندنی تەکنەلۆژیا و زیاد بوونی دانیشتوانی شارەکەش بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، زۆرێك لەو باڵندانە زۆر کەمتر بەدی دەکرێن و تەنانەت دەتوانم بڵێم هەندێکیان هەر نەماون.

یەکێك لەو باڵندانەی کە ئێستا نەماوە باڵندەیەکی بچووك بوو پێیان دەگوت (بن زگ سورە)، ئەم باڵندەیە ئەوەندە زۆر بوو و بە ڕەوە دەهاتن بۆ شەقلاوە، بە تایبەتی لە وەرزی پایزدا. زیاتریش لەسەر داری بەڕوو و تاوك و سۆبلەتی بەدی دەکران و بەری ئەو دارانەیان دەخوارد. هەرچەندە ئەو کات منداڵ دار لاستیکیان نەبوو، بەڵام جۆرە چەکێك هەبوو لە شێوەی تیر و کەوان کە ڕاوی پێ دەکرا. ژمارەیەکی زۆر لەو باڵندانە دەکوژران، بەڵام ئەوەندە زۆر بوون کە هەرگیز لەبن نەدەهاتن. باڵندەیەکی تر هەبوو بە (قڕغو) بە ناوبانگ بوو، قڕغو باڵندەیەکی دەنوك تیژ بوو وە بەشی لای سەرەوەی دەنوکی تۆزێك چەمابوەوە لە شێوەی دەنوکی باز. قڕغو لە تەیرەکانی تر گەورەتربوو و گۆشت خۆر بوو، هەمیشە لە دەوروبەری شەقلاوە زۆر بەدی دەکران و باڵندە بچووکەکانی تریان ڕاو دەکردن.

(قەلەباچکە) لە شەقلاوە و دەوروبەری یەکجار زۆر بوو. (قاژوو)ش باڵندەیەکی زۆر بە هاژ و هووژ بوو، هەمیشە قیڕەی دەهات. وەبیرمە باوکم زۆر ڕقی لەم باڵندەیە دەبوەوە بە تایبەتی لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا دەیگووت، لەبەر قیڕەی قاژوان گوێم لە بانگ نابێ! باڵندەیەکی تر هەبوو بە ناوی (فارەقەل)، ئەم جۆرە باڵندەیە زۆر مشەخۆر بوو، هەرگیز خۆی بە دروست کردنی هێلانە ماندوو نەدەکرد، بەڵکو چاوەڕوانی دەکرد تا

قەلەباچکەکان هێلانەیان بۆ خۆ دروست دەکرد و ئەو هێلانەکەی لێ داگیر دەکردن. قەلەباچکەکان زۆر لەم باڵندەیە دەترسان. (گاپەل)یش لە خێزانی کۆترە، بەڵام زۆر گەورەترە. جاران گاپەل گەلێك زۆر بوون و بەیانیان دەنگیان زۆر خۆش بوو! گاپەلەکان کۆچکەر بوون و لە ناوەڕاستی مانگی چوار هەتا سەرەتای پایز لە شەقڵاوە دەمانەوە. بەڵام ئێستاکە زۆر کەم دێنە شارەکەمان و بەم نزیکانە زانیاریم دەست کەوتوە کە بە زۆری لە ناوەڕاستی عێراق دەمێننەوە و کۆچیش ناکەن.

هەندێکی تریش لەو باڵندانەی کە هەبوون و بەشێکیشیان تا ئێستاش لەناو ئەم ڕەز و باغە کەمەی کە لە شەقلاوە ماوە بوونیان هەیە: (شالور) بولبولێکی بچوکی یەکجار دەنگ خۆش و جوانە. (چکچکە) باڵندەیەکی یەکجار بچوکە و ناوەکەی لە دەنگەکەی وەرگیراوە. (ڕیشۆلە)ش ئەوکات ئەوەندە زۆر بوون و هەرجارەی باغێك ناو دەدرا، بە سەدان یان هەزاران ڕیشۆلە لەوێ بۆ کرم خواردن کۆدەبونەوە و جاری وا هەبوو ئەو باغانە لەبەر زۆری ڕیشۆلەکان ڕەش دەکران. (زەردوشامی) زۆر حەزی لە هەنجیر خواردنە، ڕەنگەکەشی زەردێکی زۆر جوانە و خەتێکی ڕەشی لەسەر باڵەکەیە و نێرەکەی دەنگی یەکجار خۆشە. زەردوشامی هێلانەکەی لەسەر ئەسپینداری بەرز یان دار گوێز دروست دەکرد و لە کەلێنێ دارێکی دوولکی دادەنا کە وەك جۆلانە شۆڕ دەبوە و مار نەیاندەتوانی بیگاتێ. (کلك تەقێنە)ش تەیرێکی تربوو کە بە قەبارە زۆر بچوك بوو و هەردەم کلکە درێژەکەشی بەرز و نزم دەکرد.

(کڕکاکیش) باڵندەیەکی گەورەیە و لە بنەماڵەی قەلەڕەشە، بەڵام زۆر ڕەنگاوڕەنگە و باڵندەیەکی زۆر ووشیار و زیرەکیشە کە دەتوانێ زۆر شت فێربێ. پیاوێکی ئەرمەنی بە ناوی ئاگوب چێشتخانەیەکی لە شەقڵاوە هەبوو، بەڵام ئەو لە فێرکردنی باڵندەکان پیاوێکی زۆر بە سەلیقە بوو. سەردەمێك چێشتخانەکەی لە نێوان مزگەوتی گەورە و قشلە بوو بەلای چیای سەفین، بەڵام پاشان بردیە لای کانی خمان. ئاگوب لە ساڵانی شەستەکاندا کڕکاکێکی هەبوو فێری هەموو جۆرە دەنگێکی کردبوو. جارکیان لەبیرمە لەسەر سواندەی دووکانەکەی لاسایی دەیان جۆرە ئاژەلی لەسەر یەك کردەوە. هەرکەسێك لە چێشتخانەکەی ئاگوب نانی بخواردبا، کڕکاکەکە جگەرەیەکی بۆ دەهێنا، دەبوایە ئەویش بەخشیشی بداتێ، ئەگینا دەرگای لێ دەگرتن و بە دەم و چاویان دادەفڕی. بەخشیشەکەش ووردەی ئاسن بوو. کڕکاکەکە بە دەنوکی هەڵی دەگرت و لە دەخیلەیەکی تایبەتی دەکرد و هەندێك جاریش لەبن سەراپیتی چێشتخانەکەی دەشاردەوە. لە ساڵی ١٩٦٧، کڕکاکێك هێلانەکەی لەسەر دار چناری بەر ماڵی ئێمە دروستکرد و بێچوەکیان کەوتە خوارەوە. ئەسعەدی کوڕم

هەڵی گرتەوە و بە نیو دینار فرۆشتیە ئاگوب، کە ئەوکات پارەیەکی زۆر بوو. پاش ئەوەی ئاگوب فێری دەربڕینی دەنگ و لاسایی کردنەوە مرۆڤ و چەندین جۆرە ئاژەڵ و باڵندەی تری کرد، بە چوار دینار فرۆشتیە ئەفسەرێکی گەورەی سوپا کە لەسەربازگەی سەرمەیدان بوو و زۆر جار لە چێشتخانەکەی ئەو نانی دەخوارد.

چەندین باڵندەیتریش هەبوون لەوانە: (پەڕەسێلکە، شەمشەمەکوێرە، زەردوزراویلکە و تفتیلك)، هەروەها (کەو و کۆتر و بەردەکوڕە)، ئەو سێیە لە سەفین زۆر بوون و شەوان دەچوونە ناو ئەشکەوتەکان. لە دەوروبەری شەقلاوەش، بۆ نمونە لە قەشان و حاجی بایز (سوێسکە و پۆڕ و سۆفیلکە) زۆر هەبوون.

(چۆلەکە)، لە شەقلاوە بە سوانکە ناوزەد دەکرێ، ئەم جۆرە باڵندەیە سەرەتا لە ناو شار زۆر کەم بوون و تەنیا لە گۆڕەتوەکەی تەمتەمان هەبوون. لە دواییدا لە چیای سەفین دابەزینە ناو شار و تاکو ئێستاش لە زۆر شوێنی ئەم شارە بەدی دەکرێن. بۆیەش پێیان دەگوترێ سوانکە، چونکە زیاتر لە ژێر گێ سوانی ماڵەکان هێلانەیان دروست دەکرد و ناوەکە لە سواندەکە سووك کراوە بۆ سوانکە. لە هەندێ شوێنی تری کوردستان ئێستاش هەر پێیان دەڵێن سواندەکە. چۆلەکەیەکی تر هەبوو پێیان دەگوت (خەزایی)، کە تەنیا پایزان بەدیار دەکەوت. (پەرەسێلکە و باران برە)یش تا ئێستا لە شەقلاوە هەن کە لە سەرەتای وەرزی بەهارەوە تا پایزانێکی درەنگ دەمێننەوە.

(گێرزولە)، جۆرە باڵندەیەکی تری بچووکی ڕەنگاڕەنگە، کە لە سەرەتای بەهار پێش هەموو باڵندەکانی تر موژدەی بەهاری پێ ڕادەگەیاندین و بە دەنگە خۆشەکەی دەستی بەخوێندن دەکرد. هەروەها ئەم باڵندەیە نێرە و مێیەکەی زۆر هاوکاری یەکتری دەکەن بۆ ئەوەی بێچوەکانیان بەیەکەوە گەورەبکەن. بۆ دابین کردنی خواردنیش، بە نۆرە و یەك بەدوای یەك خواردنیان بۆ بێچوەکانیان دەهێنا. هێلانەکەشیان لە ناوەوە بە موو و خوری ئاژەڵان دروست دەکرد، بۆ ئەوەی شوێنی بێچوەکانیان گەرم و نەرم بن. کونێکی بچووکیشیان دەهێشتەوە بۆ ئەوی قڕغو نەتوانێ بیچوەکانیان بخوا، بەڵام بە داخەوە زۆر جار دەم دی کە کە گێرزولەکە خۆی لە هێلانەکە دەهاتە دەرەوە، دەبووە نێچیری قڕغوەکان. گەلێك جار لەدیار گێرزولەکان دادەنیشتم و سەرسامبووم بە هەڵسوکەوتیان کە دەمدی یەکیان خواردنی دەدایە بێچوەکان وە ئەوەی تریش لەسەر پەلێکی نزیك و خواردن بەدەمەوە چاوەڕوانی ئەوەی تری دەکرد تا نۆرەی دەهات.

**لەوانەیە دەیان جۆرە باڵندەی تر لە شەقلاوە هەبووبن، بەڵام دەردی پیری زۆر شتی لەبیر بردووم.**

## ڕاو

لەبەر گرانی و کەمی گۆشت لە بازاڕ، بە ناچاری خەڵك دەبوایە ڕاوبکا. هەندێك ڕاویش هەر بۆ خۆشی یان بۆ پێستە دەکران. ڕاوی گەلێ ناژەڵ و باڵندەی جیاواز لە ناوچەی نێمە دەکران، من بەشی زۆری ڕاوەکانم کردوە. لەوانەیە لە شوێنەکانی تری کوردستان، هەمان ئەو جۆرە ڕاوانە بە شێوەیەکی جیاواز لە ناوچەی نێمە کرابن. هەندێ لە ڕاوەکان بە داو یان بە تەڵە و تفەنگ دەکران و هەندێکیشیان بە شێوازی زۆر سادە. من لێرە هەندێ لە ڕاوەکان باسدەکەم.

من بەخۆم نەمدیوە چۆن باڕوت دروستدەکەن، بەڵام باوکم چۆنیەتی دروستکردنەکەی لە ناوچەی شەقڵاوە بۆ گێڕامەوە، چونکە باڕوتی تفەنگ لە زۆر کۆنەوە هەرلە ناوچەکە دروست کرابوو. هەمان بابەتیشم لە زبێر ناغا بیستبوو. دەووترا کە ئەحمەدی ڕەشە دۆڵێ، یونسی مامەشینی و زبێر ناغا لە ئەشکەوتی حوجران و چل گەزی باڕوتیان دروست دەکرد.

چونکە مەڕ و ماڵات بەخێوکردن بەشێکی سەرەکی بووە لە ئابوری کوردستان و ژیانی ڕۆژانەی خەڵك، کەم دێهاتی کوردستان هەبوو کە ژمارەیەکی زۆر مەڕوماڵاتی تێدانەبێ. شاخ و کێوەکانی کوردستانیش پڕن لە ئەشکەوتی گەورە و لە دێر زەمانەوە وەك شوێنی حەوانەوەی مەڕ و ماڵات بەکارهاتوون، بەتایبەتی لە شەوانی زستان.

لە هاوین، پاشماوەی مەڕوماڵات لە ئەشکەوتەکان جۆرە کەڕۆ (بەکتریا)یەك لە شێوەی کەفێکی سپی هەڵدەدا. ئەو کەفەیان دەهێنا و دەیان کوڵاند. لە کاتی کوڵان چەوریەکی لێ دروست دەبوو و سەر ناوەکە دەکەوت. ئەو چەوریەی سەر ناوەکە دەگیرا و هیشکۆر (ووشك)دەکرا. بەرهەمە ووشککراوە کە باڕوتێکی ساف بوو و زوو گڕی دەگرت. بەشێك لەو بەرهەمە جیا دەکرایەوە بۆ تێز (زوو ناگرگر). لە کوردەواری ئەگەر تفەنگ چاك کاربکا، دەڵێن "تێز بەر تێزە". بەشەکەی تری باڕوتەکە لەگەڵ ڕەژووی داری بی تێکەڵ دەکرا، چونکە ڕەژووی بی سووکترە لە دارەکانی تر. دەبوایە تۆزەکە و ڕەژووەکە لە جۆنیەکی دار بەیەکەوە، بەڵام زۆر لەسەرخۆ بکوترێن، چونکە گەلێ جار ناگری دەگرت و زۆرجاریش دەم و چاوی کەسەکەشی لەگەڵ دەسوتا. پاشان تێکەڵاوەکە لە بلور دەکرا. فیشەکدانی تفەنگی ڕەشکە هەربلوور بوو، دەرمان و ساچمە و پەڕۆ، هەموو لەلای لوولەی تێدەکرا. من لەگەڵ باوکم و دۆستێکی چووینە ڕاو. باوکم نیشانچیەکی بەناوبانگبوو لە ناوچەکە و بەخۆی تفەنگێکی ماوزەری زۆرچاکی هەبوو، بەڵام کابرا تفەنگە ڕەشکەی پێبوو. بابم تفەنگی

کابرای وەرگرت، کاتێك تەقاندی، هەموو دەموچاوی هەڵزوران، دیاربوو تیزی کەمبوو.

چیای سەفین ئاژەڵی دڕندەی هەمە جۆری لێبوو، وەك هەرس(وورچ) و پڵینگ... سلێمان بەگ هەرسێکی کوشتبوو نزیکەی دوو سەویە بەزی لێ هێنابوونەدەر. ئەوکات ئەگەر ئەسپێکیش بتۆپیبا، بەزەکەیان دەهێنادەر و دەیان کرد بە سابوون. خۆرانیەکان بۆیان گێرامەوە کە لە پشت خۆران لە شاخی زەرد، شەوێك هەرس و پڵنگێك بە شەرهاتن و تا بەیانی دەنگیان دەهات. بەیانی کە چووین، پڵینگ هەرسی پارچە پارچە کردبوو، دیاربوو پشتی هەرسەکەی لە کەلێنی شاخ نابوو و هەرس دەرفەتی هەڵاتنی نەبوو.

لە ساڵانی پێشمەرگایەتی بەیارەکەی ئەحمەدی دۆێنێم بینی. ئەحمەد کە خەڵکی چنێران بوو، بەیارێکی زۆرجوان و گەورەی هەبوو لە ناوچەی کانی گێزی چیای سەفین. ئەحمەد بنە مێوەکی ترێی تایفی هەبوو کە چل تا پەنجا مەتر درێژبوو، چونکە لە کووشەی گرتبوو. ئەو مێوە، بیست تا سی بارە ترێی دەگرت! لە ساڵانی چلەکان من بۆ یەکەمجار مام ئەحمەدم لە چایخانەی مەلا قادر بینی، ئەوکات ئەو پیر ببوو، بەڵام کە بەدیار دەکەوت، خەڵکی دەیان ووت "ئەوە بوو پڵنگی کوشت". هەرلەو بینینەم لەگەڵ مام ئەحمەد، بۆی گێرامەوە کە تەلیە (تەلە)م لەناو بەیارەکەم دانابووەوە، بەیانی کە چووم ئەتەلیە مابوو ئەگەرەشك. من ئەمدەزانی بەدوای چ جۆرە ئاژەڵێك کەوتوم، بەڵام بە دوایی پێشونەکەی چووم. دیاربوو بردبویە پونگەرانەکەی لە دامێن کانی زیزنێی خواروی کەپکی کایسا، کە سێ گەروان لە کانی گێز دوورە! (پونگەران ئەو شوێنەی کە پونگی بە چڕی لێ دەڕوێ). ووتی کە نزیك بوومەوە، بۆم دەرکەوت کە نێچیرەکەم پڵنگە! من لە بەرزایی بووم و ئەویش لە خوارەوە. چاوەڕێمکرد تاکو نێوچاوانم دیتەوە و بەتفەنگی ڕەشکە فیشەکێکم لێدا، بەڵام نەکەوت! ووتی من بە پەلە هەڵاتم و خۆم شاردەوە. پاش کەمێکی تر دووبارە هاتمەوە و تفەنگەکی ترم لێدا، چاکبوو ئەمجارە کەوت و کوشتم.

من زۆرجار بۆ ڕاوکردنی ئاژەڵی کێوی، بەتایبەتی بزنی کێوی دەچومە سەفین. چەند ڕاوچییێك ڕێکدەکەوتین و زۆربەی کات تاریك و ڕونی بەیانی و هەندێك جاریش دوای نوێژی عیشا بە تفەنگەوە دەکەوتینە ڕێ. لەوێ لە شوێنی مەبەست و هەریەك بۆ نۆڕینگەیەك دابەش دەبووین. لە چاوەڕوانی نێچیر بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك دادەنیشتین، پاشان دەچووینە نۆرینگەیەکی تر. لە پێشدا شوێنی یەکترگرتنەوەی نێوارەمان دیارکردبوو، کە لە زستان لە یەکێك لە ئەشکەوتەکان و پایزانیش لەگۆراییێك دادەنیشن و ئاگرمان هەڵدەکرد. ئەگەر

یەکێکمان ناژەڵێکی ڕاوکردبا، ئەوا تا بەیانی بەقسەی خۆش و گۆشت خواردن کاتەکەمان بەسەردەبرد. بۆ بەیانی دووبارە ڕاو دابەش دەکرایەوە.

تاکو ۱۲۰ ساڵێك بەرلە ئێستا، ڕاوی ناژەڵی کێوی بە شێوەیێکی تایبەت لە ناوچەی ئێمە کراوە. باوکم لە باوکی خۆی بیستبوو کە لە ڕۆخ ڕێگاکان و لە چیا و لە شوێنێکی ڕاست، بەردی تەنك و پانیان لە تەنیشت یەك دادەنان و سەریان بە بەردی پان دەگرتن. لە شێوەی قەبر بەردەکان ڕیزدەکران بۆ نزیکەی مەتر و نیوێك درێژ و بەرزیەکەشی لەدەوری شەست سانتیمێك و بەرینیشی سی سانتیمێك. وەك سندوقێکی درێژی لێ دەردەچوو کە هەموو لایەکی قەپات بوو و تەنها لە پێشەوە دەرگای هەبوو. چیلە بەردێکیان لەسەر سەندوقە بەردەکە دەکرد بۆ ئەوەی قایم بێ. بەردێکی تەنکیش بۆ دەرگاکە لە سەروی چوارچێوەی دەرگاکە و لە کەلێنی دوو بەردی کۆتایی هەڵواسراوە، کە بە دارێك لەسەرەوەی کونی دەرگاکە زۆر بە هەستیاری گیرکراوە. پەتێکی بارێك لەو دارە بەستراوە و لەسەر سندوقە بەردینەکە ڕۆیشتوە تا کۆتایی، لەوێ لە کەلێنی بەردە پانەکانی سەرەوە شۆڕبۆتەوە خوار و دانەخۆرەیێکی وەك میوە یان گۆشتی پێوە هەڵواسراوە. کاتێك ناژەڵێك بەدوای خواردنەکە دەچووە ژورەوە، خواردنەکەی بە پەتەوە ڕادەکێشا. دارەکە لەبن دەرگاکە دەخزا و بەردەکەش دادەکەوت. ئیتر لە دواوە دەرگا لە ناژەڵەکە دادەخرا. خۆ و بەختی خاوەن تەڵە، هەرچی پێوەبوایە پێینەدەکرا لە شوێنی خۆی بجوڵێ. باپیرم گێڕابویەوە کە هەردوو لاقی دواوەی ناژەڵەکەیان دەسمتن و دەبەستنەوە. دواتر بە گوریسێکیان ڕادەکێشا دەرەوە. زۆرجار کەفتیار (کەمتیار) پێوەدەبوو. هەرچەندە کەفتیار زۆر دڕە، بەڵام کە لاقەکانی دەبەستران، هیچی پێنەدەکرا. ڕاوچیش گۆرانیان بۆ دەگوت "کەفتیار پیاوەکی چاکە، لاقانی نەسمن دەنگی ناکا". دوای ئەوەی تەڵەی ئاسن پەیدابووە، ئەو جۆرە ڕاوە باوی نەماوە.

لە شەستەکان، لەکاتی پێشمەرگایەتی، شوێنەواری ئەو جۆرە تەڵەیەم لەگەڵی شەمان بینی. لەو ڕێگایەی کە لە چیا سەردەکەوێ، چەندین تەڵەی لەوشێوەیە دانرابونەوە. من نمونەی ئەو تەڵەم بە شێوەیەکی بچوك دروست کردبوو و خەریك بووم لە بەرنامەی کەلەپور لەگەڵ ئەسعەد عەدۆ لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو پیشانی بینەران بدەم، بەڵام لەبەر ئەوەی بەعسیەکان بەدوام دەگەڕان، باشتروابوو لە شاشەی تەلەفزیۆن نەبیندرێم.

## ڕاوە بەراز

بەراز لە کوردستان ژمارەیان یەکجار زۆربوون و کارێکی ناستەم بوو ڕەزی بەیار و کشتوکاڵ بکەی، چونکە بەراز بە ڕەوە دەهات و زەرێکی زۆری دەکرد. کە ڕەوە بەراز دەهاتنە ناو ڕەزی مێوەکان، نەك هەر ترێیەکەیان دەخوارد، بەڵکو زۆر لە تووڵە مێوەکانیشیان دەشکاندن. بۆیە پەندێکی کوردی هەیە دەڵێ (لەبەر بەرازی، واز ناهێنین لە کرداری) یان (جۆت و گا، لەبەر بەرازی تەرك ناکرێ). لە کاتی منداڵیم کە شەوان ڕەوە بەراز دەهاتە ناو بەیاری ئێمە لە قەشانی پشت چیای سۆرك، زۆرجار لە لەگەڵ وەسمانی قادرە ڕەشی هاوڕێم، ناچار دەچوینە سەر ئەو دار کرۆسکەی کە لە ناوەندی بەیار کەپرمان لەبن کردبوو. چونکە بەراز لە دەنگی گەورە دەترسێ، دەمانکردە هات وهاوار و تەنەکەمان دەکوتان هەتا بەرازەکان بڕەونەوە. بەرازی ناوچەی ئێمە زۆر گەورە بوون و یەکانە (نێرە)کان ئەوەندەی جوانەگایەکی گەورە دەبوون. هەر بەرازەی سەویە ترێیەکی دەخوارد و ئەوندەی تریشی خەسار دەکرد.

بۆیە ڕاوە بەراز زۆر شتەکی باوبوو لە کوردستان و مەبەست پاراستنی ڕەز و باخەکان بوو. ڕاوەکەش یەکجارخۆش بوو. هەربۆیە، ئەگەر کەسێك زۆر بەکەیف و گاڵتەچی بێ، دەڵێن فلان کەس ( ڕاوە بەرازە). لە ئاینی مەسیحی گۆشتی بەراز حەرام نیە، بۆیە هەندێ جار برا مەسیحیەکان بەرازە کوژراوەکانیان دەهێنانەوە.

پاش ئەوەی ئینگلیز عێراقی داگیر کرد و دەوڵەتێکی نوێی دامەزراند، شارەکانی ئەو وولاتە گەشەیەکی خێرایان بەخۆوە بینی. لە پڕ شارەکان پێویستیەکی زۆریان بە سوتەمەنی بوو، چونکە نەوت و غازیش هەر بۆ بێگانەکان بوو، بە ناچاری ڕەژوو بووە ووزەی سەرەکی بۆ چێشتخانە و ماڵەکان. لە ساڵانی سی و چلەکانی سەدەی ڕابردوو و بەرلەوەی ڕەژوو بە شێوەیەکی بەرفراوان دروستبکرێ، کوردستان زۆر بە دار و بار بوو. بەراز لە تەلان و شوێنی سەخت خۆی حەشاردەدا کە مرۆڤ نەگەیشتبایێ، شاخ وداخی کوردستان و دەم ڕووبار و چەمەکانیش، حەشارگەی زۆر چاك بوون بۆ بەراز.

بەرای خۆم، ڕەژووکردن گەرمترین زیانی بە ژینگەی کوردستان گەیاند. من کە دەچومە کاروان لە شەقلاوە هەتا مەلانۆمەر هەمووی داروبار بوو. پلەی گەرماش نزم بوو وە بەفر و باران زیاتر دەباری. کە ڕەژووکردن دەستیپێکرد، بەماوەیەکی زۆر کەم نەك هەر داروبارەکە بڕدرا، بەڵکو کۆلکەکانیشیان دەرهێنان و جارێکی تر ئەو دارانە نەژیانەوە.

بۆ ڕاوکردنی بەراز. سەگ بەکاردەهێنران. سەگەکان فێری ڕاوەکە دەکران و گۆشتی بەرازیشیان دەدانێ، ئەوکاتانەی کە خاوەنەکەی تفەنگی لەشان دەکرد، سەگەکە پێشی دەکەوت و ئامادەبوو بۆ ڕاو. ئەو بەرازەی کە دەکوژرا، گوێکانیان دەبڕین و وەك ملوانکە لەملی سەگەکانیان دەکردن، بە مانای ئەوەی ڕاویکردوە.

ماوەران و سەرکەند و زیبارۆك بەردەوام شوێنی ڕاوە بەراز بوون و بەرازێکی یەکجار زۆریان لێبوو. هەروەها خەڵکی بۆ ڕاوە بەراز ئەچوونە ناقوبان و چنێران و سپیگرە. ئەو ڕاوە تاکو ساڵانی پەنجاکان زۆر باوبوو، بەڵام لە پەنجاکان کابرایەکی ئاغا لە دەربەندی شەقڵاوە لەکاتی ڕاوە بەراز کوژرا. پاش ئەو ڕوداوە، ڕاوە بەراز لە ناوچەی نیمە نەما. هەروەها لەبەر کەمبونەوەی دەحر و داریش بەتایبەتی لەو سێ ساڵەی دواییدا، شوێنی حەوانەوەی بەراز لە ناوچەکە کەم بوو. دواتریش بەهۆی زۆربوونی چەك بەدەگمەن نەبێ بەراز لەناوچەکە نەما. بەڵام بەراز زۆر بە زاوزێیە و جاران دەووترا کە زۆرجار مێینەی بەراز ١٢ فەرخەی دەبوون. پەندێکی کوردی دەڵێ: "چواری چێڵێ، هەشتی دێرێ، ١٢ی بەڵە چێڵێ". بەمانای هەریەك لە مانگا و سەگ و بەراز ٤، ٨، وە ١٢ گوانیان هەن. بۆیە کاتێك دوای ئەنفالەکان و لە ماوەی سێ ساڵ، لە ١٩٨٨ تا ١٩٩١، کە دێهاتەکانی کوردستان بەزۆر چۆڵکران و بوونە ناوچەی قەدەغەکراو، بەراز بە ڕێژەیەکی یەکجار زۆر لە کوردستان زیادی کردەوە، بەتایبەتی لە دۆڵی هیران و بالیسان.

سەگەکان وەپێش ڕاوکەرەکان دەکەوتن و بە ڕەوین بن دڕك و دارەکانیان دەنۆڕی. کاتێك کە بەرازیان دەدیتەوە، سەریان لەدوو بەراز دەنا. ئەگەر بەراز لە حوکمی تفەنگ بوایە، تفەنگیان تێدەگرت، ئەگەرنا سەگ هەرلە دوای بوو. بەراز ناتوانێ ناوڕبداتەوە دواوە، یان گورج بسوڕێتەوە، چونکە ملی زۆر کورتە. هەروەها بەشێك لە کۆئەندامی نێرینەکەی لەدواوە و لەبن کلکیەتی. هەربۆیە، سەگ ئەو بەشەی بەرازی لەدواوە دەگرت و لەگەڵ بەرازەکە دەڕۆیشت هەتا لە پەلوپۆی دەخست. هەندێ جاریش کە سەگەکان زۆر لە بەراز نزیك دەبوونەوە، بەراز دەغەزری و پاشەڵی خۆی بە دارێك، بەردێك، یان بە کەنارێك وەدەنا تا سەگەکە دواوەی لێنەگرێ. بەرازی ناوچەکە دوو ددانی تیژی گەورەیان لە پێشەوە هەبوون، کە پێیان دەووتن گیرە. کاتێ بەرازەکە دەغەزری، تاوی دەدا سەگەکان. بەراز ئاژەڵێکی زۆر بەغارە و لەبەر کورتی ملەکەی ڕێك غاردەدا، بۆیە دەڵێن "تیرەی بەست". کاتێ سەگ یان هەر شتێکی تر لە کاتی تیرە بەستندا دەکەوێتە پێش بەرازەکە، بە لموزی

فڕێیدەدا و بەگیرەگانی هەڵیدەدڕێ. من پیاوێکم دی کە لە گوندی باتاس بەراز لێیدابوو و بۆ چارەسەر هێنابوویانە شەقڵاوە، لە کاتی لێدانەکە چەند مەترێك فڕێیدابوو. ئەوکات قوماشێکی زۆر دەکرایە پشتێن، بەڵام بەراز گیرەکانی لە پشتێنەکە گیرکردبوو و بە چۆغەڵ و وڕانکەوە هەمووی هەڵدڕیبوون. هەروەها هەردوو ئێکی کابرای تا سەر ئێسکی بریندار کردبوون، بەڵام نازانم لە دوایی ئەو کەسە چی بەسەرهات.

## ڕاوە ڕێوی

کاتی خۆی ڕێوی لە کوردستان گەلێ زۆر بوون. هەرچەندە گۆشتی ڕێوی بۆن دڕی لێدەهات، بەڵام هەندێ خەڵك گۆشتەکەیان هەردەخوارد. ڕێوی بە چەند جۆری جیاواز ڕاودەکرا، هەندێ لەو جۆرانە تام وچێژێکی تایبەتیان هەبوو. لە زەمانی منداڵی من نرخی پێستی ڕێوی زۆر بەرز بووەوە. چونکە خەڵکیش زۆر هەژار بوو، ڕاوی ڕێوی بووە پیشەیێکی گەورە. ئەوکات ئەگەر چووبایە ڕواندوز یان هەولێر، زۆربەی دوکانەکان چەندین پێستە ڕێوی لەگەڵ پێستی دەرەك و گورگیان هەڵواسیبوون. شایانی باسە، پێستی گورگ بۆ دەهۆڵ بەکار دەهێنرا، پێستەکە کەوڵ دەکرا، کایان تێدەکرد تا ووشك دەبوو، ئینجا دەیان برد بۆفرۆشتن.

باوکم دەیگێڕایەوە کە بەرلە جەنگی جیهانی یەکەم، کەوڵە ڕێوی ئەو بەهایەی نەبوو. دیارە ئەو جۆرە کاڵایانە دەچونە بازاڕی ووڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکا، بۆ دروستکردنی فەروە و جلوبەرگە تایبەتەکان. ئەوان بۆ خۆشی و جوانی ووڵاتی خۆیان، ڕاوکردنی ئەو ئاژەڵانەیان هەرلە کۆنەوە سنورداركردوە. ئەوە بۆتە هۆکار کە بەدوای پێستی ئاژەلە کێویەکانی ووڵاتانی تر بگەڕێن و بازاڕی پێست ناوچەی ئێمەشی گرتۆتەوە. بەداخەوە ئەم هۆکارە وایکردوە کە زۆربەی ئەو ئاژەڵانە لە ناوچەی ئێمە، ئەگەر لەناویش نەچوبن، زۆر کەمیانکردوە.

جۆرێکی ڕاوی ڕێوی بە تەلیە دەکرا. تەلیەش دوو پارچە ئاسنی کەوانەیی بوون کە بە سپرینگێکی زۆر قایم وێکهاتبوونەوە و لە پارچە پلێتێکی پان و پازنەیی قایم کرابوون. کە تەلیەکەت دادەنایەوە، دوو پارچە ئاسنەکەت لێکدەکردنەوە و تێلێك هەردوو پارچە کەوانەکانی دەگرتن. پارچە بەزێك یان گۆشتێکت بە پارچە بچوکەکە وەدەکرد و تەلیەکەت بە خۆڵ دادەپۆشی، بەجۆرێك تەنها خواردنەکە بە دەرەوەدەما. هەروەها تەلیەکەت بە پەتێك لە قەدە دارێك دەبەستەوە، کە لەلای ئێمە پێیان دەووت گەرەشك، بۆ ئەوەی ڕێوی

نەتوانێ تەڵیەکە لەدوای خۆی ڕابکێشێ. پەندێکی لای ئێمە دەڵێ (ڕێوی بەخۆی بە کونێ وەنەدەچوو، گەرەشکێشی لەدوا بوو). کە ڕێوی یان هەرناژەڵێکی تر گەزی لە خواردنەکە دەگرت، پارچە تێلە گچکەکە لێ دەترازا و کەوانەکان وێکدەهاتنەوە و ڕێویەکە پێوەدەبوو، بەڵام چونکە خێراییەکە یەکجار زۆربوو، هەندێك جار لاقی ڕێویەکانی قەد دەکرد. من زۆر جار ڕێویم دەبینی کە لاقێکی پێوە نەبوو.



تەڵەیەکی کۆن

جۆرەکی تری ڕاوی ڕێوی، لە شوێنە کەندارەکان لە کونە ڕێویەکانیان دەکۆڵیەوە. ڕێوی چەندین کون لێدادا بۆ شوێنی هێلانەکەی. سەرەتا هەموو کونەکانیان دەگرتن و خۆڵەکەیان لادەبرد تا دەگیشتنە ڕێوی، ئینجا بە دارێك لێیاندەدا و دەیانخست. هەندێ جاریش کونەکەیان دەدۆزیەوە و بە کەدەدارێکی بە پەڵك، دەورو پشتی کونەکانیان دەماشت(دەماڵی) و خۆڵەکەیان ڕاستدەکرد، تابزانن هاتووچۆی تێداهەیە یان نا. ئەگەر کونەکە هاتوچۆی تێداهەبا، هەندەك کایان دەبرد لەگەڵ توولە و تاژی. لە پێش کونەکە ئاگریان بەردەدا کایەکە و باوەشێنیان لێدەکرد تا دووکەڵ بچێتە ژوورەوە. ناچار ڕێوی دەردەپەڕی و توولە و تاژیش دەیانگرت.

جۆرێکی تری ئەو ڕاوە، هەربە توولە وتاژی بوو. ڕاوکەرەکان لە چۆم و ناو دار و دڕی دەگەڕان. توولە و تاژیەکان فێردەکران کە بەرەوین لەو شوێنانە نزیك ببنەوە. ڕێوی لە ترسان هەڵدەستا و تاژیەکان دەیانگرتن.

بە داخەوە لەگەڵ بەقیمەت بوونی کەوڵە ڕێوی، جۆرێکی تری نەشیاو لە ڕاوە ڕێوی پەیدا بوو. لە لەساڵانی سیەکان، جۆرێك زەهیر لە ئێران دەهات. ئەو زەهیرە لەگەڵ هەویر، گۆشت...تێکەڵ دەکرا و لەسەر ڕێگای ڕێویان دادەنا. هەرچی گیانەوەر هەیە بیخواردبا، بیست مەترێك دەڕۆی و ڕەنگی شین هەڵدەگەڕا و دەمرد. بەداخەوە ئەو دەرمانە زەرەری زۆری بە کوردستان

گەیاند و زۆربەی ئاژەڵە کێویەکانی کوشتن. نەك تەنها ئەو ئاژەڵەی دەکوشت کە زەهیرەکەی دەخوارد، بەڵکو هەر ئاژەڵێك یان باڵندەیەکیش ئەو ئاژەڵە مردووەی خواردبا، ئەویش دەمرد.

## ڕاوە کەروێشك

کەروێشك بە شێوازی جیاواز ڕاودەکرا، وەك تەڵیە، تاژی، گەڕان بە دوای پێشوونی لە ناو بەفر و ئینجا بەتفەنگ یان تاژی یان بەدار ڕاودەکرا. زۆر جار کۆمەڵێك ڕاوچی بە سواری ئەسپ دەچوونە ڕاو. کە سوار دەوری کەروێشکیان دەگرت، ئەو بەستەزمانە چاوی خۆی دەنوقاند و خۆی ماتدەکرد، ئەوانیش بە دارلاستیك ڕاویاندەکرد.

جۆرێکی تر لە ڕاوی کەروێشك هەبوو کە چوار تا پێنج سوار لە زەویەکی پڕپوش ڕیزدەبوون. شەش مەترێك بۆشایی لە نێوان هەریەکەیان جێدەهێڵا و تاژی و شوە دارێکی چەند مەتریان لە دەست دابوو. هەرسوارە و سێ مەتر ئەوبەر و ئەوبەری خۆی تەماشادەکرد و دەڕۆیشتن. کە سوارێك کەروێشکی دەدۆزیەوە، ئەوانیتر دەهاتن و بە گۆرانی دەورەی کەروێشکیان دەدا و دەمێك یاریان لەگەڵ دەکرد. دارەکەی دەستیان لە کەروێشك نزیك دەکردەوە، بۆ ئەوەی لە شوێنی خۆی بجوڵێ. ئەویش مەودایەك دەڕۆیی، ئینجا تاژیان بەردەدایێ. ئەو ڕاوکردنە و حەپەی تاژی لەدوای کەروێشك، کە گەلێ جار نێوانیان تەنها بستێك دەبوو، لەزەتێکی خۆشی هەبوو بۆ ڕاوچیەکان. خۆشیان بە سواری ئەسپ بەدوایانەوە بوون و هەرهاواری تاژیان دەکرد کە کەروێشك بگرێ.

## ڕاوە ماسی

ئەوکات قومبلە و دەرمان و داو نەبوو بۆ ڕاوکردنی ماسی. پایزان کاتێك ئاو کەم دەبوون، ڕووباری ڕوسارك و ماوەران گۆمی گەورەی لێ پەیدا دەبوون. کۆمەڵێك کەس ڕێکدەکەوتن و شویان بە شێوەیەك لێك دەبەستن کە وەکو لولەکێك بوو و تیرەکەی مەترێك دەبوو، بەڵام چەندین مەتر درێژبوو. یان بە گوێرەی گۆمەکەی درێژیان دەکرد. دڕی و دار و چیلکیان دەنێوان دەنان. ئەوکات چوغەن زۆربوو و دەیان هاویشتە ناوی. بەوشتەیان دەووت "مەیت". لەسەروی گۆمەکە ئەو دارەیان گەوزدەدا، هەر زەلامەو نزیکەی مەترێکی لەبەین بوو. بە گلۆرکردن دەیانگەیاندە ئەوبەری گۆمەکە. ماسیەکان لەپێش

مەیتەکە هەڵدەهاتن، بەڵام لەکۆتایی گۆمەکە، ناوەکە دەگەڕاوە دوواوە و ماسیەکانیش دەکەوتنە تەنکەناوەکە. ئەوەی گەورەبوو لێیان دەبژارد و ووردەکانیشیان لە گۆمەکە دەکردنەوە بۆ جارێکی تر.

## ڕاوە کەو

ڕاوە کەو لە هەموو جۆرە ڕاوێك باوتربووە لە کوردستان. ئەو باڵندەیە هەر لە بنەڕەتدا لەو زنجیرە شاخانە ژیاوە کە لە یۆنانەوە هەتا پاکستان درێژ دەبنەوە و کوردستانیش کەوتۆتە ناوەڕاستەکەی. هەربۆیە، لە کوردستان کەو وەك باڵندەیەکی نیشتمانی سەیر دەکرێت. کەو تەنها لە ناوچە شاخاویەکان دەژی و بە زستانان دێتە دامێنی ئەو شاخانەی کە بەفریان زۆر لێدەباری. کەو نزیکەی سەد ساڵێکە هێنراوەتە ئەمریکا و زۆریش بڵاوبۆتەوە.

کەو بە زۆر ڕێگای جیاواز ڕاو دەکرێ، وەك داو، تەپکە، دێوجامە، تۆڕ. هەروەها شێوازی تایبەتیش هەن بۆ ڕاوکردن لەکاتی بەفربارین. زاوزێی کەو لە وەرزی بەهارە، کە ساڵی جارێك هێلکە دەکا و بارەکەو هەڵدێنێ. کەو لە مانگی چوار دەست بە هێلکەکردن دەکا، بەڵام لە کوێستان هەتا بەفر نەتوێتەوە، دەست بە هێلکەکردن ناکا و من نەمدیوە لە ١٦ هێلکە پتر بکا. لەو کاتانە کەو جووت دەبێ و نێرەکەویش زۆر خورتە، حەزدەکا هەموو کاتەکەی لەگەڵ ماکەوەکەی بەسەرببا. بۆیە کاتێك کە ماکەو لەسەر هێلکەکان کورك دەبێ، نێرەکەو وەك دێوانەی لێدێ و هەرلەسەر بەردان بۆ ماکەو دەخوێنێ. ئەگەر هێلانەی ماکەویش بدۆزێتەوە، ئەوا هێلکەکانی لێدەشکێنێ. بۆیە ماکەو دەبێ هێلانەکەی لە شوێنێکی وا دروستبکا کە نێرەکەو شکی پێنەبا. ماکەو کە دەیەوێ هێلکەبکا، هەوڵدەدا لە شوێنی هێلانە نزیك بێتەوە، ئینجا خۆی لە نێرەکەو بزردەکا و هەرلەوێ خۆی ماتدەکا. نێرەکەو شێتی دەبێ، لەوبەرد بۆ ئەوبەرد دەست بە خوێندن دەکا. کاتێك ماکەو دەرفەت دەبینێ، بە خێشکەیی دەچێتە سەر هێلانەکەی، چونکە ئەگەر بەفڕین بڕوا، نێرەکەو دەیبینێ و دوای دەکەوێ.

ڕاوچیەکان لەو وەرزەدا ماکەوێکی ناو قەفەز دەبەنە چیا و لەو شوێنانەی نێرەکەو دەخوێنن، ماکەوەکە لەناو تەڕاشێك دەشارنەوە و داو لەهەر چواردەوری دادەنێن. کەو باڵندەیەکی زیرەك و ووشیارە کە بە ئاسانی داو دەبینێ، بۆیە دەبێ شوێنەکە هەندێ گیای لێبێ و داوەکە لەناو گیا بزربکرێ. داوەکان لەسەر ئەرز دادەنرێن و تەنها بە پێ بە داوەوەدەبێ. ئەگەر کەوێك

خۆی لە داو نەدا، دەڵێن "کەوێکی کەمۆیە". ووشەی کەمۆ بۆ کەسی شارەزا و زۆرزان بەکاردێ. زۆر جار پتر لە نێرە کەوێك پەیدا دەبێ و دەبێتە شەڕیان لەسەر ماکەوەکە. لەو کاتانە زۆر بیر لە داو ناکەنەوە و ئاسانتر بە داوەوەدەبن.

جۆرێکی تری ڕاوی کەو پێی دەڵێن کەوڕووبار. نێرە کەوێکی شەڕ دەهێنن و سنگ(سومبە)ەکی داری بۆ دەچەقێنن، کەوەکەی بە داوێکی تایبەت لێدەبەستنەوە. ئەو داوە لەو سنگەی ئاناڵێ، هەرچەند کەوەکە بسوڕێ، داوەکەش لەگەڵ ئەو دەسوڕێ. لە هەر چوار دەوری کەوەکەش داو دادەنێنەوە، ئیتر نێرەکەو بۆ شەڕی دێن و بە داوەوەدەبن.

لەو جێگایانەی کە کەوی زۆربێ، بە تەپکەش ڕاودەکرێ، چونکە لە زستان کەو بە ڕۆژ لە چیا دێتە خوار و بەشەو سەردەکەونەوە. شەوان دەچنە بن تاوێرە بەردێك کە با و باران نایگرێتەوە، هەروەها ڕێویش بە ئاسانی نەیگاتێ.

جۆرێکی تری ڕاوە کەو لە ناوەندی هاوین و کاتی دەرکەوتنی ئەستێرەی گەلاوێژ، لەسەر گۆمە ئاوە گچکەکانی سەر شاخان دەکرا. ئەوکات ڕۆژ گەرم دەبن و ئاوەکانیش کەم دەبنەوە. بەشی زۆری ئاوەکە دادەپۆشن و تەنها جێگایەك دەهێڵنەوە. ئەو کاتەی ساڵ، کەو زۆر پێویستی بە ئاوە و بارەکەوەکانیش گەورەبوون و بە ڕەوە دێنە سەر ئاو. ئەو شوێنەی دانەپۆشراوە، داو یان تۆڕی لێدادەنرێ. تۆڕەکە لە چوارچێوەیێکی ئاسن گیراوە کە سپرینگێکی لە ناوەڕاستەوەیە. چوارچێوەکە لێك دەکرێتەوە و دارێك لەنێوان هەردوو بەری چوارچێوەکە دادەنرێ، کە سەرێکی پەتی لێبەستراوە و سەرەکەی تر لەدەستی ڕاوچی. هەندەك پوش و پەراش دەخەنە سەر تۆڕەکە هەتا دیارنەبێ. ڕاوچیش لە شوێنێکی نزیك بۆی دادەنیشێ و خۆی جوان حەشاردەدا. کاتێ کە ڕەوەی کەو بۆ ئاو خواردنەوە دێن، ڕاوچی پەتەکە ڕادەکێشێ و هەموو ئەو کەوانە دەگرێ کەلەسەر تۆڕەکەن.

جۆرێکی تری ڕاوی کەو لە کاتی بەفر دەکرێ. ئەگەر برێکی زۆر لە بەفری ووشك (کەم ئاو) بکەوی، کەو دێنە خوارەوە بۆ دەم ڕووبار و دەشت، وەك دەشتی هەریر و دەربەندی شەقڵاوە. سی تا چل کەس ڕاوەکە دابەش دەکەن و لە زۆربەی گرد و بەرزاییەکانی ناوچەکە دابەش دەبن. کەو زۆر دوور نافڕێ، بۆیە ڕەوە کەو لەلایەك دەفڕێنن و دەچێتە نزیك ئەوانی تر. چونکە بەفرەکەش ووشك و سوکە، لەکاتی هەڵنشینەوەیان دەکەونە ژێر بەفر. کەوەکان ناتوانن

دەم و دەست لەبن بەفر بێنە دەرێ و بەئاسانی دەگیرێن. دواتر ڕاوچیەکان کەوەکان دابەش دەکەن.

جۆرەکی تری ڕاوی کەو بە دێوجامە و ساچمەبوو. دێوجامە پارچە قوماشێکی ڕەش و سپیە، وێنەی پشیلە و مار و شتی تری ڕەنگاوڕەنگی لەسەر دروست دەکرێ. قوماشەکە نزیکەی مەترێك بەرینە و نزیکەی مەتر و نیوێکیش درێژە. بە درێژی لە دوو داری باریك و سوك دەدرێ و یەك داریش لە ناوەڕاست کە هەردوو دارەکەی تر بەیەکەوە دەبەستێتەوە. لە ناوەڕاستی داری ناوەند جێی دەستی ڕاوچی خۆش دەکەن. قوماشەکە دوو کونی لە ڕاستی چاوەکانی ڕاوچی تێدانە و کونێکی تریش بۆ لولەی تفەنگ. چونکە ڕەوەکەو پێویستە بۆ ئەم ڕاوە، بۆیە لە وەرزی جووت بوونی کەو ئەو جۆرە ڕاوە ناکرێ. کاتێك ڕەوەکەو لە دورەوە دەستنیشان دەکرێ، ڕاوچی لێیان نزیك دەبێتەوە، ئینجا دێوجامەکە بەدەستی خۆی دەگرێ و خۆی دەداتە پەنای. چونکە کەو نازانێ ئەوە چیە نزیك دەبێتەوە، دەترسێن و هەموو دەچنە پاڵ یەکتر و دەست بە چغە چغ دەکەن. دوو دارەکان ژێریان تیژە و ڕاوچی هێواش دێوجامەکە دەچەقێنێ و تەقەیان لێدەکا. زۆرجار کۆمەڵێ کەو دەکوژێ. ڕاوی پۆڕیش بەهەمان شێوە دەکرا. شایانی باسە پۆڕ بە تەپکە و ساچمەش ڕاودەکران. چونکە پۆڕ تەنها دەتوانێ دوو کورتە فڕین بکا و دواتر دەبێ هەربەپێ ڕابکا، زۆرجار کۆمەڵێك ڕاوچی دەورەیاندەدان و بەدەست دەیانگرتن.

دوای پەیدابوونی لۆکسی ئەوت، ئەویش کرا بە ئامرازێك بۆ ڕاو، چونکە کەو لە ڕووناکی ناڕەوێتەوە. لەو شوێنانەی کە کەوی زۆربێ، ئێواران ڕاوچی دەچوونە سەر شوێنێکی بڵند و تەمەشایان دەکرد کەو لە کوێ کۆدەبنەوە و جێگایان دیاری دەکرا. شەو ڕاوچی لۆکسیان دەهێنا و پارچە کارتۆنێکیان لەبەری لای خۆیان گیردەکرد، بۆ ئەوەی تاریکی لەخۆیان بکەن و پێش خۆیان ببینن. لە کەوەکان نزیك دەبونەوە و بە دارێکی پان لە تەنیشتێك لێیان دەدان و کۆمەڵێکیان دەخستن.

## ڕاوە سوسکە

سوسکە (سوێسکە) هەر لە هەمان خێزانی کەوە و لە زۆر شوێنی کوردستان پێیدەڵێن کەوی زیخان. بەڵام سوسکە وەك کەو لە کوێستان ناژی. تۆزێکیش لە کەو بچوکترە و ڕەنگی قاوەیێکی کاڵە کە لەگەڵ ژینگەکە دەگونجێ کە تیایدا دەژی. تامی گۆشتی سوێسکە لەوەی کەو خۆشترە، بەڵام دەنگی ئەوەندەی کەو

خۆشنیه. هەروەها وەك كەویش ووشیارنیه و زۆر بە ئاسانتر ڕاو دەكرێ. ڕاوی سوسكە سەرچاوەیەكی باشی گۆشت پەیداكردن بووە لە زۆر شوێنی كوردستان. شارەزایی من لەم ڕاوە، لە هەموو ڕاوەكانی تر زیاترە، چونكە نەك هەرمن، بەڵكو باوكیشم ئەو ڕاوەی دەكرد. هەروەها محەمەد و ئەسعەدی كوڕیشم فێری ئەو جۆرە ڕاوە كردبوون. ڕاوی سوسكە وەك ڕاوی كەو بە چەند جۆری جیاواز دەكرێ و جگە لە هەندێ جیاوازی بچوك نەبێ، بەشێكیان بەهەمان شێوە دەكرێن، وەك بەكارهێنانی داو تۆڕ و لۆكس...

لە پایز و زستان، ڕاوچی لە شوێنی تەمۆخ و سۆرك یان شێنك تەپكە دادەنێنەوە. قۆرتێك لێدەدەن و هەرچوار دەوری بە بەرد دەگرن. بەردێكی تەنك و لوس دەهێنن كە بەقەدەر بەرینی قۆرتەكە گەورەتربێ و سومبەیێكی لەسەر قۆرتەكە دەدەنەبەر. دارێكی دوولك لەمبەر بۆ ئەوبەری كونەكە ڕادەهێڵن بەجۆرێك كە بە حاڵ لە سومبەكە گیركرابێ. هەندێ دانەوێڵەش لە قۆرتەكە دەكرێ. كاتێك سوسكە دەچێتە سەر دارە دوولكەكە، سومبەكە دەجوڵێ و بەردەكە دەكەوێتە سەر قۆرتەكە، ئیتر سوسكە پێوەدەبێ.

وەك كەو، زاوزێی سوسكە لە وەرزی بەهارە، لە دەوروبەری مانگی پێنج هێلكە دەكا و فەرخە هەڵدێنێ. من جارێكیان ٢٦ هێلكەم لە یەك هێلانە بینین. بەر لەو كاتە، سوسكە جووت دەبێ و نێرەكەی وەك كەو زۆر خورتە و حەزدەكا هەموو كاتەكەی لەگەڵ مێیە جووتەكەی بەسەرببا. سوسكەش وەك كەو، كاتێ كە مێیەكەی لەسەر هێلكان كورك دەبێ، نێرە سوسكە شێت و سەرگەردان دەبێ و هەردەچێتە سەر بەرزایی و بانگی مێیەكەی دەكا. ئەگەر هێلانەش ببینێتەوە، ئەوا هێلكەكان دەشكێنێ. بۆیە مێیەی سوسكە، وەك ماكەو دەبێ هێلانەكەی لە شوێنێكی وا دروستبكا كە نێرەكەی پێینەزانێ. مێ سوسكە هەموو ئەو ڕەفتارانەی ماكەو دەكا، هەتا دەگاتە هێلانەكەی، بۆ ئەوەی نێرەكەی هەستی پێنەكا.

دەبێ ڕاوكەری سوسكە، مێ سوسكە بەخێوبكا و ئەو كاتە ڕاوی پێبكا كە مێیەكان كورك دەبن. قەفەزی مێ سوسكە لەناو هەندێ پرچك یان تەڕاش دەشارنەوە و داو دادەنێنەوە. نێرەكان لە خۆشی دەنگی مێیە، ناگایان لەخۆ نامێنێ و بەرەو ئەوێ دێن. داوی سوسكە جیاوازە لە داوی كەو. داوەكە بریتیە لە بەنێك كە لە شێوەی كەزی چندراوە و دوازدە قافی بازنەیی لە تەنیشت یەك لەشێوەی قەنارەی سێدارە پێوە هەڵواسراوە. بەنە سێ لكیەكە لە دوو سنگ دەبەسترێ، سنگێك لەبن تەڕاشەكە دەكوترێ و سنگەكەی تریش نیو مەترێك لەولاتر و داوەكە لەنێوان هەردوو سنگەكە شۆڕدەبێتەوە. كابرای ڕاوچی پازدە

مەترێك لە نزیك ئەوێ خۆی حەشاردەدا، بەڵام دەبێ شوێنی داوەكەی لێدیاربێ. ئەگەر لەیەك نێرە زیاتر لە دەنگەكە نزیك بوونەوە، ئەوا لە نێو خۆیان بەشەردێن و یەكێكیان ئەوانیتر دەبەزێنێ. ئەوەی مایەوە بەدوای مێیەكە لە دەوری شوێنەكە دەسوڕێ. كاتێك دەگاتە داوەكە، سەری لە بازنەیێك گیردەبێ. ڕاوچی بەپەلە هەڵدەستێ و سووسكەكە لە داو دەكاتەوە و دووبارە داوەكە چاك دەكاتەوە. زۆرجار ڕاوچی ناگاتەوە شوێنی خۆی، كە سوسكەیەكی تر پێوە دەبێ. جارێكیان من لە بەیانی زوو تا ڕۆژ گەرمبوو، ٢٧ سوسكەم گرت و لە ترسی بۆگەن بوون نەمتوانی زیاتر بمێنمەوە. زۆرجار بۆ ئێوارەش جارێكی تر دەچوومەوە. ماوەی ڕاوە سووسكە مانگێك تا مانگێك و دە ڕۆژ دەبێ و لە كۆتایی مانگی پێنج دەستپێدەكا، دواتر ڕاوەكە سارد دەبێ. لە كاتی لاوێم كە ڕاوی سوێسكەم زۆردەكرد، ئەگەر شەو ئەگەڕابامەوە ماڵ و لە ماڵێك بمابامەوە، بۆ بەیانی سوێسكەی ڕاوەكەم زویردەبوو و ئەیدەخوێند، ئیتر ڕاوم پێنەدەكرا، چونكە دەیزانی لە ماڵی خۆی نیە و لە شوێنێكی غەریبە.



سوسكە

دەنگی مێ سوسكە دەتواندرێ بە ئاسانی لاسایی بكرێتەوە. ئەگەر ڕاوكەر شارەزابێ، دەتوانێ بە هەلمژینی پوشێكی كۆن و كورتی سێ تا چوار سانتیمەتر، وەك دەنگی مێ سوسكە بخوێنێ و شوێنی سوێسكەكان دەستنیشان بكا. لە كۆتایی ساڵانی حەفتاكاندا، تەسجیل یان ڕیكۆردەر پەیدا بوون و دەنگی مێ سوسكە لەسەر كاسێت ڕیكۆرد دەكرا. ئیتر ڕاوە سوسكە لە جاران ئاسانتر بوو وە خەڵكێكی زۆر دەستیان بەڕاوكردن كرد. ئیتر پێویست بەوە ئەما مێ سوسكە بەخێوبكەی كە ناخۆ لە گانگای ڕاو بۆتدەخوێنێ یان نا. بەڵام ئەم جۆرە ڕاوە هیچ تام وچێژێكی جارانی ئەما و ژمارەی سوسكەش بەڕێژەیەكی بەرچاو كەمیكرد.

## ڕاوە قاژوو

هەر جۆرێکی ڕاو تام و چێژێکی تایبەتی هەیە، بەڵام لەوانەیە ڕاوی قاژوو لەزەتی لە ڕاوەکانی تر پتر بێ. ڕاوە قاژوو لە ناوچەی شەقڵاوە زۆر لە کۆنەوە دەکرا. ناوچەکە لە زستانان زۆر بێ بەروبوم بوو و خەڵکەکەشی کەم دەرامەت و بێ کار بوون، بۆیە ئەم ڕاوە سەرچاوەکی باشی گۆشت پەیداکردن بوو.

قاژوو لە خێزانی قەلەڕەشە و ئەوانیش چەند جۆرێکی جیاوازیان هەیە، هەندێکیان بچوکن و بەزۆری لە دەشتەکان دەژین و لەوێ بە تۆڕ ڕاو دەکرێن. ئەمانە لە زۆر شوێن پێیان دەڵێن ڕیشۆڵە و لە دەورو پشتی شاری هەولێر زۆر ڕاو دەکران و لە زستانان بە مەنجەڵی گەورە دەکوڵان و لە بازاڕ بە ناوی "کێشکەی کوڵاو" دەفرۆشران. جۆرێکی تریان تۆزێك گەورەترن و بە زۆری لە کونە شاخ و ئەشکەوتان ژیان دەبەنەسەر، بەمانەش دەڵێن "قاژ" یان "میرقاژوو" واتا گەورەی قاژووان. ئەو قاژووەی لە ناوچەی ئێمە هەبوون زۆر گەورەترن لەو دوو جۆرەی سەرەوە، لەوانەیە ناوەکەشیان لە دەنگەکەیان هاتبێ، چونکە بە کۆمەڵ دەفڕن و قیژە قیژێکی زۆردەکەن.

شەقڵاوە شوێنێکی زۆر پڕدار بوو بەتایبەت ئەسپیندار. هەربۆیە، هەموو ئەو قەلە ڕەشانەی کە بە دەیان کیلۆمەتر لە دەور و پشتی شەقڵاوە بوون، بە ڕۆژ دەفڕینە دەشتەکانی هەریر، ناکرێ، هەولێر و بەرانەتی بۆ خواردن، بەڵام بە شەو دەگەڕانەوە ناو کۆز(ڕەز)ە ئەسپیندارەکانی شەقڵاوە. ئینجا بەزمی ڕاوەکە لێرەوە دەستی پێدەکا.

قاژوو لە زستان بە ڕەو دەهاتنە باخچەکانی شەقڵاوە و حەزیان دەکرد بە شەو لەسەر ئەسپیندارەکان هەڵنیشن، زۆرجار لەبەر زۆری ڕێژەیان پەلی دارەکانیان دەشکاند. ئەم جۆرە دارە بە کۆز دەچێندرێ و دارەکان زۆر لە یەك نزیکن. بەتایبەتی ئەگەر لە جۆری "شاتان" بن، ئەوا پەل و پۆی زۆرن کە دەبێتە هۆی شکانی با و پاراستنی قاژووەکان لە سەرمای توند. هەروەها قاژوومکان دەتوانن زۆر لە نزیك یەك هەڵنیشن، بەم چەشنەش گەرمی لەیەك وەردەگرن. کەچی ئەم هۆکارانە، کارەکەی ئێمەی ئاسان دەکرد و قاژوەکانی بۆ ئێمە لە یەك جێگا کۆدەکردنەوە.

جاران قاژوو ئەوەندە زۆربوون، هەتا باوك و باپیرانیشم ڕاویان کردون، بەڵام ئێستا قاژوو زۆر کەمبونەتەوە. هەروەها ئەسپینداریش ئێستا لە زۆر شوێنی

تر دەچێندرێن و لەگەڵ ئەمەش قاژوو پەرت و بڵاو بوون و بەدەگمەن ئەبێ شەو لە شەقڵاوە میوان ئابن. هەروەها ئاو و هەوا گۆڕاوە و ئەو سەرمایەی جارانیش ئەماوە.

بۆ کاتی ڕاو، نزیکەی بیست کەسێك ڕێکدەکەوتین. بەڕۆژ دەچووین کۆزە ئەسپینداڕێکمان هەڵدەبژارد کە دارەکانی زۆر گەورەئەبان، چونکە ئەم ڕاوە بە ڕاوەشاندنی ئەسپیندارەکان دەکرا. ئەوکات هەموو چەمی شەقڵاوە، یەك پارچە و بەڕنێك دڕك و داڵ بوو. ئەو چەند کەسە دەستمان دەکرد بە خاوێن کردنەوەی کۆزە ئەسپیندارەکە، هەتا بتوانین بە ئاسانی لە ناوی غاربدەین. دەبوایە هەرچی پەلێك لە بەڕنی زەلام نزم تر بوو بیانبڕین، هەتا بە شەو لە چاومان ڕانەچن. هەرچی داری ووشکیشە دەبوایە ببڕدرێ، ئەوەکا لە کاتی ڕاوەشاندندا بشکێ و بەسەرماندا بکەوێ. هەروەها دەبوایە هەرچی قەد و پرچکی داری ووشك هەیە لەناو کۆزە ئەسپیندارەکە کۆیان بکەینەوە و لە شوێنێکی لاپەرگە دایانبنێین، هەتا بەشەو وە بەرلە دەستپێکردنی ڕاوەکە، لەبن پێمان ئەشکێن و قاژووەکان بەخەبەرنێن. بەم چەشنەش کۆزە ئەسپیندارەکە خاوێن و سافدەکرا لە هەرگرێیەك کە کۆسپی دەخستە بەردەم ڕاوەکە.

پاش خاوێنکردنەوەی کۆزە ئەسپیندارەکە، ئێوارە هەمومان لەناو چەمی شەقڵاوە دابەش دەبووین. هەر چوار کەسێکمان لە شوێنێك قاژووەکانمان دەترساندن ونەمان دەهێشت هەڵنیشن، تەنها لەم جێگایە ئەبێ کە تەرخانمان کردبوو. پاش ئەوەی زۆربەی قاژووەکان لەو شوێنە کۆدەبونەوە، نۆبەتدارمان لەدیار ئەوان بەجێ دەهێشت، ئەوەکا خەڵکی تر بێن و ڕاوەکە لە شوێنی ئێمە بکەن. هەندێك جارێش، ئەگەر شەوەکەی زۆرسارد ئەبوایە، ئەوا هەر لە باخچان دەماینەوە و چەندین جۆر یاریمان دەکردن. هەندێك مێوژ وگوێزیشمان دەبردن و دەمان خواردن.

کاتی ڕاوەکە دەبوایە دوای نیوە شەوبێ و ئەگەر مانگەشەو بوایە، دەبوایە چاوەڕوان بین هەتا مانگیش ئاوادەبوو. هەتا شەو درەنگتر بوایە، باشتربوو. قاژووەکانیش بە شەوی سارد و شەوی بەفرانبار زۆر نزم هەڵدەنیشتن، بە جۆرێك کە دەست پێیان دەگەیشت. ئەمەش کاری ڕاوکەرەکانی ئاسان دەکرد، چونکە قاژووەکان بە ئاسانی ئەیان دەتوانی لەناو کەدە دارەکان بفڕن و ئاسان تر دەگیران. بەڵام ئەگەر باران بوایە، ئەوا قاژووەکان دەچوونە سەری دار هەتا دڵۆپە بارانی قەدە دارەکانیان بەر ئەکەوێ. ئەمەش ڕاوەکەی ناخۆش تر دەکرد، چونکە قاژووەکان بە ئاسانی ئاکەوتنە خوار و دەرباز دەبوون. بۆیە حەزمان ئەدەکرد بە شەوی باران ڕاو بکەین.

پێش ئەوەی بکەوینە ڕێ بۆ شوێنی مەبەست، کەسێکی شارەزا دەسکێك پووشی زۆر ووشکی دەهێنا و پەنگرێکی دەخستە ناوەندی دەسکە پووشەکە، ئیتر دوکەڵی لێ هەڵدەستا و ئامادەبوو بۆ گڕگرتن. بەڵام ئەگەر پووشەکەت توند بگوشیبایە و هەوات لێی بڕیبا، ئەوا گڕی نەدەگرت. کە دەگیشتینە نزیك شوێنی قاژووەکان، کابرای شارەزا فویەکی دەکردە پوشەکە و گوڕی ئاگری لێ بەرز دەبوەوە، بەڵام دەم و دەست گوڕی ئاگرەکەی کپ دەکردەوە. ئەم ئاگرە گەورە لەناکاوە، قاژووەکانی گێژ دەکردن. پاشان دەچووینە ناو کۆزە ئەسپیندارەکە و هەریەکە لە شوێنێك دابەش دەبووین. بەڵام کابرای شارەزا، دەچووە ناوەڕاستی کۆزە ئەسپیندارەکە و فویەکی تری دەکردە پوشەکە و گوڕی ئاگری لێ بەرز دەبوەوە، هەروەها ئاگرەکەی یەك دووجار لە هەر چوار دەوری خۆی دەسوراند و لە ژێر پێی خۆی دەنا و دەیکوژاندەوە. ئەم ڕووناکیە دووبارە قاژووەکانی گێژ تر دەکرد. ئیتر هەر کەسە و بەردەبووە دارەکان و ڕایدەوەشاندن. قاژووەکانیش چونکە گێژ ببوون و سەرمایان بوو، نەیان دەتوانی بفڕن. ئەگەر بشفڕیبان، ئەوا بەقەدی دارەکان یان بەیەك دەکەوتن و دەکەوتنە خوارەوە. ئیدی هەرکەس و تورەکەیەکی پێ بوو و قاژووی تێ دەکردن. خۆت و بەختیشت بوو، جاری وا هەبوو هەریەکە هەشت نۆ قاژوومان دەگرتن. جاری واش هەبوو زۆرتر یان کەمترمان دەست دەکەوتن. ئەم ڕاوە بەشەریکایەتی نەبوو بەڵکو هەرکەسە بۆخۆی بوو، هەبوو یەك قاژووی دەگرت، هەشبوو دە قاژووی دەگرتن. بەڵام زۆربەی ئەو کەسانەی زۆریان دەگرتن، یەك یان دوو دانەی دەدایە ئەوانەی کەمتریان گرتبوون. هەر قاژوویەك نیو کیلۆ گۆشتێك یان زیاتری تێدابوو، بەڵام چونکە قاژوو تەمەنی درێژە، بە ئاسانی گۆشتەکەی نەدەکوڵا.

سەیر لەوەدابوو کە زۆرجار ڕێوی و تورگ و گورگ دەبینران و قاژوویان لەبن دەستی ڕاوچیەکان دەرفاندن. پاش پەیدا بوونی دارلاستیك، ئەم ڕاوە ئاسان تر بوو، بەڵام دیسان دەبوایە چەند کەسێك بەیەکەوە بچنە ڕاو لەترسی دەعبا و دڕندە، کە ئەوکات لەناو چەمی شەقڵاوە گەلێك زۆر بوون.

بابم لۆی گێرامەوە کە ئێوارەی ڕۆژێکی زستان خەریکی قاژووداکردن بووە. کە دەگاتە گۆڕەگیزی خۆی لە نزیك زەندۆرێ، گورگێکی لێ پەیدا دەبێ و گورگەکە پرکێشی دەکا و خەریك بوە پەلاماری بدا. باوکیشم پیاوێکی زۆر بەجەرگ و یەکجار بەغاربوو و ئەو ڕۆژە خەنجەریشی پێبوە. ئەو دەیگێرایەوە، "کە گورگەکەم لێ نزیك بوەوە، هەڵمکێشا خەنجەرێ و بەیەك دوو هەنگاو تاوم دایە گورگەکە. گورگ ڕادەپەڕی و دوای چەند مەترێك،

چونکە زستان و برسی بوو، دیسان تاوی دایەوە. چەند جارێك ئەو هێنان و بردنەمان دووبارە بوەوە. کە گورگ زانی بە تەنها بارم نابا، لوراندی و گورگەك لە لای ناوچەی زێوەر وەڵامی دایەوە. کە زانیم لێم دەبنە جۆتە گورگ، گووتم پێش ئەوەی گورگەکەیدیشم بگاتێ، دەبی خۆم دەربازبکەم. ئەو جارە زۆر توند تاوم دایە گورگ و کە ئەو ڕاپەڕی، منیش دە تا پازدە مەترەك بەرەو لای گوند غارمدا. کە گورگ لێم نزیك بوەوە، دیسان زۆر بە تووڕەیی تاوم داین و گورگ دەرپەڕیەوە. منیش هەندەی دی لۆلای گوندی غارمدا. بەو بینەوبەردەیەی بەخۆ و بە گورگی ماوەیەك یەکدیمان هێنا و برد و هەر چەندە زۆر هیلاك بووم، بەس هەر بەتاوتر پڕکێشی گورگم دەکرد و تەکانم دەدایە خۆم تا زیاتر لۆ لای گوندی غاربدەم. هەتا سەردۆڕێ لەدوم هات، بەڵام کە لە ڕووبار پەڕیمەوە، چیتر لە دووم نەهات. پێش ئەوەی بگەمە سەردۆڕیش، گورگەکەی دی لە لای زەندۆڕێ لوراندی. ئەگەر پەلەم نەکربا، بێ شك بە هەردوو گورگەکە دەیان خواردم."

قادری وەسمانە ڕەشی خەزووریشم بۆی گێرامەوە، کە گەنج بووە و لە شەوێکی زۆر ساردی زستان، پاش ئەوەی قاژووەکانیان داکردوون، ئەیان توانیوە لەناو ڕەزان بمێننەوە، چونکە هەم زۆرسارد و هەم مانگەشەو بووە. بڕیاریاتداوە بچن بخەون و پاش مانگ ناوابوون ڕاوەکە بکەن. کە ئەو لەخەو هەڵدەستێ، وادەزانێ هاوڕێکانی بەجێیان هێشتوە. بە تەنیا دەکەوێتە ڕێ و ئەو کات هیچماڵێك لە خوار مزگەوتی حاجی برایم نەبووە. کە لە ڕووباری سەردۆڵ دەپەڕێتەوە، دەعبایەك دەبینێ، ئەویش گوێی پێنادا. پاش تۆزێکی تر دەعبایەکی تر دەبینێ، کە دەگاتە لای کانی مزگەوت، دوو دەعبای تر لە خوارێ دەبینێ. ئەویش هیچی پێ نەبووە بەرگری لەخۆی بکا. چاکە بڕیار دەدا کە بەپەلە بەگەڕێتەوە. بۆ بەیانی دەزانێ کە برادەرەکانی لە سەرمان لە ماڵ نەهاتبونە دەر وە ئەگەر نەگەڕابایەوە، دەبووە نێچیری دڕندەکان.



قادر وەسمان ڕەش

هەر ئەو مام قادرە، هێسترێکی باشی هەبوو کاروانی پێدەکردن. کاتێك حکومەت لە ساڵی ١٩٤٣ هێرشی کردە سەر بارزانی، پۆلیس هێسترەکەیان بردبوە قشڵە و لەگەڵ سەربازەکان ڕەوانەیان کردبوو. خەدیجەی خێزانم دەیگێڕایەوە کە مام قادر تورەکەی نانی لەمل کردوە و بەدوای هێسترەکەیدا چووە و لە هەریر گەیشتۆتەوە هێزەکە. ئەو دەیگێڕایەوە کە بارزانیەکان شەڕێکی باشیان دەکرد و زۆربەیان چرۆیان لە خۆ بەستبوو و مام قادر و هێسترەکەی کەتبوونە جەرگەی شەڕەکە. هەتا ناوی مام قادر بە کوژراوی هاتبوەوە. کە جاری دووەم هێرش کرایەوە سەر بارزان، پۆلیس هاتبوون هێستران کۆبکەنەوە. مام قادر و ئەحمەدی لالۆی و مام سبی هێستری خۆیان بە قەراستە تێکخستبوو و بردبویاننە حۆداوە لە چیای سەفین. دوای چەند ڕۆژێك، هێسترەکان بزر دەبن و دوای گەڕانێکی زۆر لە ئەشکەوتی چل کەزی دۆزرانەوە. ناچار هەتا شەڕی بارزان تەواو بوو، بە شەو کاروانیان پێدەکردن.

کە هێسترەکە پیربوو و پەکی کەوت، بەرەلای کرد بوو تا هەندێك گۆشت بگرێتەوە. هێسترەکە بە زۆری لە گۆڕەتوەکەی لای تەمتەمان دەلەوەڕا، بەڵام جاروباریش دەچووە لای باخچە هاوینیەکەی مام قادر لە مەحمودی مەلای. شەوێك گورگ لەوێ هێسترکەیان کوشت و بەشێکیان لێ خواردبوو. مام قادر خێرەکی زۆری لە هێسترەکە دیتبوو، بۆیە تەلیەی لە تەنیشت کەلاکەکە دانایەوە. بۆ شەوی پاشی، گورگەك بەتەلیەی وەبوو و هەتا چۆمی خێنێ تەلیەکەی لەدوو خۆ کێشابوو. مام قادر و مستەفای برای و وەسمانی کوڕی دەچن تەلیە بەسەربکەنەوە. کە دەبینن تەلیە نەماوە، بەدوای خێشکەی تەلیە دادەچن کە لە گەرەشکە دارێك بەسترابوەوە. مام قادر دولکەی ئەستریانی لەگەڵ خۆی بردبوو و گورگ لە چۆمی خێنێ دەدۆزنەوە. ئەوەندەی بە بەردو و مەترەقان لێدەدەن و دەبەر ڕووباریشی دەنێن. بەردێکی لەسەر دادەنێن و بە مردووی حیساب دەکەن و دێنەوە ماڵێ. چونکە منداڵەکانی مام قادر هێسترەکەیان زۆر خۆشدەویست، زۆربەیان لەگەڵ سلێمان و خەلیلی ئامۆزایان دەچن کەلاکی گورگ ببین. کە دەچنە ئەوێ، دەبینن گورگ هەستایەتەوە و خەریکە ڕابکا. بە هەموویان بەردبارانی دەکەن و دەیکوژن.

جگە لەو ڕاوانەی لەسەرەوە باسمکردن، چەندین جۆری تری ڕاو هەبوون. بۆ نمونە باوکم دەی گێرایەوە کە جاران لەکاتی خەرمان کۆکردنەوە، داری دوولکیان لە دەوری جۆخین دەچەقاندن و شوی داریان لەسەر ڕادەهێلان. دووکانەیان دەکوڵاند و دوای ئەوەی سارد دەبوەوە، ناوەکەی وەکو سیکۆتینی لێدەهات (دوکانە، ڕوەکێکی وەك بلاروکە). کاتێك باڵندە بەرەو دەهاتن گەنم

بخۆن، لەسەر شووەکان هەڵدەنیشتن و پێیان بە دارەکە دەنوسان. دوایی باڵەکانیشان بە هەمان شێوە و نەیاندەتوانی بفڕن.

جۆرێکی تر لە ڕاوی تەیر کە لەکاتی بەفر بارین دەکرا. ڕاوچی دەچوو چەند مەترێکی لە گۆرەپانێك لە بەفر خاوێن دەکردەوە. هەندێ زبڵی ناژەڵان و کا و گەنمی بەو شوێنە وەردەکرد. چونکە شوێنەکانی تر هەمووی بە بەفر داپۆشرابوون، تەیرەکان لە دوورەوە بۆ خواردن دەهاتن. بۆ ئەوەی باڵندەی زۆر شارەزای شوێنەکە ببن، ڕاوچی دوو ڕۆژ ئەو کارەی دەکرد. ڕۆژی سێهەم، تۆڕێکی گەورەی لەهەمان شێوەی ڕاوی کەو، لەسەر زەوی دادەنایەوە. کاتێك باڵندەیێکی زۆر دەهاتانە ناو تۆڕەکە، هەموویانی بە کۆمەڵ دەگرتن.

هەرواها ڕاوی هەندێك ناژەڵی تریش باوبوون، وەك کوڕەبەشە کە ناژەڵێکی پەل خڕ و کورتە، خەتێکی سپی لە نێوچاوانی تا سەر کلك ڕۆیشتوە. پێستی کوڕەبەشە هەمووی دوونگە و وەك مریشك چاکدەکرێ، پێستەکەشی فڕێنادرێ. کوڕەبەشە، بە تەلیە ڕاودەکرێ، یانیش زۆرجار کونی دەدۆزنەوە و زیاتر لە یەکێك لەو کونە دەردەهێنن. دەرەکیش بە هەمان شێوەی کوڕەبەشە ڕاودەکرا.

سیخوڕیش ناژەڵێکی قەڵەو وە بە قەڵەمە، قەڵەمەکانی باریك و تیژن. سیخوڕ، کونی هێلانەکەی لەبن شاخ دروستدەکا، ڕاوچیەکانیش لەپێش کونەکە قۆرتێك لێدەدەن و بە داری زۆر باریك و پوش دایدەپۆشن. کاتێك سیخوڕ لەسەر قۆرتەکە دەڕوا، دەکەوێتە خوارەوە و خۆی گیفدەکا، نیتر قەڵەمەکانی لەمبەر و ئەوبەری قۆرتەکە دەچەقن و ناتوانێ بێتەدەرەوە. جگە لەوانەش ڕاوی سمۆرە لەناوچەکە باو بوو کە ئەویش لەزەتێکی زۆر خۆشی هەبوو.

# ڕێگای هاملتۆن ١٩٢٨ ـ ١٩٣٢

پاش داگیرکردنی کوردستانی باشور لەلایەن ئینگلستان لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم ١٩١٤ ـ ١٩١٨، ئەم بەشەی کوردستان ببووە شوێنی ململانێی بەرژەوەندی خودی دەوڵەتە زل هێزەکان، هەم لەنێو خۆیاندا و هەم لەگەڵ دەوڵەتە تازە دامەزراوەکانی ناوچەکە. میللەتی کوردیش هەوڵی سەربەخۆیی داوە و ئینگلیزیش توشی بەرەنگاریەکی گەورە بووە. هەربۆیە ئینگلیز بڕیاریداوە ڕێگای هاملتۆن لە هەولێرەوە هەتا حاجی ئۆمەران دروست بکا.

لە ساڵی ١٩٣١ بە سەرپەرشتی ئەندازیار ئارداش ڕێگاکە لەناو شەقڵاوە دروست کرا کە هەتا ئەوکات لە بەری لای چیای سۆرك بوو، هەر لە شیوی کۆلان دەستی پێدەکرد و لە شینکان دەپەڕییەوە شاخی سۆرك تا دەگەیشتە مهندیسخانە. جادەکە خۆڵ بوو، بەڵام لە هەنێدك شوێن بەردڕێژ کرابوو. کە زستان دادەهات، ئەو ڕێگایە دەبوو بە قوڕ و زەنەك وە هەرچی ئۆتۆمبیل هەبوو لە قوڕەکە دەچەقین. هەندێك لە خاوەن ماشێنەکان فەرمانبەری حکومەت بوون، زۆر جاریش ئەندازیاری ڕێگا و بانەکە بوون. سەیر لەوەدابوو، هانایان بۆ پۆلیسخانەی شەقڵاوە دەبرد، ئەو کاتیش پۆلیس زۆر بە دەسەڵات بوو وە دەهاتنە چایەخانە یان هەر لەناو بازار خەڵکیان بە زۆر کۆدەکردەوە و دەیانبردن بۆ دەرهێنانی ماشێنەکان. چەند ساڵێکی خایاند هەتا ئەو ڕێگایە قیرتاو کرا.

لە بیرمە ڕۆژێك میرانی قادر بەگ لەگەڵ هەندێك پیاوی تر، چووبوونە تەماشای جادەکە، چونکە موڵکی ئەوی بەرکەوتبوو. لە گەڕانەوەیدا باوکم فەرمووی لێکرد، ئەویش ووتی دێم چایەکت لەلا ئەخۆمەوە. دایکم گورج چوو تریانێك ناروو (خیار)ی لێکردنەوە و لەبن داری توو جێگایان بۆ میوانان ڕاخست. سەماوەرێکی میرسواری زەردی ڕوسیمان هەبوو و ئەویش هەڵکرا. باوکم سەماوەرەکەی بە چوار لیرەی ئەوکات کڕی بوو و شتێکی زۆر نایاب بوو. میر ووتی "حەمەدئەمین بەگ، سەماوەرێکی جوانت هەیە!"، باوکیشم ووتی "پێشکەشتبێت میران" میریش ووتی "قبوڵم کردو وێم دایەوە، قابیلی خۆتە". ئێستاش لەبیرمە سەیری دەستی میرانی قادر بەگم دەکرد کە نارووی سپی دەکرد، قونکەکەی لەگەڵ خوێ لە ناروەکە دەخشاند و کەفێکی سپی دەکرد، ئەوسا لەتی دەکردو دەیخوارد.



سەماوەری میرسواری ڕوسی

لە بڕیارەکەی دروستکردنی ڕێگای هاملتۆندا هاتووە، کە دەبێ ڕێگاکە هەموو هۆز و خێڵەکانی ئەو ناوچەیە لە یەك بترازێنێ و بیانکا بە دوو بەش، هەتا بە ئاسانی بتوانن کۆنترۆڵیان بکەن. شایانی باسە، دواتر ئەم ڕێگایە خێرێکی زۆری بۆ ناوچەکە هەبوو و ڕێگای کاروانی ئێران، هەروەها هاموشۆی گەرمێن و کوێستانی خێڵەساتی زۆر ئاسان کرد. هەتا ئەمڕۆش، ئەم ڕێگایە شادەمارێکی سەرەکی ئابوری کوردستانی باشورە.

خەڵکی ناوچەکە ناچار بەرەنگاری بەرنامەکەی ئینگلیز ببوونەوە. لەم بەرەنگاربونەوەیەدا ئینگلیز بۆ یەکەم جار لە مێژووی نەك تەنها هێزی ئاسمانی پادشایی، بەڵکو هەموو هێزە ئاسمانیەکانی تری جیهان، فڕۆکەی جەنگی لە دژی خەڵکی شۆڕشگێر و سڤیل بەکارهێناوە. لەوەش زیاتر و بە گوێرەی ئەو لێکۆڵینەوەی کە تیمێکی بەرنامەی **wall to wall** (لە دیوارەوە بۆ دیوار)ی کەناڵی چواری بەریتانی لە ساڵی ١٩٩١ ئەنجامیاندا و پاش ئەوەی هەندێك زانیاری ووردیان لەسەر بۆردومانەکانی ساڵانی ١٩١٩ - ١٩٢٣ی کوردستان بەدەست گەیشتبوو، فڕۆکە جەنگیەکانی هێزی ئاسمانی پادشایی، گازی ژەهراویان لە کوردستان بەکارهێناوە! هەروەها بە گوێرەی زانیاریەکانی ناو ئەرشیفی بەڵگەکانی حکومەتی بەریتانی کە دەست تیمەکە کەوتبوون و پاشانیش ئەو چاوپێکەوتنانەی تیمەکە لەگەڵ چەند پیرەمێردێکی شایەت حاڵی ڕووداوەکانی ئەو سەردەم ئەنجامیان دان، تیمەکە گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە لە بۆردومانەکانی ڕەواندز و شاری سلێمانی و ڕانیە، ئینگلیز گازی ژەهراوی بەکارهێناوە.

بەم چەشنە، ئەمە یەکەم بەکارهێنانی چەکی کومەڵکوژ بووە لە دژی خەڵکی شۆشگێر، نەك هەرلە کوردستان، بەڵکو لە هەموو جیهان. یەکێك لە فڕۆکەوانەکان بەرلە فڕینیان بۆ بۆردومان کردنی کوردستان، لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیدا دەڵێ "دەچین شاپێك لە قـ ... هەندێ کەس هەڵدەدەین". هەروەها وینستون چێرچلیش، لە ووتەیەکی ئەوکاتیدا دەرهەق بە بەکارهێنانی گازی ژاهراوی لە عێراق دەڵێ "من زۆر بەتوندی لەگەڵ بەکارهێنانی گازی ژەهراویدام لە دژی هۆزە ناشارستانیەکان، هەتا بەگورجی بیانتوقێنین". هەروەها ئینگلیز بلە و بارزان، هەریر، باتاس و گوندی باشور لە دەشتی هەریر و شوێنی تریشی بۆردومان کردوە. قادری وەسمانە ڕەشی خەزورم بۆی گێرامەوە کە خەڵکی باشور لە دوای بۆردومانەکە نەخۆش کەوتوون. هەر ئەو بۆی گێرامەوە کە سەعدی مەلا وەسمانی زۆر شارەزا و چالاك بووە لە بڕینەوەی بۆمبە نەتەقیوەکان. سەعدی دوای شەڕەکان چۆتە هەریرو خەریکی بڕینەوەی ئەو بۆمبانە بووە. گوایە ئەو کەسانەی لەگەڵ سەعدی بوون ترساون، ئەوەکا یەکێك لەو بۆمبانەیان پێدا بتەقێتەوە و سەعدیش پێیان دەڵێ "لە چی دەترسن، خۆ ژنی ئێوە لە ژنی من جوانتر نیە؟".

هەروەها، فاتمە غەفوری خەسوم کە خەڵکی گوندی باشور بوو، بۆی گێرامەوە "یەکێك لە بۆمبەکان بەر قونەباتی خانوی ئێمە کەوت و پەلکی بە دارهەنارەکانی دەوروبەر و پەڕی بە مریشك و کەڵەبابەکان نەهێشت. ئێمە هەموو چووین لە دەو ڕووبارمان خۆشاردەوە". بۆردومانەکە زیانی زۆری لە گوندەکە داوە، بەڵام هیچ زیانێکی گیانیان نەبووە. فاتیمە غەفور ئەوکات زۆر گەنج بووە و دەیگووت "چەکوچی شەکرشکێنمان لە بۆمبەکانی باشور دروست کرد".

لەوەش زیاتر، زۆر سەرچاوە نیشاندەدەن کە حکومەتی تورکیاش لەساڵانی ١٩٣٧ و ١٩٣٨، گازی ژەهراوی لە ناوچەی دەرسیمی کوردستانی باکور، لە دژی گەریلاکانی شۆڕشی دەرسیم و خەڵکی سڤیلی ناوچەکە بەکارهێناوە. دوای بەکارهێنانی چەکەکەش وە بۆ بزرکردن و داپۆشینی شوێنەواری بەکارهێنانی ئەم جۆرە چەکە، حکومەتی تورکیا خەڵکی ناوچەکەی کە لە بۆردومانەکان و قڕانەکە نەکوژراون، ڕاگواستوە. هەروەها ناوچەکەی کردوە بە ناوچەیەکی قەدەغەکراو هەتا ساڵی ١٩٥٠، ئەمەش لە مێژوو بە قڕانی دەرسیم ناو دەبرێ. بەگوێرەی هەندێك سەرچاوەش، زیاتر لە حەفتا هەزار کوردی بێگوناهی تێدا کوژراوە و حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی تورکیاش، حاشایان لەم کومەڵکوژیە کردوە. بەڵام دوای تێپەڕبونی ٧٤ ساڵ بەسەر ئەم کارەساتە،

لە ڕۆژی ٢٣ تشرینی دووەمی ٢٠١١، ڕەجەب تەیب ئوردوغانی سەرۆك وەزیرانی تورکیا، بەناوی حکومەتەکەی داوای لێبوردنی لە قڕانەکەی دەرسیم کرد. بەم چەشنەش، سەدام حوسێن سێیەم کەسە چەکی کۆمەڵکوژی لە دژی میللەتی کورد بەکارهێنابێ.

لە درێژەی بەرنامەی لەیەکترازاندنی ڕیزەکانی میللەتی کورد، ئینگلیز توانیویەتی هەندێك سەرۆك هۆزی کوردستان بەلای خۆیدا ڕابکێشێ، هەتا پشتگیری لە بەرنامەکەی بکەن. لە سەرەتای هاتنی ئینگلیز بۆ کوردستان، شمشێرێکی زێڕیان پێشکەش بە میرانی قادربەگ کردووە، کە دیاری شاژنی ئینگلستان بووە. لەکاتی بەرەنگار بونەوەکانیشدا، میرانی قادربەگ پشتگیری لە ئینگلیز کردوە، بەڵام هەندێك هۆزی تر کەوتبونە بەرەی بەرەنگاربونەوە. میرانی قادربەگیش هێزێکی کۆکردبوەوە و ناردبونیە گوندی سورسورە و دەهۆڵ و زوڕنایان لەوێ کوتاوە هەتا خەڵك بەدوای هۆزەکانی تر نەکەون. گوایە یەکێك لەو سەرۆك هۆزانە گوتویەتی "وەڵلا ئەو تەپەتەپە هیچ کار لە گـ....من ناکا". قادری وەسمانە ڕەشی خەزورم بۆی گێڕامەوە، کە یەکێك لە شەڕکەرەکانی بەرەی بەرەنگاربونەوە، خۆی لە شوێنێك قایم کردبوو و ناوەناوەش دەیگوت "هەی غوڵامێ ڕوپیەی". بەڵام چەند ساڵێك دوای ئەوە ئینگلیز توانیویەتی زۆربەی سەرۆك هۆزەکانی کوردستان ڕازی بکا هەتا دەنگ بە لکاندنی کوردستانی باشور بە دەوڵەتی عێراقی تازە دامەزراو بدەن، کە ئەوکات بە ولایەتی موسڵ ناسرابوو.

هەروەها خەزورم بۆی گێڕامەوە کە ئەگەر بریندارێك یان مەیتێکی سوپای بەریتانی لە خۆشناوەتی بەرەو سەرەوە هەبوایە، ئەوا پەیوەندی بە میرانی قادر بەگ دەکرا. دەبوایە ئەوانیش چەند کەسێك بنێرن و کەسەکە بە پێ یان بە وڵاغ بگەیننە گوندی مەلائۆمەر، چونکە ئەوکات تا ئەوێ ڕێگای سەیارە هەبووە. هەرئەو ووتی، جارێك بریندارێکمان بە دارەمەیت تا مەلائۆمەر برد، مینۆی شاقوڵیشمان لەگەڵ بوو کە بەتوورکی قسەی لەگەڵ بریندارەکە دەکرد.

درێژەی باس و خواسی ئەم ڕێگایە و لکاندنی کوردستانی باشور بە دەوڵەتی عێراق بۆ مێژوونوسان جێدەهێڵم. بەڵام ئەم بەسەرهاتە خۆشە پەیوەندی بەم ڕێگایە و بە خودی ئەندازیارەکەوە هەیە. ئیبراهیم ناسراو بە کاوڕ، لەکاتی دروستکردنی ڕێگاکە، چاودێر بووە و سەرپەرشتی چەند کرێکارێکی کردوە. پاشان من و ئیبراهیم لە ئیشغال بۆ ماوەیەکی زۆر لە نێوان ساڵانی ١٩٤٨ تا ١٩٥٥بەیەکەوە کارمان کرد. ئیبراهیم بۆی گێڕامەوە کە کاتێك ئەم ڕێگایە دروست دەکرا، ئەو لەگەڵ چەند کەسێکی تری شەقڵاوەیی، لەوانە کوڕێکی

حاجی قادری ولیای موختار بەناوی حەمەدنەمین، ناسراو بە ئاغا، کاریان لە ڕێگای هاملتۆن کردوە. وەختێك ڕێگاکە دەگاتە لای شیوی عەزیای، حەسەنی فاتێ کە کابرایەکی بەتەمەن، بەڵام قسە خۆش بووە، داوای لە ئیبراهیم کردوە کە کارێکی ئاسانی پێ بدا، ئەویش پێی دەڵێ "ئەتو کاری قازمە و بێڵت پێ ناکرێ، بەڵام وەرە لە ڕووباری ڕوسارك بە تەنەکان ئاوێ لۆ عەمەلان بێنە".
حەسەنی فاتێش جوێنێکی سەیری بە ئیبراهیم داوە، چونکە ئەم کارە زۆر لە کاری قازمە و بێڵ قورستر بووە. بەڵام چونکە کابرایەکی زۆر قسەخۆش بووە کەس لە قسەکانی زویر نەبووە.

شیوی عەزیای کەندێکی قووڵە لە بەرامبەری چاکی شێخ سمایل و لە نزیك میراوە بەلای گوندی بەرەکە لە تیشی میراوە دێتە خوارێ و کەوتۆتە دامێن شەقڵاوەی نوێ. ڕێگا کۆنەکەش بەر لە گەیشتن بە ڕووباری ڕوسارك بە ٢٠٠ مەترێك، بەلای حاجی بایز بایەدایەوەو ئینجا بۆ پردە کۆنەکە شۆڕدەبوەوە. لە پاش پردەکەش هەتا بن چاکی گورگان خواردی دەچوو وە لەوێش بە بناری گردەکە بەرەو لای گوندی بەرەکە پێچی دەدایەوە و بەتەنیشت شێوی عەزیای بەدەوری گردەکە دەسوڕایەوە بەرەو گوندی میراوە سەردەکەوت. پاشان لە ساڵانی ١٩٦٩ و ١٩٧٠، ئەم پردە نوێیە دروست کرا، کە بەشێکی گردەکەیان بڕی و ڕێگاکەشیان بەخۆڵی گردەکە بەرز کردەوە هەتا ئەم ڕێگا ڕاستەی ئێستای لێ پەیدا بوو کە ئۆتۆمبیل بە ئاسانی دەتوانن لەو هەورازە سەربکەون.



چەند کرێکارێکی ڕێگای هاملتۆن

وەختێك ڕێگاکە دەگاتە لای "شیوی عەزیای" لە خوار گوندی میراوە، بەیانیەکی زوو ئەو کۆمەڵە کرێکارە بەرەو ئەوێ بەڕێ دەکەون. لە ڕێگا مارێکی ڕەشی گەورە لەلای پردی ڕووسارك (بەڵام هێشتا پردەکە دروست نەکرابوو)، لە بن پێیانیان ڕادەپەڕێ و ئەچێتە بن ماڵە ئەستریەکی نزیك.

حەمەدنەمین کە دەرویش بووە، خەریکی گرتنی مارەکە دەبێ و خەڵکەکەی تریش بەردەوام دەبن لە ڕێگا برین بۆ سەرکارەکەی خۆیان. حەمەدنەمین مارەکە دەگرێ و دەیخاتە ناو باخەڵی خۆی، ئینجا دەکەوێتەوە ڕێ بۆ شیوی عەزیای، بەڵام هەتا دەگاتە لای جەماعەت نیو سەعاتێك دوا دەکەوێ.

هاملتۆن بۆخۆی خەڵکی نیوزیلەندا بووە، بەڵام زمانی ئۆردوی زۆرباش زانیوە. کاتێك دەبینێ حەمەدنەمین نیوسەعات درەنگ دەگاتە سەرکار، پێی دەڵێ "حەمەدنەمین تۆم کار نەکەرق" مانای "حەمەدنەمین تۆ کار ناکەی"، ئەو کاتیش خەڵك زۆر هەژار بوو و دەرکردن لەسەر کار، کارەسات بوو. دیارە حەمەدنەمینیش زۆر تووڕە دەبێ و مارەکە لە باخەڵی دەردێنێ و بەرەو هاملتۆن دەڕوا و دەڵێ "ئەمن کارنەکەرق هەی وەها و وەهات لێ بکەم". هاملتۆن چاوی بە مارەکە و بە تووڕەیی حەمەدنەمین دەکەوێ، دەزانێ ئەم بڕیارەی نەك هەر بۆ ناچێتە سەر، بەڵکو پەشیمانیش دەبێتەوە و دەڵێ "حەمەدنەمین تۆم بێتۆ...".



هاملتۆن

شایانی باسە، لە کاتی دروستکردنی ڕێگاکە، پێش گەیشتن بە شەقڵاوە و هەتا لە میراوەش تێپەر بووە، هاملتۆن چادرێکی لە خوار پێچی دارنمرەی و لەسەر ئەو کانیە ناوەی کەوتبووە پشت قوتابخانەی خۆشناوی ئێستا لە شەقڵاوە هەڵدابوو و چەند پاسەوانێکیشی لەوێ هەبوون.

# ناوی شوێنەکان

لە کۆندا، جگە لە ڕێگای هاملتۆن هیچ شەقامێك لەناو شەقڵاوە نەبوو. دواتر لە ناوەڕاستی سیەکان ئەو شەقامەی هەر لە شیوی کۆلان تا موهەندیس خانە دروستکرا. لەوێشەوە بۆ ناوچەکانی سەرەوە پەرە بە ڕێگای هاملتۆن درا. نارداش کە پیاوێکی ئەرمەنی بوو، سەرپەرشتی دروست کردنی ئەو ڕێگایەی دەکرد. شایانی باسە، ئێستاش ئەو پردەی لەسەر دواوی شەقڵاوەیە لە خواروی دەربەند، بە ناوی ئەو ئەندازیارە ئەرمەنیەیە و پێی دەڵێن پردی نارداش. لە کاتی دروست کردنی ڕێگاکە، مەکینەیەکی بەرد ووردکردن لە چۆمی خین داندرابوو و خەڵکی شارەکە بە کەر بەردیان بۆ دەکێشا، هەروەها ناویان لە مەکینەکە نابوو بەردکرۆژ.

ڕۆژێکیان نارداش و تیمەکەی لە کۆڵانەکەی نزیك باخی ئێمە، لەسەر دار چنارێك هەندێك نوسینی ئینگلیزیان ئەخشاند، دیاربوو نیشانەیان دەکردن بۆ مەبەستی ڕێگا دروست کردن. باوکم داوای کرد کە لەلامان میوانبن، ئەویش مەمنونی کرد و دیاربوو ئەیدەویست باوکم ماندوو بکا. باوکم پێ ووت هەرکەسێك کاری بکەوێتە ئەوناوە، هیچ چارەیەکی نیە و دەبێ میوانی من بێ، ئیتر میوانمان بوون. دوای نان خواردن میوەی جۆراوجۆرمان بۆ هێنان، لەبیرمە لە هەموو شتێك زیاتر حەزی لە خۆخ بوو.

نارداش باسی پرۆژەکەی بە ووردی بۆ باوکم کرد. هەروەها باسی کرد کە ئەو زۆر حەزی دەکرد ڕێگاکە بەسەرەوە و لە بناری سەفین ببا و لە ناو باخی مەسیحیەکان بەرەو موهەندیس خانەی بباتە خوارەوە، ئەوەك لە خوارەوە بە ناوچەی شیوی کۆلان و گەڕەکی کریکۆر بەرەو موهەندیسخانە. ووتیشی من قسەم لەگەڵ هەردوو قەشە حەنە و قەشە جوبرائیل کرد و زۆر هانمدان کە ڕێگەم بدەن شەقامەکە بەناو باخی مەسیحیەکاندا ببەم. هەروەها ووتی سوودێکی باشی بۆ ئەوان دەبوو، بەڵام ئەوان ووتیان "تکایە ئەوکارەمان لەگەڵ مەکە، با نەکەوینە ژێر دەست و پێیان".

شەقڵاوەی کۆن لە بناری چیای سەفین لە چەند گەڕەکێك کۆ ببوەوە کە بریتیبوون لە گەڕەکەکانی: باوباپیران، دەنگارە، خەجەلاس، گردی دێرێ و کانی خمان. هەموو ماڵەکان لە خانووی قوڕیندا لەم شوێنانە کۆببوونەوە. لە پایز و زستانان لەناو ئەم خانووانە گوزەرماندەکرد، لە بەهار و هاوینیش کەپر لەناو ڕەز و باخەکانی چەم دروست دەکران و لەوێ دەمانەوە. بە کورتی هەواری هاوینە و زستانەمان جیاواز بوو. یەکەم کەس کە خانووی هەمیشەیی

هاوینه و زستانەی لەناو باخچەکان دروست کرد، قادری مەدەی بوو لە گەڕەکی زێوەر. لە دوای ئەویش حاجی مستەفا بەگ لە خوار سەروچاوەی ناوی ناوەنجی و لە تەنیشت دیوەخانی میرانی قادر بەگ خانوویەکی دروست کرد و ئینجا زوبێر ئاغاش خانووەکەی دروستکرد. لە دوای ئەم سێ کەسە، وردە وردە ماڵەکان بە مەسیحی و موسڵمانەوە دەستیان کرد بە دروستکردنی خانووەکانیان لەناو چەم.

ڕێگا و بانەکانی ئەوکات هەمووی کۆڵانی تەسك و پڕ لە جۆگەڵەی ناو بوون، بەڵام لە چلەکانی سەدەی ڕابردوو هەندێك شەقام بەناو چەمی شەقڵاوە بردران. دواتر محەمەد مەولود کە کارمەندی شارەوانی بوو، ناوی کوردی بۆ هەندێك لەو شەقامانە هەڵبژاردن وەك شەقامی: تەم تەم، زێوەر، سیمۆن، کریکۆر، مەولەوی وە زۆر شەقامی تر. زۆرێك لەو ناوانە تا ئێستاش هەر ماون.

هەرلە کۆنەوە ناوی جیا جیا بۆ زۆرێك لە بەرزایی و باخ و کانیاوەکانی شەقڵاوە دیاریکراون و بە پێی ئەوەی هۆش و بیرم ڕێگەم بدەن ناوەکانیان لێرە دەهێنم، هەرچەندە هەندێك لەم ناوانە ئێستاش هەر باون. هەندێك لەو باخانە ناسراو بوون بە باخچەی: زەویلۆکان، گوڵان، کانیلۆکان، گەڵان، مەلا عەباس، داك حاس، سیخوڕە، بنەوان، خەندۆتکان، دارەندوو، حەسار، زێوەر، مەحمە گوڵ، زەندۆڵ، باخچەی کانی فەقێیان، گیرە، گۆڕە توو، گۆڕێ ماوەرانیان، کەوڕەق، قوتبە، شاسوڵتان، گوێزە کلۆر، گۆڕە گیز، جامی شێخان، شاقوڵی، چۆمی خینێ، بەگی خان، ڕەزی بەردی و دەیان ناوی تر. هەندێك لە باخەکان، بۆ نموونە گەلان و مەلا عەباس باخچەی زۆر گەورە بوون. ئەگەر یەکێك گووتبای زۆر هیلاکم، پێیان دەگووت "لۆ، گەلان و مەلا عەباست ناودایە؟".

هەروەها، زۆر باخچەی تریش بە ناوی ئەو کەسە دیارانە دەکران کە خەڵکی شەقڵاوە نەبوون و هاوینان بە مەبەستی گەشتیاری دەهاتنە شەقڵاوە، یان بە کاری میری لە شەقلاوە بوون وەك باخچەی: شاکر فەتاح، ئەمین زەکی بەگ... باخەکانی ناوچەی مەسیحیەکانیش ناوی تایبەت بە خۆیان هەبوو. بۆ نموونە: نادەم و قەچوچان و مار یوحەنان، بێترمە، سەلەندەر، لەرزەك، بانی، مێرگە سیر...

کانیاوەکانی شەقڵاوە وایانکردبوو کە شارەکە ئەو سروشتە سەوز و جوانەی هەبێ. ئێستا جگە لە چەند کانیاوێك، ئەوانیتر هەموویان ووشك بوون. هەندێك لەو کانیاوانە بریتی بوون لە کانی: ئاغان، دەنگارە، دەرماناوە، گڕوو،

مزگەوت، بێترمە، ناوەنجی، شێخ سەید، بێقۆن، قالۆرێ، مەرقۆز، خمان، فەقێیان، سارەکۆر، عەمەربەگ، خدیل، شیوە سار...

زۆر لە بەرزایی و گردەکانیش ناویان هەبوو وەك گردی: حەمەدۆك، بەرد حوشتر، سەردۆر، میرەسەن (میر حەسەن)، قەڵاتی کاولان، دۆران، زەیتون، نەسحابان، باویان، دێرێ، کەپکە قەل، چۆك فیچێن...

هەروەها هەندێك لە گەلیەکانیش ناویان هەبوو وەك گەلی: زەیتان، حەسەنی بەسری، شیوی کۆلان، ساوکەی...

مەزارگەی چەند پیاو چاکێکیش لە شەقڵاوە هەبوون وەك چاکی: سارە کۆر، باوباپیران، شێخ سەید، سەرگرد (مار نەوڕەها)، خەجەلاس، شێخ وسو ڕەحمان (مار ڕەبەن بویا)، مار یوحەنان، نۆمەرحەنان، مار تۆما، شێخ گوڵێ، مەلا مەحمود، دەرماناوە...

# کورتە باسێکی جووەکان

لە کاتی منداڵی من، دانیشتوانی شەقڵاوە زۆر کەمتربوون لەوەی ئێستا، بە مەزندەی من ژمارەی مووسڵمانەکان نزیکەی ١٠٠٠ تا ٢٠٠٠ و مەسیحیەکانیش ٥٠٠ تا ٨٠٠ کەس دەبوون. لە دەوروبەری ٢٠ ماڵە جووێکیش هەبوون، کە دواتر لە ساڵانی پەنجایەکان بۆ ئیسرائیل کۆچیانکرد. سەرەڕای جیاوازی بیروڕای ئاینی، هەمووومان بەیەکەوە و بە ئاسودەیی دەژیاین و لەگەڵ یەك تەبابووین.

لە ناوی ناوەنجیەوە تا کەمێك لە ڕۆژئاوای ناوی کانی خمان گەڕەکی مەسیحیەکان بوو. لەوێشەوە تاکو چاکی باوباپیران گەڕەکی موسڵمانان بوو. ماڵە جووەکانیش کەوتبونە ئەو نێوانەی ماڵە مەسیحی و موسڵمانەکان.



شەقڵاوەی کۆن
لە ئەرشیفی حاجی فەرهاد وەرگیراوە

چونکە جووەکان ئەوەندە زۆرنەبوون، شوێنێکی تایبەتیان بۆ پەرستگا نەبوو، بەڵکو لە ماڵی ئیسحاق کۆدەبوونەوە بۆعیبادەتی خۆیان. ئەو کابرایە ماڵم نەبوو، بەڵام کابرایێکی خوێندەوار بوو. جێگایەك هەبوو لە بەرامبەر مزگەوتی گەورە پێیان دەگووت قەسرۆکە، دەڵێن کاتی خۆی کەنشتەیێکی جووەکان لەو شوێنە هەبووە و جووەکان عبادەتیان تێداکردوە، بەڵام نازانم ئەم قسەیە ڕاستە یان نا، چونکە دەبێ زۆر لە کۆن بووبێ. گۆڕستانی جووەکان بەرامبەر بانقی ئێستای شەقڵاوە بوو. زۆربەی جووەکان دوکاندار یان خەریکی بازرگانیکردن بوون، بەڵام هەندێکیان خەریکی خمکردن و جاجم و بەرماڵ دروستکردن بوون. ناوی کانی خومان لە کانیێ خمان هاتوە، چونکە ئەو کانیە بۆ لەخمدانی جل و بەرگ و تەون و ڕیس بەکار دەهێنرا و تەنها جووەکان ئەم کاسبیەیان دەکرد.

بەڵام پاش ئەوەی جووەکان بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کرد، مەسیحیەکانی شەقڵاوە هەتا سەرەتای شەستەکانیش بەردەوامیان بەو پیشەیەدا.

جووەکان بەگشتی خەڵکی زۆر نەرم و ژیربوون. ئەگەر کەسێك قسەیێکی نەشیاوی بەیەکێکیان گووتبا، ئەو دەیگووت " ئەوە عەیب نیە ئەوەندە دەڵێی ....؟"، ناراستەخۆ چەند جار ووشە نەشیاوەکەی بە کابرا دەگووتەوە. هەموو رۆژانی شەممەش جوواکان لە نزیك رووبارەکان کۆدەبوونەوە، ئەوکات واباو بوو کە گوایا بەدوای شمشێری حەزرەتی مووسا دەگەڕێن، بەڵام پێموابێ مەبەست کۆبوونەوەی جووەکان بوو.

گەورەترین جەژنی جووەکان، جەژنی سەری ساڵی ئەوان بوو کە لە سەرەتای پایزە و بە زمانی عیبری پێی دەڵێن ڕەئشە شانە، کە دەکاتە (راس السنة)ی زمانی عەرەبی. بەڵام ئێمەی خەڵکی شەقڵاوە پێمان دەگووت کەپرە شینە، چونکە جووەکان هەموویان لە بەرامبەر مزگەوتی حاجی برایم کۆدەبوونەوە و کەپرێکیان هەڵدەدا. کەپرەکەیان لە داری بی دروست دەکرد و زۆر جوانیان دەرازاندەوە و هەرچی میوە هەیە بە کەپرەکەیان وەدەکرد. من لەگەڵ ئیسانی کوڕی ڕەفائیلی دوکاندار لەبن کەپرەکەیان دەنیشتووم. مەسیحیەکان و موسڵمانەکان بە هاوین دەچونە ناو باغەکانیان، بەڵام جووەکان باغیان نەبوون و هەر لە گوندی دەمانەوە.

لە بیر و باوەڕی جووەکان تەنها مالم دەتوانێت ئاژەڵ و پەلەوەر سەرببڕێ. بۆیە لە وەرزی پایز مالم لە گوندی بالیسان دەهات، ئەوکات جووێکی زۆر لە بالیسان دەژیان. مالم بەسەر هەموو گوندو شارۆچکەکان دەگەڕا، بۆ ئەوەی بتوانێت یارمەتی هاوباوەڕانی بدات. لە کاتەکانی تریش جاروبار مالم سەردانی شەقڵاوەی دەکرد.

# کەمپی ئینگلیزان

خەڵکی دەوڵەتە تازە دامەزراوەکەی عێراق لە شێوازی بەڕێوەبردنی وولاتەکەیان لەلایەن ئینگلیز زۆر نارازی بوون و تا دەهات ئەو نارەزاییە لە هەڵکشاندا بوو. لەساڵی ١٩٣٢، ئینگلیز عێراقی بە پەیماننامەیەك بەستەوە و هەر دوای مۆرکردنی پەیماننامەکە، مەلیك فەیسەڵ کۆچی دوایی کرد. لە ساڵی ١٩٣٣، بەکر سدقی هێرشی کردە سەر ئاشوریەکان کە ئەو کات بە دەستە ڕاستی ئینگلیز دادەنران، چونکە ئینگلیز هێزێکی تایبەتی لەوان دروست کردبوو بۆ پاراستنی هەردوو بنکە ئاسمانیەکانی لە حەبانیە و شعیبەی بەسرە. لە ساڵی ١٩٣٦، یەکەم کودەتا لە عێراق روویدا و پەیوەندی لەگەڵ ئەلمانیا دروستکرا. مەلیك غازی کە گومانی لە دەرمان خواردنی باوکی هەبوو، نامەیەکی بە کودەتاچیەکان بۆ ئەلمانیەکان ناردبوو، بەڵام نامەکە کەوتە دەست بالوێزی ئینگلیز لە عێراق و دوای ماوەیەك مەلیك غازیش کوژرا، هەرچەندە وا بڵاوکرایەوە کە بە ڕووداوێکی هاتوچۆ گیانی لە دەست داوە.

دوای ئەم ڕووداوە، کوڕە ساوایەکەی غازی بە مەلیك دانرا و عەبدولئیلاهی خالی کرا بە وەسی بەسەر ئەو منداڵە ساوایە. ئەم پیاوە زۆر بێ دەسەلات بوو لە بەرامبەر ئینگلیزەکان و بووە هۆی زیاد بوونی نارەزاییەکان. لە سەرەتای چلەکاندا، ڕەشید عالی گەیلانی کودەتایەکی کرد و پەیوەندی بە ئەڵمانەکانەوە کرد و دەستی بە ناردنی ئەوت بۆ ئەلمانیا کرد. دوای شکانی، ڕەشید عالی رایکردە ئێران و لەوێش بۆ ئەڵمانیا.

ئینگلیزەکان بۆ شەڕ کردن لەگەڵ سوپای عیراق، هێزێکی زۆریان لە ناو خاکی عیراق کۆکردەوە. بە تایبەتی بۆ پاسەوانی کردن لە بیرە ئەوتەکانی باکور لە کەرکوك و موسڵ. لەبەر ئەوەی هێزی ئینگلیز لە بەرەکانی جەنگی دووەمی جیهاندا لەگەڵ ئەلمانیا گیریان خواردبوو، ئینگلیز زۆربەی هێزەکەی لە هیندستانەوە هێنابووە عێراق. چونکە ئینگلیز دەستی بەسترا بوو و تەنها ئەم هێزەی لەبەر دەستدا بوو، ئەی دەویست موجازەفە بکا و ئەم هێزەشی لێ هەڵبگەڕێتەوە. خەڵکی ئینگلستان فێری ئەوە ببوون لە دووری وولاتی خۆیان بژین، بەڵام ئاستەمە بۆ خەڵکی ڕۆژهەڵات لە دووری وولات و ماڵ و منداڵی خۆیان ژیان بەسەربەرن.

هەتا ئەم هێزەش وەڕس و بێتاقەت نەبن، کەمپێکی پشوودانیان لە سەرمەیدانی شەقڵاوە بۆ کردنەوە و هەر دوو هەفتە جارێك بە هەزاران سەربازیان بۆ پشوودان دەهێنانە شەقڵاوە. سەربازەکان زۆربەیان هیندۆس و گورگۆ و

ئینگلیز بوون و بە ئینگلیزەکان دەگوترا "سۆرجەری" کە لەوانەیە لە ووشەی سۆلجەری ئینگلیزیەوە هاتبێ بەمانای سەرباز. ئەو کاتیش جیاوازی لە نێوان هیندی و پاکستانی و بانگەلادیشی نەبوو، چونکە هەمووی هەر هیندستان و یەك وولات بوون و بە زمانی هیندی و ئۆردو قسەیان دەکرد.

لە ناو کەمپەکە، هەر یەکێك لەو میللەتانە بە جیا کەمپیان بۆ کرابوەوە و لە شوێنێکی جیا خێمەیان بۆ هەڵدەدان، بەڵام هەندێك جاریش تێکەڵ بەیەك دەکران. هەر کۆمەڵە خێوەتێکیش، چەند ئاودەستێکی بۆ لێدرابوو و ئاودەستەکان بە مەکینەی باکهۆ (حەفارە) چەند مەترێك قووڵ کرابوون. مێجەرێکی ئینگلیزیش سەرپەرشتی کەمپەکەی دەکرد و لەسەر گردێك خێمەی بۆ هەڵدرابوو. ئەو مێجەرە سەگێکی هەبوو، هەرکەسێك پێلاوی خۆی لەپێ داکەندبا، سەگەکە پێلاوەکەی لێ دەدزی و دەیبردە لای خێمەی مێجەرەکە. شوێنی چێشت لێنان و سەموون دروست کردن و خواردنیش لە ناوەڕاستی کەمپەکە بوو. لە ترسی هێرشی ئاسمانی ئەلمانیاش، ناوە ناوە خەندەکێك بۆ خۆپاراستن لێ درابوو.

لە بەرامبەر میرەسەن، ئاوی شەقڵاوە بە جۆگا ڕاکێشرابوو بۆ ئاودانی دەرەوەی شەقڵاوە. بۆ خۆشوشتنی سەربازەکانیش، بەرلەوەی جۆگاکە بگاتە نێوان هەردوو سۆرك بۆریەکی دوو ئینجیان تێگرتبوو. بۆریەکەش بە ناو مەکینەیەك دەڕۆیشت و ئاوەکەی گەرم دەکرد و بە فشارێکی زۆر لە دیوەکەی تر دەهاتە دەرێ. ئەو بۆریە وەك دووش کون کون کرابوو و لە ژێر بۆریەکەش جێگایەکیان بۆ خۆشوشتن ڕاست و کۆنکریت کردبوو. سەربازەکان دەهاتن و لەوێ خۆیان دەشوشت کە ١٠ تا ١٥ کەس دەیانتوانی پێکەوە خۆیان بشۆن.

بۆ ئاوی خواردنەوە لە سەربازگەکە، یەك دوو تەنکەری ئاو دانرابوون، بەڵام لەبیرم نەماوە لە کوێ ئاویان دەهێنا. بۆ هەرچەند خێمەیەکیش، بەرمیلێك یان دوو بەرمیل ئاویان دانابوو و بەلوعەیان تێگیرابوو. ئەم ئاوە بۆ خواردنەوە و دەم و چاو شوشتن بەکار دەهات و تانکەرەکانیش زوو زوو بەرمیلەکانیان پڕ دەکردنەوە. هیندۆسەکان و ئیسلامەکان زۆر هاتوچۆی ناو شاریان دەکرد و هەندێکیان پیاوی زۆر باش بوون و یارمەتی خەڵکیان دەدا. لەبەر گرانی ئەو کات، خەڵك هەبوو نانی نەبوو بیخوا. لە کەمپەکەش سەموون دروست دەکران و هەرچی ئەو ڕۆژە نەخورابا، لەلایەکیان دادەنا. هەندێك لە خێرکەرەکان ئەم سەموونانەیان جاروبار بۆ هەندێك لە خێزانە هەژارەکان دەهێنان. ئەو کارەش خێرێکی زۆر گەورەبوو. مەمی چیرۆك نوس لە یەکێك لە نوسینەکانی باس لەو

کاره دەکات. هەندێك لە سەربازە ئیسلامەکانیش ڕۆژانی جومعە بۆ نوێژکردن دەهاتنە مزگەوت.

چەندین لۆری لە سەربازگەکە هەبوون و هەردوو حەفتە جارێك سەربازەکانیان دەبردەوە و کۆمەڵێکی نوێیان دەهێنان. ئەگەر سەربازەکانیش لە بەغدا و خوارووی عێراق هاتبان، ئەوا بە بەلەمی گەورە هەتا موسڵیان دەهێنان و لەوێش بەو لۆریانە دەیانهێنان بۆ شەقڵاوە. خواردنیش هەر بە کەشتی هەتا موسڵ دەهات و لەوێش بە لۆریەکان دەهێنرا. جارێکیان لە کاتی ئالوگۆڕی هێزەکان، کەسێکی دەوروبەری شەقڵاوە دوو کەری هێنان و دوو بار خواردنی بارکردن و دەربازیش بوو. ئێمەش کەسمان خەبەرمان لێنەدا.

ئینگلیز ترسی هەبوو کە ئەلمانیا لە ئێرانەوە بەڕێگەی هاملتۆن هێرش بکاتە سەر چاڵە ئەوتیەکانی کەرکوك و موسڵ. هەربۆیە لە هەولێرەوە هەتا حاجی ئۆمەران، پردەکان و ئەو شوێنانەی کە شاخێك بەسەر ڕێگاکەی دەنواڕی، وەکو دەربەندی شەقڵاوە، هەموویان کۆلرابوون و بۆمبڕێژ کرابوون. ئەگەر هێزی ئەلمانیا هێرشی هێنابا، هەموو ئەو شوێنانە دەتەقاندرانەوە و هێرشەکە پوچەڵ دەکرایەوە، یان ئەوەتا زۆر دوا دەکەوت. پاش لادانی ڕەزا شا لەسەر حوکم، ئەو ترسەی ئینگلیز ڕەوایەوە.



کەمپی ئینگلیزان لە جەنگی جیهانی دووەم

ئێمە سی کەسێك لەم کەمپە مانگی بە سێ دینار بە کرێکار دامەزراین. ئەوانەی ناوم لە بیرن: وەسمانی قادری وەسمانە ڕەشی، حوسێن فسیال، تۆفیق کاوانی، عەوڵای مەلا خدری، ئاورەحمانی حەلێ سۆفیە کۆری کە کابرایەکی خوێندەوار بوو و کرا بە سەرکاری ئێمە. ئەو کابرایە یەکەم کەس بوو بە منی ووت کە ناوی قادر حەمەدئەمین درێژە و قادری گۆزێ بەکاربێنە ئاسانترە، چونکە

ناورەحمان بەیانیان ناوی ئێمەی دەخوێندەوە و کارەکەی بۆ دیاری دەکردین. هەر دە ڕۆژ جارێکیش پارەکەی بۆ وەردەگرتین. کاری ئێمەش زۆر ئاسان بوو وە تەنها پاك و خاوێنی ناو کەمپەکەمان دەپاراست لە پاشماوەی جگەرە و پەڕی کاغەز و شتی لەو بابەتە.

لە ناو سەربازگەکەشدا، دوکانێکی زۆر گەورە هەبوو کە شتی زۆر بە هەرزان دەدایە سەربازەکان. بەڵام ئێمە بۆمان نەبوو هیچ شتێك لەم حانوتە بکڕین. بە هۆی جەنگی جیهانی دووەمیشەوە، هەموو شتێك لە بازاڕ یان زۆر گران ببوو یانیش دەست نەدەکەوت. هەتا ئەم ساڵانەی دواییش و دوای ئەوەی هاتمە ئەمریکا، نەمدەزانی هۆکاری نەبونی شتومەك لە بازاڕ چی بوو. بەڵام بۆم دەرکەوت کە هەموو کارگەکانی ئەم وولاتانە کرابوونە بەشێك لە پرۆسەی جەنگ و هەر کارگەو یەکێك لە پێویستیەکانی بەرەکانی جەنگی دابین دەکرد. ئێمە بە هۆی سەربازەکانەوە دەرمان چا و شەکر و پاکەتە جگەرەمان وەردەگرت و ئەوەی بەکارمان نەهێنابا لە دەرەوە دەمان فرۆشتەوە. بە تایبەتی لە پاکەتە جگەرەکان سودێکی زۆرمان دەبینی، کە جۆرە پاکەتێکی ئینگلیزی بوو بە ناوی "پلەیەرس" و پەنجا جگەرە لە قوتویەکی تەنەکەدابوو. ئەو پاکەتە لە دەرەوەی کەمپەکە لە هەموو شتێك باشتر دەفرۆشا. من و وەسمان قادرە ڕەش، ئەو کەل و پەلانەی کە لە سەربازە هیندیەکان بە هەرزان دەمانکڕینەوە، لە نزیك قەبرستانی گردی زەیتون بە نرخێکی باش دەمانفرۆشتنەوە و قازانجمان دەکرد.



قوتوی جگەرەی پلەیەرس

لە کاتی پشوودان لە شوێنی حەسانەوەماندا، یاری بیست و یەکمان لەسەر گوێز دەکرد. بەڵام تۆفیق کاوانی کابرایەکی لە ئێمە ووریا تر بوو وە ناوێنەیەکی بچوکی لە کۆشی خۆی دادەنا و ئێمەش کەسمان ئەمان دەزانی. لە کاتی داباشکردنی کارتەکاندا، ئەو دەستی ئێمەی دەبینی و گوێزی زۆری لێ دەبردینەوە.

ئەو ماوەیەی کەمپەکە لە سەرمەیدان بوو، لە نزیك ئەو شوێنەی ئێستا مزگەوتی حاجی ڕەشیدی لێیە، سینەمایەکیان دانابوو. شەوێك فلیمی هیندی و شەوێکیش فلیمی ئینگلیزیان لێدەدا، بەڵام ئێمە زیاتر چێژمان لە فلیمە هیندیەکان وەردەگرت. هەروەها جاروبار گۆرانی بێژ و سەماکەری کچی هیندیان دەهێنان و ئاهەنگیان دەگێڕا. من زۆر بە جوانی فێری زمانی ئوردو ببووم، بەڵام ئێستا تەنها کەمێکیم بیرماوە. ئەو چاودێرەی ئێمە، ئەفسەرێکی دەرەجە دووی هیندی بوو بە ناوی خودا بەخش کە زۆر ببوو بە برادەرم و هاوکاری زۆری دەکردم. ئەو شیعرەکانی خەیامی بە زمانی ئوردو بۆ دەخوێندمەوە و منیش هەمان شتم بۆ ئەو بە زمانی کوردی دەخوێندەوە. ئەو کات خوێندەواریشم نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆرم حەز لە شیعرەکانی خەیام بوو، هەموویم لە ڕێی گوێگرتن لەبەر کردبوون.



چەند سەربازێکی هیندی
لە سوپای ئینگلیز

ماوەی ئەم کەمپە درێژەی نەکێشا، بەڵام بۆ ئێمە و بۆ خەڵکی شەقڵاوە بەگشتی زۆر باش بوو و سوودێکی زۆرمان لێ بینی. دوای ڕۆیشتنیان، لە دوای خۆیاندا کەل و پەلێکی یەکجار زۆریان بەجێ هێشت وەك: خاکەناس و تەور و خێمە... خەڵك بە کۆمەڵ ڕوویان لە کەمپەکە کرد و هەر کەسێك گورج و گۆل بوایە، بۆ خۆی شتێکی دەست دەکەوت. چونکە خەڵکەکەش نەدار بوو، زۆر کەسم دەدی لە پەڕۆ ئەستورەکەی خێمەکان جل و بەرگیان بۆ خۆیان دوری بوون. بەڵام ئەو پارچانەی لە کۆتایی خێمەکان شۆڕببونەوە، قوماشی زۆر باش بوون و سێ پارچە قوماش لەسەر یەك دورا بوون. یەکیان خامی سپی و ئەوی تریان خامی ڕەش و سێیەمیان قوماشێکی توندو بەند بوو. پانیەکەیان نزیکەی گەزێك دەبوو وە بە هەر چواردەوری خێمەکە شۆڕببونەوە. من و وەسمان قادر، سێ لەو دامێن خێمانەمان هێنان و بۆ ماوە دوو سێ ساڵ هەندێك جلوبەرگی هەردوو خێزانەکەی لێ دروست کران. من خاکەناسێکی ئینگلیزیشم هێنا و بۆ ماوەی بیست ساڵ زیاتر بەکارم هێنا.

# داری هەورس

لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، هاوڕێی دێرینیم مامۆستا و ڕۆشنبیر جەلال مەلا حەسەن هاتە لام و باسی لە هەوڵەکانی خۆی لەگەڵ چەند نوسەر و ڕۆشنبیرێکی کورد دەکرد، کە بە نیازن گەلێك بابەت و سومبولی کوردەواری کۆن زیندوو بکەنەوە. جەلال دەیزانی کە من زانیارم دەربارەی زۆر بابەت لا دەست دەکەون. یەکێك لەو بابەتانەی پرسیاری لە من دەکرد، دەربارەی دارێکی ئەفسانەیی بوو بە ناوی داری هەورس. بە قسەی ئەو، ئەم دارە ئەفسانەییە لە سەردەمی پێغەمبەر زەردەشت، هەم دارێکی پیرۆز و هەم لە کوردستان دارێکی زۆر باو بووە. بەڵام لە سەردەمی ئەو دەولەتە عەرەبیانەی بەناوی ئاینی پیرۆزی ئیسلام حوکمڕانیان دەکرد، بڕیاری لەناوچونی ئەم دارە دراوە.

مامۆستا جەلال دەیووت، دەولەتە عەرەبیەکان لەو باوەڕە دابونە، کەوا ئیرادەی عروبیەت لە ناو میللەتی کورد و میللەتە ئێرانیەکان گەشە ناکا، هەتا پیرۆزیەکانی ئاینی زەردەشت لەناو نەچن. ئەم بۆچونەش هۆکاری سەرەکی بووە لە بڕیاری ئەو دەولەتانە بۆ لە ناوبردنی ئەم دارە.

من بە مامۆستا جەلالم ووت کە زانیاریەکی زۆرم لەسەر مێژووی ئەم دارە و هەوڵەکانی لەناوبردنی نیە، چونکە هیچ سەرچاوەیەکم دەربارەی ئەم بابەتە دەست نەکەوتوە و ئەوە یەکەم جارە گوێم لە مێژووی ئەم دارە دەبێ! بەڵام پێم ووت من خەبەرێکی زۆر خۆشم بۆ ئەو پێیە، من ئەم دارە دەناسم و نەك هەر لە ناونەچوە، بەڵکو هێشتا لە کوردستان ماوە. ئەوەی من بیزانم و بە چاوی خۆم دیبم، لە دوو شوێنی نزیك شەقڵاوە ئەم دارە بوونی هەیە. لە چاکی گوندی کاوانیان لە بناری سۆرك لە نزیك کانیاوەکە، چەند دارێکی لێ ماوە. هەروەها لە کاتی پێشمەرگایەتیش، پاش شەهید بوونی مەحمود کاوانی لە گوندی ناقوبان، موقەدەم عەزیز ناکرەیی و لێپرسراوەکانی تری ئەو کاتی ناوچەی خۆشناوەتی، بڕیاریاندا لە تۆڵەی شەهید بوونی مەحمود، چیای سەفین لە دوژمن پاك بکەینەوە. ئەوەی دەمەوێ لێرە باسی بکەم، لە دوای گرتنەوەی سەفین، ئێمە مەفرەزەیەکی یازدە کەسی، تەرخان کراین بۆ پاراستنی دیوی پشتەوەی سەفین، دەبوایە نێوان گوندی بیرێژ و سەری ڕەش بپارێزین، ئەوەکا دوژمن لە سەری ڕەشەوە هێرش بێنێ. کە چوم بۆ بیرێژ، دارێکی هەورسی زۆر جوان لە پشت گوندی بیرێژ بەلای گوندی کۆڕێدا هەبوو. شایانی باسە، داری هەورس دارێکی هەمیشە سەوزە و لە داری سنەوبەر دەچێ.

کاك جەلال بەم هەواڵە زۆر دڵخۆش بوو وە دەم و دەست بابەتێکی لەسەر ئەم دارە نوسی و لە یەکێك لە گۆڤارە کوردیەکان بڵاوی کردەوە. پێموابێ بابەتەکەی لە یەکێك لە ژمارەکانی گۆڤاری بەیانی ساڵی ١٩٨٢ بڵاوکردەوە. ئاماژەشی بەوە کردبوو کە ئەم زانیاریەی لە من وەرگرتوە.

لەوەش خۆشتر، لە ڕۆژی ٢٠١٣/١/٣، لە بەرنامەی کشتوکاڵی تەلەفزیۆنی زاگرۆس، هەواڵێکی دڵخۆشکەرم بیست. یەکێك لە کارمەندانی دارستانی هاوینەهەواری پیرمەم بە ناوی سەردار، لە بەرنامەکە ناوی داری هەورسی لەناو ئەو دارانە هێنا، کە بونیان لە ناوچەی تەوسکەی چیای سەفین هەیە.

هەر ئەمساڵ، کاتێك سەرقاڵی نوسینی ئەم پەرتوکە بووم، پەرتوکێکی مێری بۆیسم کەوتە بەردەست، بەناوی "ئاینی زەردەشت سێ هەزار ساڵ باوەڕ و دەسەڵاتی ئەمر". مێری بۆیس یەکێکە لە توێژەر و نوسەرە هەرە باشەکانی دونیا دەربارەی ئەم بابەتە و چەندین پەرتوکی بەنرخی لەم بوارەدا هەن. ئەم پەرتوکە لەلایەن ئەبولحەسەن تەهامی وەرگێردراوەتە سەر زمانی فارسی و لەلایەن کاك فەرشید شەریفی لەساڵی ٢٠١٠ کراوە بە کوردی. لەم پەرتوکە، داری هەورس بە "سەولی کەشمەر" ناوی هێنراوە. هەروەها مێری بۆیس، مێژووی سەرهەڵدانی ئاینی زەردەشت و ئاوێستا دەگەڕێنێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی ١٢٠٠ی پێش زایین. بەم چەشنەش، زەردەشت بە ٢٠٠ ساڵێك پێش موسا پێغەمبەر بووە.

لە لاپەڕە ٤٥ی ئەم پەرتوکە هاتوە "زەردەشت دەچێت بۆ بارەگای گوشتاسپ لە ناوچەی یان شاری بەڵخدا و گوشتاسپ خۆی و خەڵکە ژێر دەستەکەشی ئاینەکەی قبووڵ دەکەن. پاشان گوشتاسپ ئاورگەی ئازەر بەرزین بنیات دەنێت و ئیدیعای ئەوە دەکرێت کە ئەوە یەکەمین ئاورگەی جیهانە و زەردەشتیش لەبەردەمیدا دارە سەوڵێك دەچێنێت...". هەر لە هەمان لاپەڕەدا نوسراوە "لەم سەدانەی دوایی، دوو نوسەری موسوڵمان بە ناوەکانی قەزوینی (سەدەی سێزدەهەم) و مستەوفی (نیوەی یەکەمی سەدەی چواردەهەم) دانیان بە بوونی سەولی پیرۆزی کەشمەردا ناوە. قەزوینی وتوویەتی ئەو سەوڵە هەتا ساڵی ٨٦١ ی زایینی، بەوپەڕی شکۆوە لە گەشەکردندا بووە تا کاتێك بە فەرمانی متوەکلی خەلیفەی عەباسیەکان بڕیانەوە و کۆمەڵگای زەردەشتیش تووشی غەم و پەژارەیەکی گەورە هات... کەشمەر گوندێکە لە نزیك تۆرشیز لە هەرێمی پێسووی پارتیەکان".

پیدەچێ توێژەر و نوسەری هەرە باشی زەردەشتناس مێری بۆیس، زانیاری دەربارەی مانی داری هەورس تا ئێستا نەبووە، هەرچەندە چەندین کتابی بەنرخی لەم بوارەدا نوسیون. بەداخەوە ئەم خانمە دوای پەنجا ساڵ لێکۆڵینەوە لەم بوارەدا، لە ساڵی ٢٠٠٦ کۆچی دوایی کردوە.

لە بیرمە لە ساڵانی چلەکان، محەمەد ساڵحی زاوام خانوەکی زۆر کۆنی هەبوو لە سەر شەقامی سەرەکی بازاڕی کۆنی شەقڵاوە، کە کەوتبووە نێوان مزگەوتی گەورە و قشڵە وە بە خانوی پیرێ ناسرابوو. مێژووی دروستکردنی ئەم خانوە دیار نەبوو و خەریك بوو بڕوخێ. محەمەد ساڵح داوای لە من و حەمەدئەمین هێگۆی ئامۆزای خۆی کرد، کە یارمەتی بدەین بۆ تێکدانی خانوەکە. زۆربەی دارەکانی ئەم خانوە لە داری هەورس بوون. کۆنترین شوێنەواری زیندو لە شەقڵاوە، کلێسە کۆنەکەی شەقڵاومیە لەسەرگردی دێرێ، کە لە ساڵی ١٢٠٠ی زاینی دروستکراوە. ئەمە مانای وایە کە شەقڵاوە بەر لە٨٠٠ ساڵ ژیانی تێدابووە و ئاوەدان بووە. چونکە ئەم کلێسەیە زۆر بە مەحکەمی دروست کراوە، لەوانەیە ئاوەدانی بە چەند سەدەیەك بەر لەو مێژووە بونی هەبوبێ. بۆیە دەپرسین کە ئاخۆ مێژووی دارەکانی خانوە کۆنەکەی محەمەد ساڵح چەند کۆن بن؟ ئایا ئەم دارانە زۆر کۆن بوون و دەگەڕێنەوە بۆ بەر لە بڕیاری لەناوبردنیان؟ یاخود دەبێ دوای بڕینەوەیان، ئەم دارانە جارێکی تر لە ڕەگەکانیان شین بوبنەوە و داری گەورەی لێپەیدا بووبێ کە بۆ خانوو بەکار هاتبن؟

سەیر لەوەدایە کە هەوڵەکە بە لەناوبردنی دارەکە نەوەستاوە، بەڵکو هەوڵێکی لەوەش خراپتر دەرحەق بەم دارە و میللەتی کورد بە شێوەیەکی گشتی پەیڕەو کراوە. لە بیرم دێ لە کاتی منداڵیم و هەتا بەم نزیکانەش، ئەگەر دایکێك لە منداڵەکەی توڕە ببایە، پێی دەووت "بڕۆ هەی سێبەری هەورسێ". من ئێستا لەخۆم دەپرسم، دەبێ چۆن ئەم کەلتورەی نەتەوەیی میللەتی کورد بەر لە هاتنی عەرەب، بوبێتە شتێکی ڕەزا قوڕس و ناشیرین، ئایا ئەمەش بەرنامەیەکی تری تەعریب نەبووە؟

بەگوێرەی مێژوو ئەگەر کورد نەبوایە، عەباسیەکان قەت نەیاندەتوانی دەسەڵات بگرنە دەست. ئەبو موسلمی خوراسانی کە کورد بووە، زۆربەی ناوچەکانی لە ژێر دەسەڵاتی ئەمەویەکان دەرهێناوە و ئەبولعەباسی سەفاحی لە زیندان دەرهێناوە و کردویە بە فەرمانڕەوا. پاشان ئەبو جەعفەری مەنسوری برای سەفاح، ئەبو موسلمی خوراسانی کوشتوە. ئەگەر تەماشای مێژوو

نوسان، زانایان، دکتۆرەکان...ی سەردەمی عەباسیەکان بکەین، دەبینین زۆربەیان کورد و فارس بوون.

ئەگەر بنەماڵەی بەرمەکیەکانیش نەبونایە، کە کورد بوون، عەباسیەکان قەت دەوڵەتیان بۆ نەدەبردرا بەڕێوە. کەچی پاش چەسپاندنی دەوڵەتەکەیان، بڕیاری قەتلوعامی بەرمەکیەکانیشیان دەرکروە. وەستا عەبدوڵای زەخی ناسراو بە عەولا کوێر، بۆی گێرامەوە کە بنەماڵەی موستەفای نالشەوان ئەوەی ئەو بەرمەکیانەن کە بڕیاری قەتلوعامیان بۆ دەرکراوە و ڕایان کردوە بۆ دۆڵی بالیسان. لە نزیك گوندی ئالانە گوندێك هەبووە بەناوی قەرەجۆك، لەوێ خۆیان حەشارداوە. پێش دەچێ ناوی قەرەجۆك لە بەرمەکیە هەڵاتوەکان هاتبێ کە وەك ئاوارە ڕایان کردوە بۆ ئەوێ، یاخود بە خۆیان ئەو ناوەیان لەخۆنابێ هەتا کەس نەزانێ کە ئەوان بەرمەکیە هەڵاتوەکانن.

لەم چەند ساڵانەی دواییدا، بۆم دەرکەوت کە داری هەمیشە سەوز لەلای ڕۆمانەکانیش دارێکی پیرۆز بووە، بەڵام ڕۆمانەکان زۆر لەدوای زەردەشتیەکان ئەم باوەڕەیان هەڵگرتوە. لە یەکێك لە کەناڵەکانی تەلەفزیونی ئەمەریکا، بەرنامەیەکی دوور و درێژی چەند سەعاتی لەسەر هێرشەکەی ئەسکەندەری مەقدۆنی بۆ سەر کوردستان و ئێران بڵاوکرایەوە. هەر لەم بەرنامەیەدا و پاشان لە بەرنامەیەکی دۆکیومێنتی لە تەلەفزیونی کوردسات دەربارەی هەمان بابەت کە لە ڕۆژی ١٨ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٢ بڵاوکرایەوە، ئاماژە بەوە کراوە کە ئەسکەندەر دوای داگیرکردنی تەختی جەمشید، نەك هەر کۆشك و تەلارەکەی لەبەر جوانیەکەی سوتاندوە، بەڵکو بڕیاری داوە کە هەرچی پەرستگاو ئاتەشکەدەی زەردەشتیەکان هەیە، هەر هەموویان بسوتێنێ. دیارە ئەسکەندەریش بەر لە عەرەب بە ١٠٠٠ساڵ، گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی کە هێزو و توانای میللەتی کورد و میللەتە ئێرانیەکان تەنها لە باوەڕەکەیان دابووە. بەڵام ئەسکەندەر ماوەی حەوت ساڵ لەم ناوچەیە ماوەتەوە، هەتا پاشان لە ناوچەی بابلی خواروی عێراق بە نەخۆشی مردوە.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە کە ئایا ئەسکەندەر داری هەورسی بە دارێکی پیرۆز نەزانیوە؟ ئایا پاشماوەی هێزەکەی ئەسکەندەر ئەو باوەڕی داری پیرۆزیان لەگەڵ خۆیان نەبردۆتەوە بۆ یۆنان و پاشان ئەم باوەڕە پەڕیبێتەوە بۆ ڕۆمانەکان؟ ئەی ڕۆمانەکان لەسەر پاشماوەی یۆنانیەکان خۆیان بونیات نەناوە؟

ڕۆمانەکان ئەم باوەڕەی خۆیان بە داری پیرۆز تێکەڵ بە کرستیان و مەسیحیەت کردوە و ئەم دار ڕازاندنەوەی سەری ساڵ هەرهەمان داری پیرۆزی ڕۆمانەکانە. لەم یەك دوو ساڵەی ڕابردوو، خەریکە ئەم دارهەڵدانە لە دەورو بەری سەری ساڵ لە کوردستان دەکرێ بە نەریت. بەڵام دەکرێ ئەم پرسیارە بکەین کە ئایا ئەمەیان هەمان داری هەورسی خۆمان نیە کە بە جۆرێکی تر بە ئێمە دەفرۆشرێتەوە؟

بە ڕای من هەویری ئەم بابەتە ناوی زۆری دەوێ، هەم لە ڕووی مێژوویی و هەمیش لە ڕووی کەلتوری لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زۆری پێویستە. بەداخەوە من زانیاری لەوە زۆرترم لەسەری نیە، بەڵام هیوام وایە زانایان و خەم خۆرانی کورد لەم بابەتە بکۆڵنەوە. پێویستە هەرچی زووە شارەزایان هەوڵی زیندوو کردنەوەی داری هەورەس بدەن و جارێکی تر بە هەموو میللەتی کوردی بناسێننەوە. چاك وایە هانی خەڵکی کوردستان بدرێ کە چاندنی داری هەورس بکەن بە نەریتێك و لە ڕۆژانی نەورۆز ئەم دارە لە هەموو شوێنە گشتیەکان و لە هەر ماڵێکی کوردستان بڕازێننەوە. هەتا ئێمەی کوردیش وەك هەموو میللەتانی دونیا، شانازی بە مێژوو و کەلتوری نەتەوەکەمان بکەین.

# ئینگلیز و ویلایەتی موسڵ

پاش ئەوەی ئینگلیز لە ساڵی ١٩٢٦، زۆربەی سەرۆک هۆزەکانی کوردستانی باشوری ڕازیکرد کە دەنگ بدەن تا ویلایەتی موسڵ بخەنە سەر دەوڵەتە نوێیەکە، خۆی لە کێشەی کورد بێ منەتکرد. بەڵام پاش ئەوەی مەلیك مەحمود جارێکی تر بەرامبەر ئینگلیز ڕاوەستا، شەڕێکی قورس لە ناوبارێك، لە نزیك شاری کفری لە ساڵی ١٩٣١ ڕوویدا. بۆیە ئینگلیز لە هەوڵی ئەوە دابوون زۆرترین دۆست لە نێو هۆزە کوردەکان لە دەوری خۆیان کۆ بکەنەوە و ڕازیان بکەن بۆ ئەوەی خەڵك ئێنە دەنگ لەدژی ئەوەی ویلایەتی موسڵ بخرێتە سەر عێراق. لە هەر شوێنێکیش نارەزایی سەرۆك هۆزێکیان بەدی کردبایە، هەوڵیان دەدا تۆی ناکۆکی و دووبەرەکی لە نێوانیادا بچێنن. لە ناوچەی ئێمەشدا، دروستکردنی ڕێگای هاملتۆن بەشێك بووە لەم بەرنامەیە و لە بەشێکی تری ئەم پەرتوکەدا بە درێژی باسم کردووە. کاتێك دەوڵەتی عێراقیش بووە ئەندامی کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبەت اللامم) لە ساڵی ١٩٣٢، ئینگلیز ناچار بوو کێشەی ویلایەتی موسڵ بخاتە بەرنامەی ئەو ڕێکخراوە. بەڵام دوای شکانی شێخ مەحمود و دوورخستنەوەی بۆ خوارووی عێراق، بەرنامەکە پشتگوێ خرا و ئینگلیز ڕێگەی نەدەدا کەس باسی ئەو بەرنامەیە بکا. لەساڵی ١٩٩١، هەوڵی زیندووکردنەوەی ئەو بەرنامەیەی ویلایەتی موسڵ لەلایەن حیزبێکی کوردستان درا، بەڵام سەری نەگرت. ئەحمەد موختار بەگی جاف، لە شیعرێکیدا دەڵێ:

ئەم قەراری عەسبە وا خەڵکی دەڵێن بۆ کورد دەبێ
هەر قسەی ڕووتە، قسەش ناچێتە ناو گیرفانەوە

لە شەقلاوەش ماوەی شەش ساڵ، گەورەترین ناکۆکی کەوتە نێوان میرانی قادر بەگ و میرانی ڕەشید بەگ لە پێناو دەنگ هێنانیان لەلایەن ئینگلیز و نوێنەرایەتی کردنی هۆزی خۆشناوان. هەرچەندە لە ماوەی ئەم شەش ساڵەدا خۆش بەختانە کار نەگەیشتە سەر ئەوەی شەڕی چەکداری بەرپا ببێ و خوێن برژێ، بەڵام لە دەوروبەری هەردوولا چەند کەسانێکی نەفەس نزم، ئەم کێشەیان بۆ مەرامی تایبەتی خۆیان قۆزتبوەوە و هەوڵیان دەدا کێشەکان قوڵتربێن. شەوانە هەڵیان دەکوتایە سەر ڕەز و باغی خەڵکی هەژار و سەپانی هەردوو میرەکان و ڕەز و باغی هاوڵاتیانیان تێك دەدا و پاوان و خەرمانەکانیان دەسووتاندن. بەم کارەشیان، زیاتر خەڵکی هەژار زەرەرمەند بوو. خۆشبەختانە ئەم کێشەیە دوای شەش ساڵ کۆتایی پێهات و خەڵکەکەش لەم دڵە ڕاوکێیە و ماڵوێرانیە ڕزگاری بوو. ڕەز و باغەکەی باوکیشم بەر ئەم

لێشاوە کەوت و زۆربەی زۆری مێو و دارە بەرییەکانمان بڕان و دار ئەسپیندارەکانمان سپی کران. لەبیرمە ئەوکات پۆلیس دەهات و زیانەکانیان دەخەملاندن. زیانەکانی ئێمەیان بە ٧٠ لیرە خەملاندن، بەڵام کەس قەرەبوو نەکرایەوە.

# عەسکەری تورك

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەردەوام لە جەنگدابووە و خەڵکی بە زۆرەملێ بۆ عەسکەری بردوە. وادیارە ئەم ڕاپێچکردنە هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی گرتبوەوە. چەند کەسێك لە شەقڵاوە کرابوون بە عەسکەری تورك و بەسەرهاتی زۆر خۆشیان دەگێڕایەوە. لەوانە خدرە لاڵ لە جەنگی جیهانی یەکەم بۆ ماوەی دە ساڵ یان زیاتر لە ڕوسیا ئەسیر بووە، دەیگوت حەوت ساڵ لەوێ گاوان بووم و قسەی زۆر خۆشی دەگێڕایەوە. بیا گۆرگیزی باوکی بابەجانی وێنەگریش لە ڕوسیا بەدیل گیراوە. حەسەنی گاوان، حمدئەمینی جەردەی، سەعدی نێرك، مستۆی عەوڵا موسڵی، مینۆی شاقوڵی و بەکری قادۆلی مامم، هەموویان سەربازی عوسمانی بوون. هەروەها عەدیلی مامی باوکم سەربازی تورك بووە و لە موسڵ کۆچی دوایی کردوە. کاتێك خەبەر هاتوە کە گوایە لە موسڵ نەخۆشە، قادۆلی باپیرم دەکەوێتە ڕێ و بەدوایدا دەچێ. بەداخەوە هەتا ئەو گەیشتبوو، عەدیل مردبوو و لە نەبی یونس بەخاك سپێردرابوو. باوکم دەیگێڕایەوە کە قادۆل هاتەوە، هەردوو کەلانگوچکی لە خم نابوون، وەك نیشانەیێك بۆ مردنی عەدیلی برای.

مینۆی شاقوڵی تورکی باش دەزانی و پێش جەنگی جیهانی یەکەم عەسکەر بووە. سۆفی برایمیش یەکێك بوو لە عەسکەرانی تورك و زمانی تورکی و عەرەبی زۆر باش دەزانین. ئەو دەیگێڕایەوە کە ڕاهێنانی بە هەولێری و پردێیان دەکرد و تورکەکان بە تورکمانەکانی هەولێر و پردێیان دەگووت "ئەو تورکیەی ئێوە چ زمانێکە، هەی دین تەرسن نۆغلی" واتە (کوڕی دین بەرواژی)، تورکەکان زمانی تورکمانی ناوچەکەیان بەدڵ نەبووە. بەڵام سۆفی برایم هەردووکی دەزانین و تەرجومەی بۆ کردبوون. هەر ئەو دەیگێڕایەوە کە هێزی ئینگلیز لە جەنگی جیهانی یەکەم لە خوارووی عێراق لە پاپۆڕ دابەزیون، زۆربەی سەربازە تورکەکان ڕایانکردوە و فەرماندەکەشیان خۆی کوشتوە. هێزی تورك لە بەسرا عەمبارێکی گەورەی گەنم و جۆی هەبووە و سوتێندراوە. سۆفی برایم و چەند کەسێکی تر، تا کوردستان بە پێیان هاتونەتەوە.

بایزی مەدەی پیاوێکی دەنگ گەورە بوو وە پێیەکانی زۆر پان و گەورەبوون. کاتێك بۆتە سەربازی تورك، هیچ پێڵاوێکی بۆ نەبوە و ناچار پێڵاوی تایبەتیان بۆ دروستکردوە. جارێکیان لە حەلەب کە شارێکی پێشکەوتو و شوێنی بازرگانی بووە، لەکاتی نمایشی سەربازی، چەند کچێکی جوان بە جلی مۆدە لە دەستی ڕاستی ئەوان تێدەپەڕن. بایز خۆی بۆ ناگیرێ و بە تورکی و بەدەنگە

گەورەكەی فەرمان بە هەموو سەربازەكان دەدا و دەڵێ "ساغەیار باخ"، دەیگوت مانای بەلای ڕاستدا بنواڕە. هەموو سەربازەكان بە یەكجار ڕوو لەلای ڕاست دەكەن. فەرماندەی سەربازەكان زۆر هەوڵدەدا بزانێ كێ ئەو هاوارەی كردوە، بەڵام كەس ئامادە نابی ناوی بایز بێنێ چونكە دەیانزانی زۆر بە توندی سزادەدرێ. پاشان هاوڕێكانی لێیان پرسیوە كە بۆچی ئەو شتەی كردوە؟ بایزیش دەڵێ "كە كچەكانم بینی، وامزانی من فەرماندەی هەموو سوپاكەم".

حاجی برایمی سەرگردیش سەربازی توركی عوسمانی بووە. لە جەنگی جیهانی یەكەم لەگەڵ چەندین كەسی تری خەڵكی شەقڵاوە لە سەربازی ڕادەكەن. ئەوكاتیش ڕێگری زۆر بووە و هەندەك لە ڕێگرەكانیش هەر جەندرمەكانی تورك بوون. بۆیە ئەوەی پارەی پێبوایە، لەترسی دز و ڕێگر پارەكەی قووتدەدا. پارەی ئەوكاتیش لیرەی زێڕی عوسمانی بووە. وادیارە ڕێگرەكانیش بەم بەزمەیان زانیوە، بۆیە دەستیان بە كوشتنی خەڵك كردوە و زگیان هەڵدڕیون تا لیرەكان بۆخۆیان ببەن. حاجی برایم دەیگێڕایەوە لە بەینی موسڵ و غازر دوو ڕێگری هاتونەتە سەر ڕێگا و ویستویانە بیكوژن، بەڵام ئەو خەنجەری پێبووە و بەرگری لە خۆی كردوە و توانیویە هەردوو ڕێگرەكە بكوژێ و لەناو قەمیشان خۆی حەشار داوە تا شەو داهاتووە، ئینجا كەوتۆتەوە ڕێ. شایانی باسە تا ئەم دواییەش ئەو شوێنە هەر بە كەندێ حاجی برایمی بەناوبانگ بوو.

# کاوێس ئاغا

کاکە وەیس ئاغای لاوك بێژ لە هۆزی هەرکی بوو و باوکم دەیگێرایەوە کە لە ساڵانی شەڕی جیهانی یەکەم کەوتۆتە شاری شەقڵاوە. هەروەها دەیگووت سەرەڕای نەداری خەڵکی کوردستان، دەوڵەتی عوسمانی زەخیرەی بە زۆرەملێ لە خەڵکی دەستاند، پێموابێ ئەو مەسەلە کوردیەی کە دەڵێ "ماڵی نەخۆری لۆ چەکمە سۆری" لە پێڵاوە سورەکانی سوپای عوسمانی هاتووە. بۆ هەڵگرتنی زەخیرەکان لە ناوچەی نێمە، کلێسەی مەسیحیەکانیان لە گردی دێرێ کردبووە کۆگە و کاوێس لەو کۆگەیە چاودێر بوو، بەڵام کاوێس بە نهێنی زەخیرەی داوە بە خەڵکی فەقیر و چاکەی بۆ خەڵکی ناوچەکە هەبووە. دوای تێکچونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، کاوێس هەرلە شەقڵاوە ماوەتەوە و خێزانی پێکهێناوە.

من هەرلە منداڵی تاوەکو دەور و بەری تەمەنی ١٠ ساڵی کاوێسم دیوە، بەڵام ئەو شتانەی کە دێنەوە بیرم لە ساڵی ١٩٣١ بەرەو سەرەوەبوو. لە ساڵی ١٩٩٨، هونەرمەندی گەورەی کورد هۆمەری دزەیی پەیوەندی پێوەکردم، کە ئەوکات لە ڕادیۆی دەنگی ئەمریکا کاری دەکرد و چاوپێکەوتنێکی دەربارەی کاوێس ئاغا لەگەڵ سازکردم. هەروەها لە چاوپێکەوتنێکی تریش لەگەڵ کاك شاری بارنامەی ناودارانی کورد لە ڕادیۆی میسۆپۆتامیا لە ساڵی ٢٠٠٥ بە تێر و تەسەلی باسی ژیانی کاوێس ئاغام بۆ بیستەران گێرایەوە.

کاوێس پیاوەکی بەژن درێژی باریکی ڕەش ئەسمەر بوو. کەسایەتیەکی زۆر خوێن شیرینی هەبوو و شەدەیەکی ڕەشی لەسەر دەنا. چاو و برۆی ڕەش بوون و هەردەم ردێنی نەتاشی. زۆربەی کاتەکان رانك و چۆغەڵی دەستوری بادینی داغ داغی لەبەر دەکرد، کە بە نامروش (ناوریشم)ی کەسك نەخشابوو. لە زستان پەستەکێکی سپی و پێڵاوی ڕەزوقی لەبەر دەکردن. لە هاوینیش کڵاشی کۆیی سەربە نارموشی لەبەر بوون. هەندێك جاریش کورتەك و شەڕواڵێکی نێرانی زەردی لەبەر دەکرد و نیفۆکانی بە خامی وەنەوشەیی دورابوون و ئەو کات ئەو دەستورە باو بوو.

دۆستایەتی ئەو لەگەڵ باوکم زۆر نزیك بوو و ماڵیان لە سەرووی ماڵی نێمە بوو. زۆر جار کاوێس دەهاتە ماڵی نێمە و لەگەڵ باوکم دادەنیشت، دوای نانخواردن دەستی دەکرد بە لاوك گووتن و زۆر لە هاوڕێیانی باوکم دەهاتن. چونکە من تاقانەی باوکم بووم، لەگەڵ ئەوان دەمتوانی دابنیشم. بەڵام منداڵ بۆی نەبوو زۆر قسە لەگەڵ گەورە بکا، وە ئەگەر پرسیاریان لێ کردبام،

دەبوایە هەر بە بەڵێ وەڵام بدەمەوە. زۆرجار ماڵمان پڕدەبوو لە خەڵك و هەرچەندە زستانیش بوو، بەڵام حەوشە و سەربان و دیوارەکانیش پڕدەبوون لەو پیاو و ژن و منداڵانەی کە حەزیان دەکرد گوێبیستی دەنگە زوڵاڵەکەی کاوێس بن. مام ڕەشیدی بایزی کە دۆستێکی تری باوکم بوو، حەکایەت خوانێکی چاك بوو و گۆرانیشی دەزانین. لە دانیشتنێکی ماڵی ئێمە، کاوێس داوای لە مام ڕەشید کرد گۆرانی پایزی بۆ بڵێ تا بیکا بە قەوان. مام ڕەشید چەند جارێك گۆرانیەکەی بۆ گووت و ئەویش لەبەری کرد. لە هاوینیش کاوێس دەهاتە ناو باغەکانی ئێمە و لەگەڵ باوکم دادەنیشت، بەڵام لەوێ خەڵك کەمتر کۆدەبوونەوە چونکە ئاوەدانی لە ناو باخچەکان کەمتر بوو.

کاوێس خۆی دەیگووت من ئاغانیم، بەڵام وەك ڕێزێك ئەو نازناوەی پێ درابوو. ژیانی ئەو خۆشتر بوو لە زۆرینەی خەڵك و جلوبەرگی ئەو پۆشتەتر بوون. خەڵك بە کاروان نانی پەیدا دەکرد، بەڵام ئەو بە لاوك گووتن. سەرۆك هۆزەکان بەتایبەتی هەرکیەکان زۆرجار داوایاندەکرد کە بچێتە لایان. زۆر جار کە میرانی قادربەگ میوانی دەهات، کاوێس ئاغاشی داوەت دەکرد. هەروەها بەشداری لە ئاهەنگی گەورە دەکرد و بە لاوکە خۆشەکانی خەڵکەکەی دەهێنایە جۆش.

کاوێس پیاوێکی زۆر بەڕێز بوو و خەڵك بە چاوی حورمەتەوە سەیریان دەکرد، بچوبا هەر شوێنێك، خەڵك هەموو لەبەری هەڵدەستان. کە لە چایخانەکان لاوکێکی تازەی کاوێس لەسەر قەوان لێدەدرا، خەڵك هەبوو لە خۆشیان حەماسی دەگرت و پیالەی لەیەکدەدان و دەیشکاندن. بەڵام کاوێس دڵی کەسی نەدەشکاند، لەدانیشتنەکان هەرچی داوایان بکردبا بۆی دەگووتن.

زمانی کاوێس لەکاتی قسەکردن دەگیرا وە بەزەحمەت قسەی بۆ دەکرا، بەڵام لە لاوك گووتن زۆر ڕەوان بوو. جارێك لە گەڵ باوکم دانیشتبوو و باسی سەردانەکەی شێخ مەحمودی بۆ دەکرد، ووتی "شێخ مەحمود باوەڕی نەکرد کە من کاوێس ئاغام، ناردی سندوقی بۆ بێنن و قەوانەکەی منی لێدا. ئینجا شێخ داوایکرد کە من لاوکێك بڵێم، منیش هەرهەمان لاوکم بۆ دووبارە کردەوە. شێخ مەحمود ووتی لەو باوەڕە نەبووم ئەتو کاوێس بی، چونکە قسەکردنت جۆرێکە و لاوك ووتنیشت جۆرێکی تر! دوواتر شێخ مەحمود خەڵاتێکی چاکی کردم".

سەعید قەساب و سەید ساڵحی شکاك، هاوڕێی کاوێس بوون وە بۆ زۆر شوێن لەگەڵی دەچوون. دێتەوە بیرم سید ساڵح شکاك ئەسپێکی ڕەشی هەبوو. ئەو

کاتانەش کە کاوێس دەچوو بۆ هەولێر، لە چایخانەی عەلی فلەیح لاوکی دەگووتن. ساڵی چەند جارێکیش دەچووە کۆمپانیا لە بەغدا بۆ قەوان تۆمارکردن، لە بیرمە ئەوکات خەڵك بە کۆمپانیایان دەگووت" قومپانی". هەندێك جار سەعید قەساب و عەلی فلەیحیشی لەگەڵ خۆ دەبردن بۆ کۆمپانیای تۆمارکردن. ئەگەر بە ووردی گوێ بگرین لە هەندێ لاوکەکانی کاوێس ئاغا، لە دواوە دەنگی چەقەنە و ئافەرین دێن، ئەوانە بەزۆری دەنگی ئەو دوو کەسەن.

پێموابێ کاوێس دووەم هونەرمەندی کوردە کە لە دوای سید علی ئەسغەر بەرهەمەکانی لەسەر قەوان تۆمارکراون. بەشێك لە لاوکەکانی کاوێس فۆلکلۆرن و پێش ئەو ووتراون، بەڵام هەندێکیشی لە دانانی خۆی بوون، وەك بەستەی ناری هەی ناری و گۆرانی هەی کاروانە. هەروەها هەرسێ لاوکی شۆڕشەکانی ئەو سەردەم (سمکۆی شکاك، شێخ مەحمود و بارزان) هی خۆی بوون. کاوێس نزیکەی ٤٢ تا ٤٣ قەوانی قیری تۆمارکراون و جگە لە هەندێك بەستە و سێ حەیران ئەوانەی تری لاوك بوون.

لە یەکێك لە دانیشتنەکانی ماڵی ئێمە، ژنێکی هەرکی لەگەڵ کاوێس بوو کە ناوی شەریف ئاغا بوو. ئەو ژنە نەك هەر ناوەکەی پیاوانەبوو، بەڵکو جل و بەرگەکانیشی هی پیاون بوون. کاتێك شەریف ئاغا پێویستی بە سەرئاو بوو، چوو بۆ سەقاوی ژنان و ئیتر ژنان لێیان ببوو بە هەرا کە چۆن پیاوێك هاتۆتە کانی ژنان. چونکە شەریف ئاغا ژنێکی گاڵتەچی بوو، یەکەم جار خۆی ئاشکرا نەکردبوو و دواتر بۆ ژنەکان دەرکەوتبوو کە ئەویش یەکێکە لەوان و ببووە پێکەنین. شەریف ئاغا لاوك بێژێکی دەنگ خۆش بوو و لەگەڵ کاوێس دەچووە دیوەخانان.

بەداخەوە لە زستانێکی سارد کە پێموابێ ساڵی ١٩٣٦ بوو، هەواڵی کوژانەوەی ئەستێرەیەکی گەشی شارەکەمان بە کۆچی دوایی کاوێس ئاغا پێگەیشت. دواتر هەواڵێکی ناخۆشترمان بەدەست گەیشت کە کۆچەکەی کاوێس مردنێکی ئاسایی نەبووە، بەڵکو لە گوندی میرئاوخوڕ کوژراوە و هەر لەوێش بەخاك سپێردرا. خەڵکی شارەکە بەگشتی و باوکم بە تایبەتی بەم هەواڵە زۆر دڵگیر بوون، بەڵام دڵخۆشیەکە ئەوەیە کە دەنگە خۆشەکەی کاوێس تا دونیا ماوە هەردەمێنێ.

## پرۆژەی ئاو و کارەبا و گەرماو

لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو، شاکر فەتاح دوا مودیر ناحیە و یەکەم قائیمقامی شەقڵاوە بوو دوای ئەوەی شەقڵاوە لە ناحیەوە کرا بە قەزا. هەر زوو ئەو پیاوە هەندێك کاری زۆر گرنگی بۆ شارەکەمان ئەنجامدان. سەرەتا داوایەکی بۆ وەزارەتی پەیوەندیدار نوسی و داوای پرۆژەی ئاو و کارەبا و دورستکردنی گەرماوێکی گشتی بەیەکەوەکردن. پاش ئەوەی وەزیریش ڕەزامەندی لەسەر هەر سێ پرۆژەکە دەربڕی، شاکر فەتاح هەموو پرۆژەکانی لە دەوروبەری ساڵی ١٩٥٥ جێبەجێ کردن. ئیتر ئاوی خاوێن بە بۆڕی دابەشکرا و دوو مەکینەی کارەبایان لە ئینگلستان بۆ شەقڵاوە هێنان و وێستگەی وەبەرهێنانی کارەبا دامەزرا، هەروەها گەرماوەکەش دروستکرا.

پێش پرۆژەی ئاو، سەرچاوەی سەرەکی بۆ ئاوی خواردنەوە لە شەقڵاوە پشت بەستن بوو بە کانیاوەکان. بۆ بەدەست هێنانی ئاویش، دەست مەنجەڵ یان مەشکەی ئاو و کوپ و تەنەکە بەکاردەهاتن. چونکە ماڵەکان زۆ بەیان شوێنیان بەرز و سەخت بوو، ئاوکێشان کارێکی ئەوەندە ئاسان نەبوو. عەوڵا سەقا هەبوو کە بە تەنەکە ئاوی بۆ ماڵان دەگواستەوە، مانگانەش لە هەر ماڵێك چوار دەرهەمی وەردەگرت، بۆ ماڵە دورەکانیش، دوو تەنەکە بە دە فلس بوو. بەڵام تەنها پیاوی دەوڵەمەند و کارمەند و موچەخۆرەکانی میرێ توانای ئاو کڕینیان لە عەوڵا سەقا هەبوو. ئەوکاتیش تەنها چەند ماڵە پۆلیس و کارمەندێکی لێ بوو. بۆیە ئەو ماڵانەی نزیك سەرچاوەی ئاوەکان بوون، بە هەرمێن تر و گرانتر بوون و بە نرخی زیاتر دەکڕان و دەفرۆشان.

بۆ پرۆژەی ئاوەکە، بۆڕیەکی شەش ئینجی لە کانیاوی دەنگار و بۆڕیەکی چوار ئینجیش لە کانیاوی ئاوەنجی وەرگیران و هەر دوو بۆڕیەکە تێکەڵ بەیەك کران و لە کۆڵانەکانی شارەکە دابەشکران. ئەنجامدانی ئەو پرۆژەیەش سودێکی یەکجار زۆری بە خەڵکی شەقڵاوە گەیاند. تا ڕۆژی ئەمڕۆش، کارە چاکەکانی ئەم ڕابەرە گەورەیەی کورد شاکر فەتاح، جێگەیان دیارە.

بۆ شوێنی مەکینەکانی کارەبا و گەرماوەکەش، شاکر فەتاح گۆڕەتوویەکی بەرەبابی ماڵی مام سەعدی نێرکی کڕی، کە لەدامێن قوتابخانەی شەقڵاوەی کچان بوو و گەرماوەکە و هۆڵێکی بۆ هەر دوو مەکینەکە لەسەر دروستکردن. ئێستاش پێموایە بەشێکی هەردوو تەلارەکە هەر ماون. بۆیە ئەو شوێنەش هەڵبژێردرا، چونکە هەردوو پرۆژەکە پێویستیان بە ئاوێکی زۆر هەبوو و ئەو شوێنەش لە تەنیشت جۆگەی ئاوی سەردۆڵ بوو. هەرچەندە ئاوی بۆڕی بۆ

دوو پرۆژەکە ڕاکێشرابوو وە تانکیەکی گەورەی ناوێیشیان بۆ دورستکرابوو، بەڵام وەك یەدەگ، دەبوایە ناوی سەردۆڵیش لەبەرچاو بگیرێ.



شەقڵاوەی کۆن لە زستان
لە ئەرشیفی حاجی فەرهاد
وەرگیراوە

ووشەی مەکینە لە ووشەی مەشینی ئینگلیزی هاتوە کە ئەمڕۆ موەلیدە یان جەنەرێتۆریان پێدەڵێن. ئەو دوو مەکینەیە زۆر زەبەلاح بوون وە یەکێکیان بە تەنها توانای کارەبای هەموو شەقڵاوەی هەبوو. ئەو مەکینانە بە نەوتی ڕەش و دیزل کاریان دەکرد و تانکیەکی گەورەیان بۆ دروست کرابوو وە دەبوایە هەر دوو ڕۆژ جارێك تانکەرێك دیزل لە کەرکوك بۆ ئەو دوو مەکینە دابین بکرێ. دەنگی مەکینەکان گەلەك گەورە بوو و دەبوایە لە نزیك مەکینەکان، بەتایبەتی لە ژووری، زۆر توند هاوار بکەی هەتا گوێت لە دەنگی یەکتر دەبوو. لە کاتی پێشمەرگایەتیش، کاتێك کە بایەکی بەهێز لەلای کاوانیانەوە بەرەو لای هیران هەڵی دەکرد، بەتایبەتی لە کاتی شەو لە پاش چیای سەفین و لە گوندی خۆران، کەمێك گوێم لە دەنگی مەکینەکان دەبوو.

ئەو دوو مەکینە جیاوازیەکی زۆر گەورەیان هەبوو لەگەڵ موەلیدەکانی ئەمڕۆ، کە زۆر پاك و خاوێنن و بە یەك کەس بەگەڕ دەخرێن. بەڵام بۆ بەگەڕخستنی هەریەکێك لە دوو مەکینەکان، دەبوایە پاریەکی ئاسنی درێژ و ئەستور لە فلای ویلەکەی گیربکەی و بە دوو کەس بیسوڕێنی، وە لە چەندین پارچەی جیاواز پێکهاتبوون و هەموویان بە شەفت و قایش بە یەکەوە بەسترابونەوە. دەبوایە بەردەوامیش مەکینەکان پاك بکەینەوە، چونکە ڕۆن و گریس و دیزلی لە لای پستنەکانی دەردەدا. ئەو جۆرە مەکینانە ڕێدییێتەریان نەبوو و دەبوایە بۆ ساردکردنەوەیان بەردەوام ئاو بەناویاندا بسوڕێتەوە. زوو زووش مەکینەکان تێکدەچون و بۆ چاککردنەوەیان وەستای تایبەتیان لە هەولێر بۆ دەهات، بە تایبەتی وەستا کەمال و وەستا موسا. پاش هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلولیش، حکومەت مەفرەزەیەکی پۆلیسی بۆ پاراستنی ئەو شوێنە دابین کرد.



پرۆژەی کارەبا و گەرماوی شەقڵاوە
لە ئەرشیفی حاجی فەرهاد وەرگیراوە

دوای ئەوەی ئەو دوو مەکینەی کارەبایان بۆ شەقڵاوە هێنان، من و چەند کەسێکی تر بە مەبەستی دامەزراندن عەرزوحاڵمان پێشکەش بە قائمقامیەت کرد. هەندێك لەو کەسانەش لەسەر داوای ماڵە میرەکان ناویان نوسرابوو. بەڵام شاکر فەتاح پیاوێکی نیشتمان پەروەر بوو و زوو درکی بەم کارە کرد و پشتگیری لەو کەسانە نەکرد. وەستا کەمال کە پیاوێکی هەولێری بوو و کوڕی کابرایەکی ئەرمەنی بوو، لەگەڵ هەردوو مەکینەکە گەیشتە شەقڵاوە بۆ دامەزراندن و دەستبەکارکردنی مەکینەکان و پاشان فێرکردنی ئەو کەسانەی بە نوێەرێتەر دادەمەزرێن. کریکۆری ئەرمەنیش کە تەمەنێکی زۆری لە شەقڵاوە بەسەر بردبوو، زۆر شارەزای شارەکە بوو و یەك یەك خەڵکەکەی دەناسی. چونکە باوکیشم دۆستایەتیەکی زۆر خۆش و پتەوی لەگەڵ کریکۆر هەبوو، کریکۆر منی لە نزیکەوە دەناسی و زۆریش لەلای ئەو خۆشەویست بووم. چونکە وەستا کەمالیش کوڕی کابرایەکی ئەرمەنی بوو، چووبوە لای کریکۆر بۆ زانیاری وەرگرتن لەسەر ئەو ناوانەی کە بەنیاز بوون لەسەر مەکینەکانی کارەبا بە نوێەرێتەر دابمەزرێن. پاش دامەزراندنم، وەستا کەمال بۆی گێرمەوە کە کریکۆر پێی ووتبوو "کوڕە پیاوی چاك بە ئەو پیاوە لە کیس خۆت مەدە". بەو پێیەش، من لەسەر هەڵسەنگاندنەکەی کریکۆر، متمانەی وەستا کەمالم بۆ دامەزراندن وەرگرتبوو. هەرچەندە موچەکەم تەنها حەفت دینار و نیو بوو، بەڵام ئەم دامەزراندنەی من بۆ ئێمە زۆر باش بوو و جگە لەوەی توانیم گوزەرانی ماڵ و منداڵم بسوڕێنم، توانیم هاوکاری ماڵی باوکیشم بکەم.

ئەوکات شەقڵاوە زۆر بە داروبار بوو، لە شەوانی زستان زۆرجار دارەکان لە تەلی کارەبایان دەدا و لەلای من سرکێتەکەی فڕێدەدا. هەرچەندە پێم ووترابوو کە ئەگەر سێ جار فڕیدا، پێویستناکا زیاتر خۆتی پێوە ماندووبکەی و ڕۆژی دواتر دەبێ هۆکارەکەی بدۆزینەوە و چاکی بکەین. بەڵام شەو هەبوو زیاتر لە ٢٠ تا ٣٠ جارم پێدەکردەوە، ئەوەکا کەسێك نەخۆش یان کارێکی پێویستی هەبێ.

# بابەتی لەبیرنەکراو

لە ژیانی خۆم زۆر کەسم بینیوە یان دەربارەم بیستوون کە لە توانا یان لە هەڵس و کەوتەکانی ڕۆژانەیاندا لەگەڵ دەوروبەریان جیاواز بوون. جاران پیاوی خورت و بەهێز زۆربوون و خەڵك هەبوو پێشبڕکێی هەڵگرتنی باگوردانیان دەکرد. دیارە خواردنی دۆشاو ووزەیەکی زۆری دەدایە خەڵکەکە. من لەگەڵ باوکم و بەکری مامم وە عەوڵای نامۆزام چووینە ناو ڕەزی قەشان، مامم بە باوکمی ووت کەمت دۆشاو هێناوە، ئەوە تەنها بەشی من نەکات. کەچی باوکم یەك دەستمەنجەڵی پڕ دۆشاوی هێنابوو. باوکم پێی ووت ئەتۆ ئەوە بخۆ، ئەمن دەچم زیاترت بۆ دێنم. مام بەکر هەموو دۆشاوەکەی لەگەڵ هەشت نان خوارد! بەڵام لە هەمان کاتیشدا نیشکەرێکی زۆر چالاك بوو، لە خواردن چۆن بوو لە کارکردنیش وابوو. عەوڵای کوڕیشی هەر وەك ئەو پیاوێکی ئازا و چاونەترس بوو. هەروەها حەمەدئەمینی باوکم دەست و بازوی زۆر بەهێزی هەبوون. لە پێشبڕکێیەکی بەرزکردنەوەی تفەنگ بە لولەکەی وە بە دەستی ڕاکشاو، توانی نەك هەر تفەنگەکەی، بەڵکو دوو ڕەختە فیشەکدانیشی لەسەر قونداغەکەی دانان و بەرزی کردنەوە.

حەسەن شوان هاوسێی ئێمە بوو، زۆر کەس بە بەهێزی ئەو کابرایە سەرسام بوون. ڕۆژێکیان بۆی گێرامەوە کە لەسەر پێنج قەند شەکر، گرەوی لەگەڵ کوێخا مستەفای کاوانی کردبوو کە توانای هەیە لەسەر سك درێژبێ و نیو عەربە گەنم بخەنە سەر پشتی و هەڵسێتەوە. کاتێك نیو عەربە گەنمەکەیان خستبووە سەر پشت، چوار تەنەکە مێوژیش لەوێ بوونە و بێ ئەوەی ئەو هەستی پێبکا، مێوژەکەشیان خستبونە سەر پشتی. بەدەم پێکەنینەوە گوتبووی، دەزانم ئەمە لە نیو عەربە زیاترە، بەڵام چی بڵێم! وەك پاڵەوانێك هەستابووە سەر پێ و گرەوەکەی بردبووەوە. کوڕێکی تریش هەبوو ناوی ئاغا بوو، لە بیرمە پێنج کیسە چەمەنتۆیان لەسەر پشت دانا، کەچی پێدەکەنی و شایی دەکرد!

## مەیسە گۆج

من مەیسە گۆجم نەدیوە، بەڵام باوکم و مامم دەیانگێرایەوە کە کابرایەکی زۆر چاونەترس و ئازا بووە. ڕۆژێکیان کوڕێك بە دەستی مەیسە گۆج دەکوژرێ. باوکی کورە کوژراوەکەش بە مەبەستی تۆڵە، بیست لیرە ئەدا بە کابرایەك کە مەیسەی بۆ بکوژێ. کابرا دەچێ لە کاتی نوستنی گولەیەك لە چاوی مەیسە

دەدا و لە گوێی دێتە دەرەوە، بەڵام مەیسە نامرێ! باوکی کوڕە کوژراوەکە بە کابرا دەڵێ بیست لیرەکەت نادەمێ، مەیسە نەمردووە! ئەویش دەڵێ من کوشتم، خوا نەیکوشتوە! بۆ مەبەستی شەرع کردن دەچنە لای مەلا و ڕدێن سپیەکان، ئەوانیش دەڵێن "ئەو کاری خۆی کردوە، بەڵام مەیسە ئەجەلی نەهاتوە و بیست لیرەکەی دەکەوێ. کە خوا ئەجەلی کابرای نەهێناوە گوناهی ئەو چیە؟ تۆش مەیسە عەفوبکە" کابراش بەمە ڕازی دەبێ و ئەوەی پێیان گووتبوو جێبەجێی دەکا.

پێشتریش ئەو مەیسە گۆجە لەگەڵ چەند کەسێك بۆ کاروان دەچێتە کوێستان. ئەوکات کاروان لە نێوان ئێران و مووسڵ دەکران. لە گەڕانەوە لە گەروی شێنێ لە ناوچەی زینوێ، توشی بەفر و زریان دەبن. مەیسە مافورێکی ئێرانی پێبووە و گورج بارەکەی دەخا، مافورەکە لە خۆی لولدەدا و هەمبانی نانیش لەگەڵ خۆی دەبا. دوای هەفتەیەك و پاش ئەوەی کەشەکە یارمەتیدەر دەبێ، ماڵی شێخی زینووێ بە دەیان مەیتی کاروانچیان لەو ڕێگایە هەڵدەگرنەوە، بەڵام دەبینن مەیسە لە ژێر کەڵەکی بەفر هەر زیندوە! دەیبەنەوە گوند و دوای ماوەیەك چاکدەبێتەوە، بەڵام پەنجەکانی پێی لە کەڵك دەکەون. هەر لەبەر ئەوەش نازناوی گۆجی خرابووە پاڵ.

مەیسە کوڕێکی جوان و زیرەکی هەبوو ناوی مەحمود بوو. دواتر مەحمود کەوتە ناوچەی بەغدا و بووە فەرمانبەری گومرگ. باسکی مەحمود زۆر درێژبوون و تا نزیك چۆکی شۆڕدەبوونەوە. زۆر جار تۆپەڵە بەفری لە پێش مزگەوتی گەورەی شەقڵاوە دەهاویشتە دەلاقەی کڵێسەی سەرگردی دێرێ. هەرچەند ڕووەو هەوراز بوو وە لەوانەیە ١٥٠م یان زیاتر دووربێ، کەچی تۆپەڵە بەفرەکان لە دەلاقەکە چوونە ژوورەوە! خەڵکی زۆر سەرسام بوون بە تواناکانی ئەو کوڕە.

## سەعدی نێرك

ماڵی مام سەعدی لە تەنیشت هەردوو پرۆژەی کارەبا و گەرماوبوو. دوای ئەوەی من لە مەکینەی کارەبا دامەزرام و هەتا بووم بە پێشمەرگە، ماوەی پێنج شەش ساڵ ١٩٥٥ تا ١٩٦١ لەوێ دراوسێی مام سەعدی بووم و ببووین بە هاوڕێی یەکتر. من دڵنیانیم ناوی نێرك لەچی هاتوە، بەڵام بە ڕای خۆم لە نازایەتی و نێرایەتی ئەو پیاوە و باوکی هاتووە. مام سەعدی زۆر لە من بەتەمەنتر بوو، لەوانەشە هەتا لە باوکی منیش بەتەمەنتر بووبێ. بەڵام مام

سەعدی یەکێك بووە لە سەربازەکانی تورکی عوسمانی و پیاوەکی دونیا دیتە بوو. ئەوان پێنج برابوون قادر، عەلی، سەعدی، حەمەدی حاسێ و سەدیق. قادریان ئەمری خودای کردبوو وە ئەمن ئەم دیوە، ئەوانی ترم دیوون و باشم دەناسین. دوای ئەوەی بووین بە دراوسێ، ڕۆژانە یەك دوو سەعاتی بە گێڕانەوەی بەسەرهاتە خۆشەکانی لەگەڵ من دەبردەسەر. قادری وەسمانە ڕەشی خەزووریشم هەندێك لەو بەسەرهاتە خۆشانەی بۆ گێرامەوە کە لەگەڵ مام سەعدی بووە لە کاتی ڕوودانیان. لێرەدا پێم باشە دوو بەسەرهاتی ئەو کەڵە پیاوە بگێڕمەوە کە نمونەی نازایەتین.

مام سەعدی بۆی گێرامەوە کە کاتێك کاروانی کوێستان گەرمتر بوون، ژمارەی دز و ڕێگرەکانیش زیادی کرد و بەردەوام کاروانیان ڕووت دەکردنەوە. بە زۆریش ڕێگرەکان پیاوی ئاغاکان بوون. هەر کەسە لە سنوری دەسەڵاتی خۆی چەند ڕێگرێکی ڕاگرتبوون. مام سەعدی و قادر وەسمانە ڕەش زۆر پیاوی نازا بوون و هەتا قات و قڕیەکە بەسەرچوو، بەردەوام کاروانیان بۆ کوێستان دەکرد. هەربۆیە، زۆر کەس حەزیان دەکرد لەگەڵ ئەو دوو کەسە کاروان بکەن. مام سەعدی دەیزانی کە ڕێگرەکان لە کوێ خۆیان حەشار دەدەن و لە ناکاو لە کاروانچیان دەردەکەون. ئەو، هەردەم پیاوەکی ووشیار و نامادەبوو، بەڵام کە دەگەیشتە ئەو شوێنانە، تفەنگەکەی سواردەکرد و بە دەستی ڕاستەی تفەنگەکەی بەرواژی لەسەر شانی خۆی دادەنا. بەڵام پەنجەی هەر لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگەکەی بوو. بەم چەشنەش، بەیەك چرکە لولەی تفەنگەکەی دەخستە سەر دەستی چەپ و دەیتوانی بیتەقێنێ. لە شوێنە بەترسەکانیش، مام سەعدی بە چەند مەترێك پێش کاروانچیان دەکەوت و لە بەرزایی لاڕێ دەڕۆیشت.

گەر لەبیرم نەچوبێ، پێموابێ پێش بگەنە حاجی نۆمەران دوو سێ ئەسپ سواری چاك لە ناکاو لە پەنای گردێك دەردەکەون. یەکێکیان بە مام سەعدی دەڵێ "کاکی گەرمێنی بارەکەت چیە؟". دیارە ئەم پرسیارە بۆ خافڵاندن و هەڵسەنگاندنی باری دەروونی کاروانچیەکان بووە. ئەگەر وەڵامەکەیان نەرم بووبێ، ئەوا نیشانەی ترس و دڵەڕاوکێ بووە و دەم و دەست ڕووتیان کردوون. ئەگەر وەڵامەکەش پێچەوانە بووبێ و کاروانچیەکان نیشانەی نازایەتیان پێوە دیار بووبێ، ئەوا خۆیان لە قەرەی ئەوانە نەداوە، یان لە شوێنێکی تر بۆیان دانیشتوون. مام سەعدی بەیەك چرکە تفەنگەکەی دەخاتە سەردەست و لوولەی تفەنگەکەی لە سنگی ئەو سوارەی پرسیارەکەی کردووە دەکا و پێی دەڵێ "بارەکەم دوڕە، لەعلە، یاقوتە، مەرجانە، گەوهەرە، زێڕە، زیوە دەنگیش بکە هەتا وەهاو وەهات لێ بکەم و کەرەکەم بە ئەسپی تو

بگۆڕمەوە". کابرای ڕێگر زراوی لە قسەکانی مام سەعدی دەچێ و دەڵێ "هاهاها کاکی گەرمێنی لۆ ما ئەمن چم گۆتیە برا، کوڕە ئەتو چی؟"، مام سەعدیش دەڵێ "ناتهەوێ لێت بپاڕێمەوە، برێم بەخوای فەقیرم بارە گەنمەکم پێیە لۆ مارو منداڵێ خۆ، ئەوجا ئەتوش برێی ڕووت بە؟! کوڕە ئەگەر ئەی ناسی، ئەوە سەعدۆیە سەعدۆ"! ئەو بەشانازیەوە ووتبووی سەعدۆ.

لە سەرەتای جەنگی جیهانی یەکەم، لەشکری ڕووسیا هات وە هەتا ڕەواندزی داگیرکرد. دکتۆر کەمال مەزهەر لە "کوردستان لە ساڵانی جەنگی جیهانی یەکەمدا" باس لە ڕێکەوتنێکی ساڵی ١٩٠٧ ی نێوان ئینگلستان و ڕووسیا دەربارەی ئێران دەکا. لەم ڕێککەوتنە، دەبوایە ئینگلستان نیوەی خوارەوەی ئێران داگیربکا و ڕووسیاش نیوەی سەرەوە. هەربۆیە، لەشکری ڕووسیا هەتا خانەقینی داگیرکردبوو.

مام سەعدی ڕووداوێکی تری بۆ گێڕامەوە کە پاش ئەوەی ڕووسیا گەیشتە ڕەواندز، حاجی مجید بەگ کە یەکێك لە بەگزادەکانی شەقڵاوە بووە، خەڵکی کۆکردۆتەوە کە بچن بۆ ڕەواندز هەتا شەڕ لە دژی ڕووسیا بکەن. گوایە ڕووسیا کافرە و دەچن غەزا دەکەن. ووشەی غەزا، ووشەیەکی عەرەبیە و لە سەرەتای هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆر بەکارهاتووە. لە ناو ئیسلام و بەتایبەتی لە کوردەواریشدا، مانای شەڕی پیرۆزی موسڵمانان لە دژی کافران دەبەخشێ. لە زۆر شوێنی کوردستانیش پێی دەڵێن "خەزا".

حاجی مجید بەگ، پیاوێکی دەوڵەمەند بووە و فیشەکێکی زۆری کڕیوە و بە خۆی فیشەکی بەسەر خەڵکە خۆبەخشەکە دابەش کردوە. مام سەعدیش یەکێك دەبێ لەو خەڵکە خۆبەخشە. دیارە حاجی مجید بەگ، مام سەعدی باش نەناسیوە و نەیزانیوە چ جۆرە پیاوێکە. لە کاتی دابەشکردنی فیشەکەکاندا هەرکەسێ دوو ڕەختە فیشەکیان دەداتێ، هەرچەندە هەندێکیان پیاوی لێوەشاوەش نەبوونە. دوو ڕەختە فیشەك دەیکردە ٢٠ پاکەت فیشەك و هەر پاکەتەی پێنج فیشەك. کەچی تەنها پێنج پاکەتە فیشەکی دابوون بە مام سەعدی.

مام سەعدی بە منی ووت "لە درێ خۆ تووڕە بووم و گۆتم شەرتبی دەبی کارەکی وابکەم ئەو کابرایە ئەمن بناسی. لۆ سبەینێ چووینە لای ڕەواندز، شەڕ دەستی پێکرد و تاقمەکی گوندەکانی دەوروبەری شەقڵاوە دەگەرەمە دابوون، کە پیاوی ئاغاکان بوون. هەر دەگەر دەستپێکردنی تەقە، ئەوان هەراتن. ئەمیش زۆر تورە بووم و بە ناویان بانگم دەکردن فڵان کەس هەرنێی فیسکەس

هەرێنی و هەمووم شەرمەزار کردن. چونکە ئەوان خۆیان بە قارەمان پێشاندابوو وە دوو ڕەختە فیشەکیان وەرگرتبوون".

مام سەعدی ووتی "هەرچەندە ڕووسیا لەشکرەکی بەهێزی هەبوو و تۆپ و جبەخانەی هەبوو، بەڵام ئەمن و ئەوانەی مابوونەوە، شەڕەکی زۆر باشمان کرد و لێنەگەڕاین لەشکری ڕووسیا زیاتر بێتەپێش. لۆ ئێوارەکەی گەڕاینەوە ئەشکەفتەکی، گۆتم ئەمن دەڕۆم و دەچمۆ شەقڵاوێ. بەس حاجی مجید بەگ هات گۆتی کو دەڕۆی؟ ئەتو یەکەم پیاوی! ئەوڕۆ کەس لە تو نازاتر نەبووە و باشتر شەڕی نەکردیە! ئەمنیش پێم گۆت حاجی مجید بەگ، ئەتو ئەمنت بە پیاو دانەنا بوو، لۆیە لە هەموانت کەمتر فیشەك دامێ، بڕۆ با ئەو پیاوانەی فیشەکت دانێ شەڕت لۆ بکەن. وەکی ئەتو هەر پێنج پاکەتە فیشەکت دانە من، بەس دوو ڕەختە فیشەکت دانە ئەو پیاوە قارەمانانەی هەراتن، ئەمن زۆر توڕەبووم. بەس ئەمن لۆ ئەوەی هاتم هەتا ئەتو ئەمن بناسی! ئیتر بەجێم هێشت".

## کریکۆر

کریکۆر پیاوێکی ئەرمەنی بوو و لە سیەکان هاتبووە شەقڵاوە. ئەو پیاوە زۆر لە من بەتەمەن تر بوو، بەڵام لەگەڵ من و باوکم هاوڕێ بوو. کوڕێکی هەبوو ناوی بەدۆش بوو، ئەم بەدۆشە گەر شوێنێکی بریندار دەبوو، یەکسەر خوێنەکەی دەخواردەوە و دەیگووت "خوێنی خۆمە و با بەفیڕۆ نەڕوا". کریکۆر خاوەنی چێشتخانە و میوانخانەی کریکۆر بوو، کابرایەکی زۆر شارەزاش بوو لە کارکردن. حاجی سادق چێشتخانەیەکی لە خوار چێشتخانەکەی ئەو کردەوە، کریکۆر پێی گووت "من ساڵانە بیست ڕوپیەت ئەدەمێ ئەگەر چێشت خانەکەت دابخەی". ئەوکات بیست ڕوپیە بەشی ساڵێك گوزەرانی دەکرد! لە هەمان کاتدا کریکۆر کابرایەکی زۆر خێرکەر بوو، دوو کوڕ و کچێکی کابرایەکی بەخێوکردن تاکو گەورە بوون. دوای مردنی دایك و باوکیان، منداڵەکان لەلای باپیر و داپیریان دەژیان، دواتر ئەوانیش مردن و هیچ کەسیان ئەما ئاگاداریان بێ. کریکۆر ئەرکی گەورەکردنی منداڵەکانی گرتە ئەستۆ و بردنی بۆ لای خۆی، دواتریش ناردنی بۆ لای کەس و کارەکانی خۆی لە کەرکوك. دوای گەورەبوونیان، هێنانیەوە بۆ شەقڵاوە و ژنی بۆ کوڕەکان هێنا و کچەکەشی بە شودا. کوڕەکانیش دوکانیان کردەوە و پیاوی زۆر چاکیان لێپەیدا بوو.

زۆربەی لۆریە بارهەڵگرەکان کە هاتوچۆی ناوچەکانی ڕەواندز و باڵەکایەتیان دەکرد، لای کریکۆر نانیان دەخوارد و دەمانەوە. کریکۆر سیفەتی زۆر بەرزی هەبوون و هەر کارکەرێك، شوفێرێك یان میوانێکی ڕەوشتی باش نەبا، ڕاینەدەگرت.

کریکۆر هەرگیز جیاوازی ئایینی نەدەزانی، بەبێ جیاوازی کردن ساڵی چەند جارێك چوار تەنەکە نەوتی بۆ ڕوناك کردنەوەی مزگەوت و تەکیە و خانەقا و کڵێسە دابین دەکرد. جگە لەوەش، ساڵانە یەك دوو مانگای سەردەبڕی و بەسەر هەژارانی دابەش دەکرد. کابرایەکی زۆر نەفەس بەرز و بە ویژدانیش بوو، زۆر گرنگیشی بە جۆری خواردن و جل و بەرگ و جەستەی خۆی دەدا. لەبیرمە ئەو کات هەزاری گوێز بە یەك ڕوپیە بوو و ئێمە دارگوێزێکی تایبەتمان هەبوو کە گوێزەکەی جیاواز بوون لە گوێزەکانی تر. ئەو هەموو گوێزەکانی ئەو دارگوێزەی لە باوکم دەکڕی و هەزاری چوار ڕوپیەی دەدایێ. هەردەم جۆرە پانتۆڵێکی تەسکی لەبەربوو کە پێی دەووترا بەرجیز. کری مەرەزی بە پانی لە جیاتی پشدێن دەبەست و سەماعەیەکی لە گوێ دابوو، چونکە گوێی گران بوون. شتێکیشی لە گوێچکە دابوو و وایەرێکی پێداهاتبوە خوارەوە و شتێکیش لە ناو بەرکی بوو.




سەماعەیەکی
کۆنی گوێلێبوون

مستە قوت، پیاوێکی تری ئەرمەنی بوو و پێموابێ ناوە ڕاستەقینەکەی بەلەدڕۆز بوو. خەڵك دەیانگووت ئەم پیاوە موسڵمان بووە و وازی لە ئایینی مەسیحی هێناوە. لەبیرمە ئەو بەلەدڕۆزە نەخۆش کەوت و لەسەرە مەرگا بوو، زمانیشی کەوتبوو و دیاربوو لەسەر ساتی خۆی وەستابوو. کریکۆر مەلا و قەشەی بردنە لای و پرسیاری لێکرد، کامەت دەوێ؟ ئەویش نیشارەتی بۆ قەشەکرد، کریکۆر دینارێکی دایە مەلا و بەڕێی کرد، قەشەش لەلای مستە قوت مایەوە تاکو مرد. دواتریش کریکۆر لاشەکەی بردە عەنکاوە و لەوێی بە خاکسپارد. دینارێك ئەوکات زۆر بوو! کرێکاری ڕۆژی تەنها بە چەند درهەمێك بوو.

موڵکێکی کریکۆر لە تەنشت مولکی ئەوقاف بوو و ئەوەی ئەوقاف زۆر باشتر بوو لە هی ئەو. کاتێك شەقڵاوە تەسویەکرا، تەسویە مڵکی ئەوقافی کردبوو بەناوی کریکۆر، ئەویش پارەیەکی یەکجار زۆری خەرجکرد تا موڵکەکەی گەڕاندەوە بۆمزگەوت. کاتێك شارەکەشی بەجێهێشت، موڵکێکی لە کابرایەك کڕیبوو، بەڵام ئەو بەبێ بەرامبەر بۆ کابرای بەجێهێشتەوە.

بە مەبەستی کڕینی میوەی جیا جیا بۆ ووشك کردن و بۆ زستان، زۆر ئەرمەنی دەهاتنە شەقڵاوە. ئەوانە زیاتر لە ڕێگای کریکۆر دەهاتن. ئەوکات کێشان بە هوقە بوو، هەر هۆقەیەکیش چوار کیلۆ بوو و نیمە هوقەی خۆخمان بە درهەمێك دەفرۆشت. ئەرمەنیەکان زۆر لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە ببوون بە دۆست و دەستیان زۆر ڕەنگین بوو. مرەبا و ناوی تەماتەیان دروست دەکرد کە ئێمە ئەوانەمان نەدەزانین، بەڵکو لەسەر دەستی ئەوان فێربووین. باوکم شەکری بۆ خێزانی فانۆسی ئەرمەنی دەکڕی و ئەویش مرەبای جۆراو جۆری بۆ دروست دەکردین. ئیتر نامەوێ زیاتر درێژە بە باسی ڕەفتارە جوانەکانی کریکۆر بدەم، چونکە بە پەرتوکێك بۆم تەواو نابێ.

ئەرمەنی تریش هەبوون وەك سیمۆن و ئاگۆب کە ئەوانیش خاوەنی چێشتخانە بوون، هەروەها وەهام، یاغیشە... هەر ئەرمەنیەکانیش بوون کە بۆ یەکەمجار تەکسیان هێنایە شاقڵاوە کە پێی دەگوترا "پەست" و خەڵکیان دەبردە هەولێر و ڕەواندز. لەوانەی پەستیان هەبوو تۆماس و ئاپۆ بوون. شایانی باسە ئێستاش لە شەقڵاوە دوو گەڕەك بەناوی کریکۆر و سیمۆن بەناوبانگن. ئەرمەنیەکان تا ناوەڕاستی شەستەکان لە شقڵاوە مانەوە.

دەتوانم بڵێم سێ کەس کاریگەری زۆریان هەبوو کە شەقلاوە ببێتە شوێنێکی گەشتیاری. لە هاوین زۆربەی ئەرمەنیەکانی عیراق بەهۆی سیمۆن و کریکۆر بۆ گەشتیاری دەهاتن. ئەوی تریان مامۆستایەکی سلێمانی بوو، کە بەداخەوە ناوەکەیم بیرنەماوە. ئەو مامۆستایە بەڕێزە لەو سەردەم شیعرێکی لەسەر شەقلاوە بە کوردی نوسی، کە دواتر بڵاوبوەوە و بۆ چەندین زمانی بیانی وەرگێردرا وەك عەرەبی، ئەرمەنی، تورکی... ئەو شیعرە وەکو ڕیکلامێکی ئەو سەردەم وابوو بۆ شەقڵاوە. بەداخەوە تەنیا کەمێکم لە شیعرەکە بیرماوە کە دەڵێ:

ناوی بێترمە شیفایە بۆ کەسی ساحێب وەرەم
عیلەت پەڕینە بە نەوعێ ناهێڵی زەڕەك ئەڵەم

بەیانیان دەنگی شالور و گاپەل مردی پێنەژێنێتەوە
...

دوای بڵاوبونەوەی ئەم شیعرە، خەڵك بە کۆمەڵ دەهاتنە سەردانی کانیاوی بێترمە.

## قسه و بەسەرهاتی خۆش

زۆر قسه و گاڵتەی سەیر لە کاتی منداڵی من دەکران و هەندێکیشیان بۆم گێردراونەتەوە. هەرچەندە زۆرشت دەکران کە باش نەبوون بەڵام بۆپێکەنین خەڵکی شتی سەیریان دەکرد. زۆربەی خەڵکیش تورە نەدەبوون و بەڵکو لە دەرفەتێکی تر و بەمەبەستی تۆڵە، ئەویش پەندێکی بە کەسەکە هەڵدەبەستەوە.

### ئەو بەلا لەو بەلا خراپتر

حاجی خدری سەعید کامەلای زاوام پاسەوانی بەلەدیە بوو، ماوەیەکیش لە مەکینەی کارەبا من و ئەو بەیەکەوە بووین و حاجی زۆر حەزی لە خەوبوو. چونکە بەلەدیە پاسەوانی هەبوو، زابتێکی تەجنید کە خەڵکی کەرکوك بوو شەوان لەوێ لەسەر بان دەخەوت و حاجیش نۆبەتچی بوو. زابتەکە خەو و ئیسراحەتی لە حاجی تێك دابوو. شەوێك حاجی دەستیکرد بە تەقە و چەند تفەنگێکی هاویشتن. هەروەها هاواریکرد ئەڕۆی هەی فلانی کوری فلانی... زابتەکە هەڵسا و بە ترسەوە گووتی چی بووە، چی بووە؟ حاجی گووتی تۆ دوژمنت زۆرن و پاسەوانیشت نیە، ئەو کابرایە هاتبوو بتکوژێ! زابتەکە گووتی کەوابێ دەچم لە ژووری دەنووم. حاجی پێی ووت کاکە شەوی ڕابردوو جرە جری مار لە ژورەوە لەناو بانی دەهات و کاریتەی بڵند دەکردن، لەبەر تۆ تفەنگم لێنەدا ئەگینا دەمکوشت. زابتەکە گووتی "ئەوبەلا لەوبەلا خراپتر"، بۆ بەیانی کابرا نوێنەکانی گواستنەوە و شەوانە لەسەر بانی قشڵە نوست و نەگەڕایەوە، حاجیش بۆخۆی لێکەوتەوە خەوێ.

### فەقێ

ئەگەر کەسێك بەشەو بمردبا، هەرئەو شەوە ئەیان شوشت و کەسێکیان بەکرێ دەگرت هەتا بەیانی قورئانی لەسەر بخوێنێ. فەقێیەك هەبوو تازە ژنی هێنابوو، زۆرجار بۆ قورئان خوێندن بانگ دەکرا. بە شەوێکی زستان چوار کەس ڕێك دەکەون کە پەندێك بە فەقێ بکەن. درەنگانی شەو دەچن لە دەرگای ماڵی فەقێ دەدەن. دەڵێن مام فەقێ فلان کەس مردووە و جەنازەکەی لە ماڵی خۆیانە، ئەویش دەڵێ هەرئێستا دێم. ئەوکات کەس لە ماڵ شوێنی خۆشوشتنی نەبوو. بەڵکو جێگایەك هەبوو لە مزگەوت پێیان دەگووت فەرشان، بەو شەوەی زستان و بەو ئاوە ساردەی ئەوێ سەری خۆی دەشوا. پاشان دەچێتە ماڵی ئەمردوەکە

و لەدەرگا دەدا. ئەوانیش فەرمووی لێ دەکەن و دەڵێن چیت دەوێ، خێرە بەوشەوەی هاتی؟ ئینجا دەزانێ کە ئەوە پەندیان پێهەڵبەستوە. ماوەیێك دڵگیردەبێ، بەڵام دواتر لەبیری دەکا.

## حەیران

لە بەهارێکی چلەکان لەناو باغێکی خۆش، بەهەڵکەوت بەسەر مەجلیسێکی کۆمەڵێك هاوڕێ هەڵبووم. هەموویان ئارەقیان دەخواردەوە، بەڵام من قەت نەمدەخواردەوە و هەر بۆ خۆشی لەگەڵیان دانیشتم. مەسیحیەك هەبوو ناوی مەنسوڕە قوت بوو. مەنسوڕ کوڕێکی زۆر گاڵتەچی بوو و پێموابێ ئارەقەکەش هەر لەو کڕدرابوو. لەو کاتەی قسە و باسی خۆش دەگێڕدرانەوە، ئاغایێك بەخۆی و بەغولامێکی پەیدابوون. ئەو کابرایە ئاغایەکی کەمێك توندبوو و هەندێك خەڵك لێیدەترسان، ئیتر ئاغاش لەگەڵ ئێمەدانیشت. مەنسوڕ سەرخۆشبوو و ووتی دەبێ هەمووتان یەکەو حەیران بڵێن. هەرکەسە و شتێکی ووت و نۆرە گەیشتە ئاغا. مەنسوڕ ووتی ئاغا دەبی ئەتووش شتێکی بڵێی. ئاغاش ووتی (هێی هوو هوو هایی هایی )هەرئەوەندە و گووتی تەواو. مەنسوڕ ووتی "بەخوای ئاغا حەیرانەکی بە گەوادیت گۆت" ئاغا گۆتی "سەگە ئەوە چی دەڵێی؟" مەنسوڕیش گووتی "توخوا جەماعەت بە گەوادی نەگۆت؟". ئیتر بووە پێکەنین و مەجلیسەکە تێك ئەچوو، ئاغاش ساردبوەوە و دوای کەمێك ڕۆیشت.

## شازەمان

دەروێش حەمەد کە خەلیفەی ماڵی کاکی هیران بوو، پیاوەکی زۆر قسە خۆش بوو و نۆ ژنی هێنابوون. دوایین ژنی کە ماوەیێکی کەم بوو هێنابووی ناوی شازەمان بوو. دەروێش حەمەد شەوانە لە تەکیە بوو و پاش نوێژی عیشا تەسبیحات دەکرا و کە فاتیحەی ڕادەهێلا، پێدادەهات لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تادەگەیشتە شێخ و موشایخان. پێش بڵێ الفاتیحە، مام باوە کە پیاوێکی زۆر گاڵتەچی بوو دەی ووت مام دەروێش شازەمانت لەبیرچوو. ئەویش دەیگۆت (ئەوەت دە ... ) الفاتیحە، ئەو خەڵکە لەپێکەنین دەکەوتە سەرپشت و فاتیحەکەش هەردەخوێندرا. هەموو ڕۆژێ ئەوە دووبارە دەبوەوە، بەڵام کەس زویر نەدەبوو. ژیانەکی سادە و هەژاری بوو بەڵام خەڵکەکە زۆر لەگەڵ یەك تەبابوون.

## مام بایز

مام بایزی مەدەی پیاوێکی زۆر ڕاست بوو و سیفەتی مەردانەی هەبوون، زۆر قسەی خۆشیشی لا دەستدەکەوتن. کچەکەی مام بایز جیرانی ئێمەبوو و ئەوکاتانە دەمدیت کە سەردانی کچەکەی دەکرد. بۆیان گێرامەوە کە جارەکی خەبەر دەدەنە مام بایز کە کیژێکی بووە! ئەویش دەڵێ ببیەن لەبەر دەرگای ماڵی میر فرێیدەن. کاتیخۆی سورانە دەستێندرا، ئەگەر کەسێك خوشك یان کچی بەمێردبدابا، دەبوایە شتێکی وەك بزن، مەڕ... بۆ ئاغا ببەی کە پێیدەووترا سورانە. مام بایز دەڵێ تا کچەکەم پێرادەگا بۆ مێردی، دەبێ دووعەلبە خوێی بدەمێ ـ ئەوکات خوێ یەکجار بەقیمەت بوو، چونکە لەناوچەی ئێمە دەست نەدەکەوت و خێڵەسات لە کوێستانی ئێران دەیانهێنا و بەشتی تر دەیانگۆڕیەوە ـ پاشانیش دەبێ سورانە بدەم! ناوەڵا بیدەنە میر با بۆخۆی بێ. دوای ئەو بەسەرهاتە، میری ناوچەکە سورانە وەرگرتن تەرك دەکا و چیتر نامێنێ.

کاتێکیش ڕێگەی هاملتۆن دروستکرا، هەندێ جار ئۆتۆمبیلە حکومیەکان، لە بەری لای چیای سۆرك لە قوڕ دەچەقین، ئەوانیش هانایان بۆ پۆلیسخانە دەهێنا کە یارمەتیان بۆ بنێرێ. پۆلیسەکانیش دەهاتنە بازاڕ و چایخانە و هەرکەسێکیان دەستکەوتبا، ڕاپێچیاندەکرد. هەروەها جارێکیان بەفرێکی زۆر دەبارێ و مودیر ناحیە فەرمان دەداتە پۆلیسخانە کە خەڵك کۆبکەنەوە تا ڕێگای لە ماڵ هەتا قشڵە بۆ پاکبکەنەوە. مام بایزیش دەڵێ"تازە ئێرە جێگەی پیاوان نەما" و لە داخی ئەو ڕوداوە، ماڵی خۆی بارکرد بۆ خوبیاوەی نزیك حاجی بایز. خانویەکی لەو چۆڵەوانیە دروستکرد و یەکجاری نەگەڕایەوە.

## دەمانچە

عەلی عەولای زێنەبێ بە بنچە کابرایێکی کۆیی بووە و کەوتۆتە شەقڵاوە. من نەمدیوە، بەڵام دەیانگێڕایەوە کە پیاوەکی پۆشتە و نەفەس بەرزبووە. ئەو کابرایە دایم دوو دەمانچەی لە باخەڵ بووینە. جارێك لەگەڵ ئینگلیزێك لێی دەبێتە شەڕ و دەمەقاڵێ، بەهەڵکەوت هیچ کامێك لە دەمانچەکانی پێنەبووە. دوای شەڕەکە دەچێتەوە ماڵ و هەردوو دەمانچەکە بە بیوران دەشکێنێ و دەڵێ "من بۆ تەنگانەیەکی وەك ئەوڕۆ دوو دەمانچەم هەڵگرتبوون، کە ئەگەر یەکێکیان کارنەکا ئەوەی تر بەکاربهێنم، ئەوڕۆ لێم قەوما و بەهانام نەهاتن، ئیتر بۆچمن".

## مێش

حەمەدی حاسی دایم خەریکی مێش بەخێوکردن بوو و ماوەیێك لە خانووی ساڵح بەگ دەژیا. حەدیقەکەی ساڵح بەگ هەردەم بە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ ڕازابووەوە. شتێکی سەیربوو لە جوانی و ناوبانگی دەرکردبوو. ئەوکات حەمەی ئەمینە فەندی مودیر ناحیە بوو، پیاوێکی چوارشانە و خەڵکی سولیمانی بوو. بۆ سەیرکردنی گوڵەکان چووبووە سەردانی باغەکەکە. مێش هەنگەکان دەورە لە مدیر ناحیە دەدەن و زۆری پێوەدەدەن. ئەویش لە بەرامبەر حەمەدی حاسێی بەندکرد و ئەشکەنجەشیدا. ووتی تۆ بە ئەنقەسد مێشت بەرداوەتە من، کەچی مێش بەخۆی شرغەی دابوو! بەهەزار تکا و ڕەجا حەمەدی ئازادکرد.

## دۆشاو

حەسەن بەگ، حەسەنی فاتێیان پێدەووت. پیاوەکی زۆر سوعبەتچی بوو و زۆر جوێنی دەدایە بگرە نزیکترین کەسی خۆشێ و کەس هیچی لێنەدەگرت. بۆی گێرامەوە کە جارێکیان بە کاروان دۆشاوی بۆ قوچی نۆمەرە خێل برد تا بە ڕۆن بیگۆڕێتەوە. نۆمەرە خێل پیاوێکی ناودار و قسەخۆش بووە و لای دەشتەکیەکان سەربردەکانی ئەو باون. حەسەن بەگ ووتی خەڵك هاتن و داوایان لە پلکە مەیاس کرد کە دۆشاوەکە تام بکا تاکو بزانێ چۆنە. منیش زۆر دڵخۆش بووم، چونکە بادیە ڕۆنی زۆرم لێکۆببونەوە و باکیشم نەبوو، چونکە دۆشاوێکی زۆر چاکم پێبوو. پلکە مەیاس دۆشاوەکەی تامکرد و ووتی ئەوە دۆشاوی بلاروکە! ئەو هەر ئەوەندەی ووت، ئیتر خەڵکەکە پشتیان لەمن کرد و ڕۆیشتن! منیش بە قسەو حەرەکە بە پلکە مەیاسم ووت "ئەگەر ئەوە دۆشاوی بلاروك بێت، لە من لە تۆ ئەوەی دە فلانە جێ" خەبەر دەگاتە نۆمەرە خێل و دەڵێن خۆشناوەك هاتیە دۆشاوی پێیە و ئەوهای ووتوە. ئەویش زۆر پێدەکەنێ و دەڵێ بڕۆن بیهێنن. حەسەن ووتی کە هاتنە شوێنم ئەختێك ترسم لێنیشت، بەڵام کە لە دیوەخانەکە چومە ژورێ، نۆمەرە خێل زەردە خەنەکی هاتێ و بەخێرهاتنی کردم. پرسی ئەو دۆشاوەی پێتە هی چیە؟ ووتم قوربان هی ترێیە، بەڵام پلکە مەیاس دەڵێ ئەوە دۆشاوی بلاروکە! خۆ ئەگەر تریانێك بلاروك بگوشی، پەرداغێك ناوی لێپەیدانابێ! نۆمەر پرسیاریکرد،چیت بە بلکە مەیاس ووت؟ منیش دووبارە هەڵسامە سەرپێ و قسە و باسەکەم بۆ نۆمەر دوبارەکردەوە. نۆمەر لە پێکەنین کەوتە سەرپشت و ووتی بڕۆن هەموو دۆشاوەکەی بۆ بگۆڕنەوە. حەسەن بەگ ووتی ئیتر بوونە دۆستی من و ساڵانە چەند جار بە کاروان دەچوومە دێیەکە و بە کۆمەڵ گەنم و ڕۆنم دەهێنا.

## ڕاوه ژوشك

ڕاوه ژوك له زۆر شوێنی كوردستان باوی هەبوو. كه كەسێكی نوێ بەتايبەتی كارمەندێكی حكومەت دەهاته شەقڵاوە، كۆمەڵێك كەس ڕێكدەكەوتن و داوەتی ڕاوه ژوشكيان دەكرد، گوايا وەك ڕێزێك بۆ گەيشتنی به شارەكه دەيبەن بۆ ئەم ڕاوە. ڕاوه ژوشك شتێك نەبوو كه بوونی هەبێ، بەڵكو تەنها بۆ ئەوەبوو كه پەندێك به كەسەكه بكەن و هۆيەكيش بوو كه كەسەكه ببێ به هاوڕێ لەگەڵ خەڵكی ناوچەكە. شەوێك كابرايان دەبردە گردی دێرێ و تەنەكە و دەستە دارێكيان دەدايە دەست. كاری ئەو هەر تەنەكە لێدان بوو بەبێ ڕاوەستان تاكو ڕاوەكه تەواو دەبوو. ئەوانيتريش گوايا دەچن و ژوشكەكان كۆدەكەنەوە و لە تەليسانيان دەكەن. هەندێ جار تەليسێكيشيان دەدايه دەست كابرا، ئەبادا ژوشكێك بەرەو ئەو ڕابكا. نيتر ئەوان دەهاتنەوە خوارەوە و ناوە ناوە يەكێك هاواريدەكرد "ها ئەوەته گرتم"، "بيگرە هاته ئەولای"، دەربازی ئەكەی" پێنجم گرتينە"... دواتريش هەركەس دەچووە ماڵەوە و لێ دەنوست، كابرای بەستە زمانيش بۆخۆی تا بەيانی تەنەكەی لێدەدا.

## كاريته

له زەمانی منداڵی من ئەگەر كەسێك خانووی دروست بكردبا، ئەوا خەڵكی هاوكاريان دەكرد و ئەستوندەكەيێك يان يەك دوو داری ڕايەڵيان دەدايە كەسەكە. لەبيرمه دووكەس هەبوون، يەكێكيان خانووی كرد و ئەوەی تر دوو داری به دياری دانێ. دوای ماوەيێك ئەوەی تريش دەستی به خانوو دروستكردن كرد. كابرا لەبەرامبەر دوو دارەكه چوار داری بۆ بردنەوە. بەڵام ئەو ووتی من ئەوەم ناوێ، يان هەشت دارم بۆ بێنه يانيش دوو دارەكەی خۆم دەوێنەوە. ئەوەش كارێكی ئاسان نەبوو بەڵكو لەوانەبوو مەحاڵبێ. له توڕەيی، كابرای يەكەم جار خانووی درووستكرد، كاريتەی دانه بەر خانووی خۆی و دارەكانی دەرهێنان و دايەوە به كابرا.

## مەلا يەلدا

كەسێكی شەقڵاوه له كاروانی ناوچەی سەرەوه لەگەڵ يەلدای مەسيحی دەگەڕانەوە. له ڕێگا دەگەنه ژنه ڕەوەندێك و كابرا قسه لەگەڵ ژنه دەكا، ژنەش دەڵێ ئەگەر مارەم بكەی لەگەڵت دێم. ئەويش دەڵی ئەوەته ڕەفيقەكەم

مەلایە. داوا لە یەلدا دەکاو دەڵێ مەلا یەلدا مارەمان بکە، هەر چۆنێك بێ یەلدا مارەیاندەکا! کە هاتنەوە ماڵ، باپیری کوڕە دەڵێتە ژنەکە ئەتو کێی، چ دەکەی لێرە؟ ئەویشدەڵێ ئەمن خێزانی فلانم. چۆن لە کێ؟ دەڵێ مەلا یەلدا مارەیکردم. ئەویش یەکسەر لەباسەکە دەگات و ئانێك دەداتە ژنەکە و بەڕێیدەکا.

## لباد

جارێکیان کوتاڵ فرۆشێك بەمەبەستی فرۆشتن بە دێهاتەکان دەگەڕێ. لە ڕێگا و لە سەر گردێ لە نزیك ئەو شوێنەی خێڵەسات هەڵیانداوە دەگاتە مام شوان. شوانەکە تەنها دوو پارچە لبادی بچوکی بە داوەبەنێك بە پێشەوە و دواوەی هەڵواسراوە و بە حاڵ بەدەنی داپۆشراوە. کابرا لە شوانەی پرسی، تو بڵێی ئەو ڕەشماڵانە پێویستیان بە جل و بەرگبێ؟ شوانەش لە وەلام دەڵێ "وەڵا ئەمن پەخۆ ڕویس نیمە و هاییشم لە زۆمێ نیە". واتا من بە خۆم ڕووت نیم و ئاگاداری ئەو قەومەش نیمە.

## بەهەشتی

پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند توشی قەبزی دەبێ، خەڵك کۆدەبنەوە و دوعای بۆ دەکەن و پاشان بەهەمان نەخۆشی دەمرێ. خەڵکەکە دەکەنە مشتومڕ، هەندێك دەڵێن نیمانی بردیە و هەندێك دەڵێن بەهەشتیە... کوڕی مردووەکە دەزانێ ئەوانە هەر بۆ خۆهێنانە پێش وادەکەن، دێتە وەڵام و دەڵێ ئەوە نێوە چی دەڵێن؟ ئەوە چەند ڕۆژە ئەو هەموو ئاواییە دوعای بۆدەکات، هەندۆکەك گووی بەرنەکەوت! نیمان و بەهشتی بەردەکەوێ؟

## قشەی بنەسڵاوە

پێشان بنەسڵاوە گوندەکی بچووك بوو و بەستێکی ناوی پێدادەڕۆیشت و تا هاوین ناوی هەرتێدەما. ئەوکات کچ و کوڕانی ئەوێ پێکەوە لەو ناوەی دەکەوتن و یاریاندەکرد. لەوکاتە خۆشناوێکی دیندار بۆ کاروان بەرەو ئەوێ دەچێ، چاوی بەوشتە دەکەوێ و زۆر پێ دڵتەنگ دەبێ. دەچێتە گوند دەبینێ مەلاو ڕدێن سپی دانیشتینە، ئەویش بەپەلە دەچێتە لایان و دەڵێ نێوە چ موسوڵمانێکن، من شتی وام نەدیتیە، چۆن دەبێ پیاو ژن لەناو ناو بەیەکەوە

گەمەبکەن؟ ئەوانیش ئەڵێن بڕۆ بڕۆ مام خۆشناو ئەگەر نازانی ئەوە فشەی بنەسڵاو میە.

## ئاغا

ئاغایەك سەرخۆشدەبێ و خۆی زۆر لە غولامەکی تووڕەدەکا و زۆر شتی ناشرینی پێ دەڵێ. غولامەکەش ئەو ناحەقیەی پێ قبوڵناکرێ و وەڵامی ئاغا دەداتەوە و ئاغا بەجێ دەهێڵێ. دوایی پێی دەڵێن چۆن وەڵامی ئاغات دایەوە خۆ ئەو سەرخۆشبوو! بۆ ڕۆژی دواتر کابرا دەچێتەوە لای ئاغا بۆ ئەوەی داوای لێبووردن بکا. ووتی ئاغا دەبێ بمبوری، دوێنێ قسەم لە قسەی جەنابتکرد، بەڵام ئەتو زۆرت جوێندان و منیش نەمزانی بوو ئەتو گووەکەت خواردبووەوە، ئەگەر بمزانیبایە ئەو گوومت خواردیتەوە قەت وەڵامم نەدەدایەوە.

## عەودیشۆ

شەوێك مەسیحیەکی عەنکاوە بە ناوی عەودیشۆ، دەچێتە دیوەخانی جەمیل ئاغای گەردی لە بەحرکە. دیوەخان ئاوەدان بووە و خەڵکێکی زۆر دانیشتوون. لە پڕ کەسێك بۆنێك بەردەدا و هەموویان هەستی پێدەکەن و پێدەکەنن، بەڵام دیارنیە کە کێ ئەو کارەی کردوە. پاش کەمێك مەلا بانگی عیشادەدا، بەڵام هەرهەموویان هەڵدەستن نوێژبکەن! عەودیشۆ بەتەنیا دەمێنێتەوە و دەڵێ ئاغا ڕاوەستن، ئەو شتەی بەتەمای من جێمەهێڵن ئەمن ئەمکردیە، ئیتر دەبێتە پێکەنین و ئاغا بڕیاردەدا کە هەمویان دەستنوێژ بشۆنەوە.

## مام زێندین

بەسەرهاتێکی خۆش لەسەر ئاشی کوڕێی مام زێندین دەگێردرایەوە. لە پایز کاتێك خێڵەسات بەرەو گەرمێن دەچن، ژنێکی ڕەوەند لادەداتە ئاشی مام زێندین. مام زێندینیش لە ئاش بووە و دیارە لەگەڵ یەك ڕێکدەکەون و ژنە دەڵێ مێردتێپێدەکەم، مام زێندینیش ئەوکات بێ ژن بووە و مارەی دەکا. زستان لەلای مام زێندین دەبێ و بۆ بەهار کاتێك خێڵەساتەکان دەگەڕێنەوە دەشتی هەریر، ژنەکە بە دزی دەڕوا و دەچێتەوە ناو کەسوکاری خۆی و مام زێندین بەجێدەهێڵێ. ڕۆژێك تەتەرێك بە لای ئەوان تێدەپەڕێ و ژنەکە لێیدەپرسێ

بۆکوێ دەچی؟ تەتەرەکەش دەڵێ دەچمە هەولێر. ژنەکە ڕووپیەیێکی دەداتێ و دەڵێ لەسەر ڕێگا بڕۆ لای مام زیندین و پێی بڵێ "مام زیندین سەربەنارده، ساڵیخۆم پێ ڕابوارده، مەیلیشم نەکرد سارده" کابراش لادەداتە لای مام زیندین و قسەکەی پێ ڕادەگەیێنێ. مام زیندینیش پارەیەکی زیاتر دەداتە کابرا و دەڵێ بگەڕێوە لای ژنەکە و پێی بڵێ، "ئەو پیرەژنێ گرد و مرد، هەندم وەکی مەشکێ هینا و برد، فەرەزەم ناشی مام زیندینی ئۆندە دەبێ برد".

## باگوردان

میری بێتواتە دەڵێتە یەکێك لە خوڵامەکانی، دەبێ بەیانی بچیە لای میری خۆران. ئەویش بەبێ ئەوەی لە میر بپرسێ بۆچی، یان لەوێ چیبکەم؟ بەیانی زوو بەڕێ دەکەوێتە ڕێ. دوای ماندوو و شەقی بوونێکی زۆر لە بڕینی هەردوو چیا سەختەکانی نێوانیان، دەگاتە گوندی خۆران و دەچێتە لای میری ئەوێ. ئەویش دەڵێ فەرموو بۆچی هاتی؟ خوڵامەکە لە وەڵام دەڵێ، من هەرئەوەندە دەزانم میر گووتی بڕۆ بۆلای میری خۆران. ئەویش دەزانێ کە خوڵامەکە پیاوێکی زۆر سادەیە و پەندێکی پێهەڵدەبەستێ. میری خۆران دەڵێ ئەوە من بەبیرم هاتەوە بۆچی ناردووی، داوای باگوردانی سەربانەکەی منی کردبوو. باگوردانەکەی لێ هەڵدەدا و دەڵێ پێشکەشی میربێ. خوڵامی بەستەزمان بەو هەموو ڕێگایەو بە ڕەزالەتێکی زۆر، دوای چەند ڕۆژێك باگوردانەکە دەگەیێنێتەوە بێتواتە و دەیباتە دیوەخانی میر. میر دەڵێ ئەوە چیە هێناوتە؟ دەڵێ قوربان جەنابت ئەتووت بڕۆ بۆ لای میری خۆران! منیش چووم و باگوردانەکەی ماڵی خۆی پێ ناردم. ئەویش بۆی دەردەکەوێ خوڵامەکەی چ گەمژەیەکە و دەزانێ چ پەندێکی پێ هەڵبەستراوە. دەڵێتە خوڵامەکە بڕۆ ئەو باگوردانەی ببەوە، ئەوە هی ماڵی میرە، من داوای باگوردانەکەی دیوەخانم کردبوو.

## ئەجەل

کابرایێك بە ماڵی جیرانەکەی فێردەبێ و هەموو ئێواران لەکاتی نانخواردن دەچێتە ئەوێ و هەموو جاریش دەڵێ ئای ئەسیب ئای ئەسیب. دوای ماوەیێك خاوەن ماڵەکە زۆر لێی بێزاردەبێ و ڕۆژێك هەڵدەکێشێتە خەنجەر و دەڵێ ئای ئەجەل ئای ئەجەل! کابرا دەڵێ ئەوە چی دەکەی، شێت بووی؟ ئەویش دەڵێ ئەگەر ئەتو باوەڕت بە ئەسیبە، دەبێ باوەڕیشت بە ئەجەل هەبێ.

## مەعزەرەت

لە شەوێکی تاریک، غوڵام دەستێک بۆ ئاغا دەبا. ئاغا تووڕەدەبێ و دەڵێ ئەوە چ دەکەی کوڕە؟ ئەویش دەڵێ ببورە ئاغا، وامزانی ئاغاژنە! ئەوەیە کە دەڵێن عوزری لە قەباحەت خراپترە.

## سافیلکە

کچێکی پارچەڵە کاتێک ناو بۆ میوانەکانی بابی دەگێڕێ، لەناکاو بایێکی لێبەردەبێ. یەکێک لە میوانەکان مەلا دەبێ و بۆ ئەوەی کچە هەست بە شەرمەزاری نەکا دەڵێ، هیچ نیە کچم ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە نۆبەرەت کوڕ دەبێ. کچەش لە وەڵام دەڵێ مامۆستا یەکیدیش بکەم؟ مەلا دەڵێ کچم جارێ ئەتو ئەوەی گەورەکە، خوا کەریمە بۆ هی دووەم.

## خەنجەر

مەلا خەلیل ئەو بەسەرهاتەی بۆ گێرامەوە و ووتی، دوو کەس لێیان بوو بە شەڕ، یەکێکیان یەکەوسەر خەنجەری هەڵکێشا و ویستی لەوەی تر بدا. کابرای تر ووتی ڕاوەستە، من شەڕ لەگەڵ تۆ ناکەم. ئێمە دەبێ دوو سێ جوێنان بدەینە یەکتر، پاشان بۆ یەکتر بچین و دوو سێ شەقان لە یەکتر بدەین. ئەگەر دۆخەکە توندتر بوو، دوو سێ مەترەقانیش لەیەك بدەین، ئەوجا ئەگەر جێگایەکت شکا، حەقی خۆتە هەڵکێشیە خەنجەرێ. تۆ بە تووڕە بوونەکی سادە هەڵتکێشا خەنجەرێ! دیارە تۆ زۆر کەری، منیش شەڕی لەگەڵ کەران ناکەم.

## پۆشتە

جارێکیان کابرایەك بە جلوبەرگی شڕ و ووڕ، چووە مەجلیسێکی زۆر گەرم و ئاوەدان لە دیوەخانێك. دیاربوو کەس گرنگی بە کابرا نەدا و لەسەر پێڵاوانیان دانیشاند و هیچیشیان پێشکەش نەکرد کە بیخوا. بۆ ڕۆژی دواتر چووە هەمان دیوەخان، بەڵام ئەمجارەیان جلێکی زۆر جوانی پۆشی و زۆر جوان و پوخت دیاربوو. کە لە دیوخانەکە چووە ژوورەوە، هەموو مەجلیسەکە لەبەری هەستان و پێشوازیەکی گەرمیان لێکرد و لە سەرینگانی دیوەخانەکەش جێگایان بۆ

کردەوە، خواردنێکی گەرم و خۆشیشیان لەبەردەم دانا. ئەویش لاچکێکی جلەکەی ڕاکێشا و لەناو خواردنەکەی هەڵێنا و گووتی دەئەوجا تێر بخۆ، ئەوە بۆ تۆیە نەك بۆ من.

## گۆلك

گا بەربووە ناو ماشان و هەمووی وێرانکرد، گۆلکێکیش لە دار بەسترابووەوە و هیچ زەڕی نەکردبوو. کاکی جوتیار زۆری لە گۆلکەکەدا. لێیان پرسی، ئەوە چ خەتای هەیە؟ ووتی ئەوەی بەربدەم لەوەیدی خراپتردەکا!

# سەیر و سەمەرە

لە کۆن زۆر قسە و باسی سەیر دەگێردرانەوە کە لەوانەیە هەندێکیان بەسەرهاتی ڕاست بن و بەشێکیشیان ئەفسانەیی بن.

## مەلا مەحمود

لە سالانی ١٨٠٠ شەڕێکی گەورەی موسولمانان لەگەڵ ڕووسەکان لە قارس و بایەزید ڕویداوە. مەلا مەحمودی شەقلاوە بۆ سەفەربەلك و بە مەبەستی غەزا چووە بۆ ئەو شەڕە و لە شەڕەکەدا کوژراوە. ماوەیێك دوای هەواڵی کوژرانی مەلا مەحموود، گوایا شەوێك سەری مەلا مەحمود هاتوتەوە و لە گەرووی ألله أکبر لە نێوان شەقلاوە و سپیگرە بانگی نوێژی داوە، گەروەکەش لەبەر ئەو ڕوداوە ئەو ناوەی لێندراوە. پاشان دێتە چاکی خەجەلاسێ، کە دەکەوێتە خوار گردی دێرێ و خەڵك گوێیان لێبووە کە دەنگی مەلا مەحمودە و بانگی سبەینێ دەدا. بۆ بەیانی سەری مەلا مەحمود دەدۆزنەوە و دواتر لە گۆڕستانی باوباپیران دەیشارنەوە. من گۆڕەکەی مەلا مەحمودم دیتبوو، کێلی گۆڕەکە نزیکەی مەتر و نیوێك بەرز بوون و سێ کێلی هەبوون. سەری کێلەکان لە یەکتر نزیك ببونەوە، بەڵام بنەکەیان نیو مەترێك لە یەکتر دور کەوتبوونەوە وە سەری مەلا مەحمود لەوێ نێژرابوو. گوایا هەرژنێك لەبەینی کێلەکان ڕەتببا، ئەوا خواست و مرازی دەهاتنە دی. باوکم دەیگێرایەوە کە لە کۆن ئەوانەی نیمانداری زۆر بەهێزبوون، لەکاتی مردنیان، لە سەری ڕوار لە چیای سەفین ئەو کێلە درێژانەیان بۆ دەهێنان. بەداخەوە پێموابێ دواتر کێلەکان کەوتنە بەر جادە و مەزارەکە تێکچوو.

## سوڵتانی ئەستەنبۆڵ

وەستا عەوڵا کۆر و قادری وەسمانە ڕەش دەیانگێرایەوە کە لە زەمانی حوکمی عوسمانیەکان، کوڕێك و کچێکی خەڵکی شەقلاوە حەزلەیەك دەکەن و خۆشەویستیەکەیان لەڕادە بەدەردەبێ. بەڵام چەندین جار کوڕە خوازبێنی کچەدەکا، کەچی باوکی کچە دەڵێ نایدەم! دوای ئەوەی کوڕە پەیمان لە کچە وەردەگرێ، ملی ڕێگای ئەستەنبۆڵ بەپێ دەگرێتە بەر و بەچەند مانگێك دەگاتە ئەوێ. دوای ماوەیێکی زۆر لە چاوەڕوانی، ڕۆژێك لە سەر ڕێگای سوڵتان

ڕادەکشێ و داوای نامەیێکی لێدەکا بۆ ئەوەی کچەکەی بدەنێ. ئەویش حورمەتی ماندوو بوونەکەی دەگرێ و نامەیەکی دەداتێ بۆ قازی شار. کوڕە دێتەوە و نامەکە دەداتە قازی شەقڵاوە، قازیش دەڵێ چونکە سوڵتان ڕای لەسەرە، مارەیی کچەکە هاتووە و پیرۆزت بێ.

## پیاوچاك

بەرلەوەی لە ناوچەی کەرکوك نەوتیش بدۆزرێتەوە، خەڵکانێك لە کۆنەوە سودمەند بوونە لە بەرهەمەکەی. خەڵکی زۆر لە ناوچەکەکانی کوردستان، بگرە لە ئێرانیشەوە دەهاتن و بە ناوچەی شەقڵاوەدا ڕەتدەبوون. گوایا ئەوانە دەچوونە سەر "پیاوچاکی بابە گوڕ گوڕ" بۆ ئەوەی مەرامەکانیان جێبەجێ بێن. بەتایبەتی ئەگەر کەسێك مەرامی بوایە کە کوڕێکی ببێ، دەبوایە بڵێ "بابە گوڕ گوڕ، بەگوڕهاتم، بۆ کوڕهاتم". گوایا زۆر جار خەڵك بە کۆمەڵ لە ناوچەی ئێمەش بۆ ئەو مەبەستە دەچوون بۆ ئەوێ. دەیانووت لەوێ چەندین کەس هەبوو کە خۆڵیان هەڵدەکەند و ئاگریان تێبەردەدا. ئەگەر خۆڵەکە گڕی بگرتبا، ئەوا گوایا مەرامەکانی میوانەکە دەهاتەدی. کەچی چونکە خاکی ناوچەکە نەوتاویە، زۆربەی جار گڕی گرتووە و خەڵکەکەش بە دڵخۆشیەوە گەڕاینەوە.

## گۆمی گامێشان

من لە بەرواری ئەم بەسەرهاتە دڵنیا نیم، بەڵام دەبێ لە دەوروبەری منداڵی من بووبێ. کاتی خۆی کورەیێکی قسر و گەچ دروستکردن لە ناوچەی گۆمی گامێشان لە نزیك دەربەندی شەقڵاوە هەبوو. باوکم بۆی دەگێڕامەوە کە کۆمەڵێك خەڵکی ناوچەکە لەوێ کاریان دەکرد، بەتایبەتی مەسیحیەکان. دیارە بناری ئەوگردەی کە بەردەکانی بۆ کورەی قسر و گەچەکە لێ دەرهێنراون، ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر هەڵکەندراوە. تا ڕادەیەك کە ڕۆژێکیان گردەکە دەڕمێ و کۆمەڵێك کرێکار دەکەونە ژێر گڵێکی زۆر. دیارە کە خەڵکی ناوچەکە هاوارەکەیان گوێ لێ بووە، هەرکەس خاکەناس و کەلوپەلی تریان بردووە و بەهانای ڕوداوەکە چوون. بەڵام بەداخەوە تەنها چەند کەسێك دەربازیان دەبێ و تەرمی نزیکەی ١٥ تا ٢٠ کەسێك کە بەشی زۆریان لە برا مەسیحیەکان بوونە، هەر لەژێر گڵەکە دەمێننەوە و دەبێ بە گڵکۆی یەکجارەکیان.

## لێبوردن

جاران بەسەرهاتی حاجی مجید بەگ لە شەقلاوە زۆر لەسەر زاران بوون. ئەو پیاوە زۆر دڵ گەورە بووە و دیوەخانەکەی هەردەم پڕبووە لە میوان. تا بڵێی چاکەی بۆ خەڵکی هەبووە. دەگێڕنەوە لە کاتی گرانی شەڕی جیهانی یەکەم، فەقیری زۆربووە و خەڵك هەبووە لە برسان مردووە. حاجی مجید بەگ بۆ ماوەیێکی زۆر ڕۆژانە مەنجەڵێکی گەورەی ساوار کوڵاندنی پڕ لە نیسك، ماش یان شلە ساوار لێناوە و هەریەکێك هاتووە کەوچکێکیان بۆ تێکردووە. ڕۆژێك هەندێ خەڵکی سەرکەند دەبنە میوانی ئەو. دوای نانخواردن، لە ژێر دارتووەکانی دیوەخانەکەی، میوانەکان خەریکی تووخواردن دەبن. یەکێك لە میوانەکان هەربەگاڵتە ڕوی تفەنگەکەی لە کوڕە تاقانەکەی حاجی مجید بەگ دەکاو دەڵێ، ئاغا نییە پێش نەگەرنا دەتکوژم. تفەنگی بەرامبەر ڕادەگرێ و لەوی وایە تفەنگ بەتاڵە، کەچی تفەنگ فیشەکی لەبەر بووە و لەدەستی دەتەقێ. مەخابن کوڕی حاجی مجید بەگ دکوژێ. لە داخان میوانەکە ویستویەتی خۆی بکوژێ، بەڵام حاجی مجید نەی هێشتووە هەرلە گەرمی عەفووی کردووە و دەڵێ "دیارە خودا هەرنەوەندە کوڕەکەی داوەتە من. بەڵام یەك تکام هەیە، با جارێکی تر چاوم پێتان نەکەوێ نەوەکو شەیتان زەفەرم پێببا و ڕای خۆم بگۆڕم".

## مەردایەتی

لە کاتی پێشمەرگایەتیم، لە دۆڵی بالیسان چوومە گوندی نیوە. لە ماڵێك بووم، خاوەن ماڵ باسی ژنێکی بۆکردم کە دوای مردنی مێردی بەخێوکردنی چوار منداڵەکەی بە تەواوی کەوتە ئەستۆ. ووتی ئەو ژنە سەری خۆیی تراشی و جلی پیاوان لەبەرکرد. ژنەکە بە کاروان توتنی دەبرد بۆ موسڵ و کاری قاچاغی و زۆر کاری تری دەکردن کە ئەو کات تەنها کاری پیاوان بوون. دواتر ژنەکەیان پیشاندام، چونکە ئێواران لەگەڵ پیاوانی گوند لەلای مزگەت ڕادەوەستا. ڕانك و چۆخەڵی لەبەر دابوو و دەلینگی ڕانکەکەی خستبوە ناو بەلەکێنچ و قننە سەبیلیشی لەبەر پشت بوو. من تۆزێك لەگەڵی ڕاوەستام، قسەکانی لە پیاوێکی پڕ متمانە بەخۆ دەچوون و وەك پیاو هەڵسوکەوتی دەکرد. زۆر پێم سەیر بوو، چونکە یەکەم جاربوو شتێکی لەو بابەتە ببینم.

## هەویر

بە مەبەستی هێنانی سەرکە گوڵی شلێر، من و ئەجاتی برام بە ئۆتۆمبیل چووینە چیای برادۆست و لەوێ ئەشکەوتێکمان بینی. پیرە پیاوێك لە نزیك ئەشکەوتەکە دانیشتبوو و سەربردەکی سەیری بۆگێراینەوە. ووتی ئەوکاتەی کە خوێنی پێشمەرگە زۆر بەنرخ بوو و هەرکەسی پێشمەرگەیەکی بکوشتبا، حکومەتی سەدام پارەکی زۆری پێئەدا. من دوو پێشمەرگەم دیتن و ووتم وەرن نانم لەلا بخۆن. هەرچەندە ماندوو بوون و برسیەتی لە ڕواڵەتیان بەدی دەکرا، بەڵام لە وەڵام ووتیان نایێین. دیاربوو ترسێکیان هەبوو کە من نیازێکی خراپم هەبێ. منیش ووتم با بەسەرهاتێکتان بۆ باسبکەم کە بەچاوی خۆم دیومە. بۆم گێرانەوە کە گوندەکەمان لەدەم زێیە و چۆن من و ڕەفیقێکم ئێوارەیەك لە دەم رووبار بووین، لە ناکاو هاواری ژنێك هات. کە تەماشامانکرد، ژنێك خۆی لە پەنا بەردێك ناوە و پێنەدەچوو هیچ جلی لەبەربێ. داوایکرد شتێکی پێ بدەین تا خۆی پێ داپۆشێ، ئێمەش جەمەدانی و پشتێنمان بۆ هەڵدان و لەگەڵ خۆمان هێنایەوە ماڵ. دوای ئەوەی خۆی گەرم کردەوە و نانێکی خوارد، ووتمان سەربردەت چیە؟ ژنەکە ووتی من خەڵکی بلە و بارزانم و لە دەم زێ بە تەنیا لە بەیانیەوە کورم دەکرد (جلم دەشوشتن). پێش ئەوەی سەری خۆم بشۆم، نانێکم هێنایە دەر کە بیخۆم، چونکە کەمێك ماندوو و برسی ببووم. بەڵام سەگێك لە نزیك ئەوێ دەستی بە نوزە نوزکرد و منیش نانەکەم داێ و تەماشمکرد بەپەلە بۆ فەرخەکانی بردوو و دووبارە بە نوزە هاتەوە. سەرەتا دوودڵ بووم کە نانی دووەمی بدەمێ، بەڵام بەزەیی زۆرم بە سەگەکەهات، چونکە وەك پاڕانەوەیەك تەماشای منی دەکرد. ئیتر سێ نانم پێبوون و هەرسێکیم دانێ، چونکە دوایی من هەر دەچوومەوە ماڵ و دەمتوانی چاوەڕوان بکەم. کاتێك سەری خۆم دەشوشت، بەردەکەی بن پێم ڕۆیشت و هەڵخلیسکام، ئیتر ئاوەکە زۆر بە گوڕبوو و منی برد. هەرئەوەندەم دەزانی بە کاری خودا کە دەکەوتمە ژێر ئاو، تۆپەڵە هەویرێك بە دەم و لوتم وەدەنرا و کە دەهاتمەوە سەر ئاوەکە لادەکەوت، تاگەیشتمە ئەو جێگایەی منتان لێ هەڵگرتەوە! ئیتر نازانم من لە کوێم و چەند لەناو ئاوبووم، بەڵام دەزانم کە ماوەیێکی زۆر بوو بەو ڕوبارە دەڕۆیشتم. پیرە ووتی بە پێشمەرگەکانم ووت ئەو ژنە سەگی ئاندا، کەچی خودا ئەوهای بۆکرد، ئەی دەبێ بۆ ئینسان چی بکا! دیاربوو ئەوانیش دڵیان نەرم ببوو و لەگەڵم هاتن.

# بابەتی سەر زاران

## سێ هێزە ڕۆن

پیاوەکی دەوڵەمەند سێ هێزە ڕۆن دادەنێ بۆ مانگی ڕەجەب و شەعبان و ڕەمەزان. بە ژنەکەی دەڵێ ئەوانە بۆ ڕەجەب و شەعبان و ڕەمەزانن، ژنەکە دەڵێ بەسەر چاو. ئیترکابرا نازانێ ژنە چەند حاڵی بووە یان نا. چەند کەسێکیش گوێیان لەوقسەیە دەبێ و هەلەکە دەقۆزنەوە. ڕۆژێك پیاوەکە لەماڵ نابێ و سێ میوان لە دەرگادەدەن، ژنەکە دەڵێت ئێوە کێن؟ دەڵێن ئێمە، ڕەجەب و شەعبان و ڕەمەزانین و هاتوین بۆ سێ هێزە ڕۆنەکانمان! ئەویش فەرمویان لێدەکا و هێزە ڕۆنەکانیان پێدەدا و دەڕۆن. کە پیاوەکە دەگەڕێتەوە ژنە دەڵێ پیاوەکە ڕەجەب و شەعبان و ڕەمەزان هاتن و سێ هێزە ڕۆنەکانم پێدان. پیاوەکە زۆر تووڕە دەبێ و دەڵێ لەو باوەڕەدام کەس ئەوەندەی تۆ بێ ئەقڵ نەبێ. لێیان دەبێتە مشت و مڕێکی زۆر. کابرا بە ژنەکەی دەڵێ چەند ڕۆژێك دەگەڕێم، ئەگەر کەسم دیتەوە وەك تۆ بێ ئەقڵ ئەوا دەتبەخشم، ئەگەرنا کەورت دەکەم.

هەرچەندە کابرا لەوباوەڕە دانەبوو کە هیچ کەسێك بدۆزێتەوە لە ژنەکەی نەفامتربێ، بەڵام ملی ڕێگای گرتەبەر. دوای گەڕان و ماندوبونێکی زۆر گەیشتە نزیك قەڵاتێك. لە کانیاوێکی نزیك قەڵاتەکە دەست و چاوی خۆی دەشوا و لێرادەکشێ تاکو پشوێك بدا. پاش کەمێك، کچێك دێتە سەرکانیاوەکە و دەپرسێ مامە لە کێ هاتی؟ پیاوەکەش لە بێزاری دەڵێ لە جەهەننەمێ! کچە دەڵێ قوربانتبم نەڕۆی هەتا ئاغاژن دێنم. ئاغاژن بە پەلە دێت و دەپرسێ، لە جەهەننەم هاتیەوە، ئەی بەقوربانتبم ڕەحمانی برات نەدیوە؟ ئەویش دەڵێ ڕەحمان برای تووە؟ ئۆوۆی! هەموو ڕۆژێ هێندەی لێدەدەن، هێندەی لێدەدەن لەسەر ئەو سێ سەد لیرەی کە قەرزدارە. ئاغاژن دەڵێ هەی دەبەری مرم ئەتو دەگەڕێیەوە سێ سەد لیرەکەی بۆ ببەی؟ ئەویش دەڵێ هەرئێستا دەگەڕێمەوە. ئاغاژن لیرەکان دەهێنێ و ئەویش هەربەپەلە سێ سەد لیرەکە وەردەگرێ و دەڕوا.

کە ئاغا دەگەڕێتەوە ماڵ، ئاغاژن دەڵێ ئەوڕۆ برای خۆم لە جەهەنەم ڕزگارکرد! ئاغا دەڵێ چۆن شتی وادەبێ؟ ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆ باسدەکا. ئاغا فەرماندەدا ئەسپ و تفەنگ ئامادەبکەن و دەکەوێتە دوای کابرا. کابرا دەبینێ لە دورەوە ئەسپ سوارێك بەرەو ئەو دەکوتێ، بە پەلە لادەداتە ئاشێکی نزیك. دەڵێتە ئاشەوان قوتوی جگەرەم لێ کەوتە پۆسکی ئاشی، لیرەکت دەدەمێ

ئەگەر بچی بۆم دەربهێنی. ئاشەوان بەغار دەچێتە ژێر ئاش و کابراش هەندێك ئارد بەخۆی دادەکا. ئاغا دێتە ژوور و دەڵێتە کابرای ئاناشەوان، کەست نەدیوە بە ئێرەدا بڕوا؟ ئەویش دەڵێ گەورەم پیاوەك هاتە ئێرە و بەپەلە چووە ژێر ئاشی. ئاغا ئەسپ و تفەنگەکەی بەتەمای ئەو بەجێ دەهێڵی هەتا دەچی کابرا بگری. هەتا ئاغا بۆی دەردەکەوێ کامە کامەیە، کابرا سواری ئەسپەکە دەبێت و تفەنگەکەش دەبا.

ئەوجارەیان کابر دەبینی جۆتیارێك جۆتوگا دەکا. چووە لای مام جووتیار و ووتی زۆر حەزم لە نیسکێکی گەرمە، ئەگەر بۆم پەیدابکەی ئەو ئەسپ و تفەنگەت دەدەمێ. جۆتیار ووتی ڕاوەستە ئێستا دەچمەوە ماڵ و بۆت دەهێنم، قوربانتبم ئەڕۆی. کاکی جوتیار بەبەلە گەڕایەوە ماڵ و ووتی ژنێ نیسکەکی لێنێ ئەسپەك و تفەنگەکم پێ وەرگرتیە. ژنە ووتی بەخوای نیمانە، بەڵام هەر ئێستا دەچمە ماڵی باوکم دەیهێنم. ژنەکە چووە ماڵی باوکی و نیسکی هێنا، بەڵام ووتیان ئێمەش شەریکین! هەتا ژنەکە هاتەوە نیسکی لێنا، جووتیار ناوخوڕێکی بۆ ئەسپەکە بە بەرد و قوڕ دروستکرد. هەروەها پێشبەند و پاشبەندی دروستکردن. نیسکەکەی لە دیزە کرد و لەسەر پشتی خۆی دانا. لەڕێگا قسەی ژنەکەی بیرهاتەوە کە ماڵی بابی ووتیان ئێمەش بەشمان هەیە. جووتیار خۆی داهێنایەوە و دەستی بۆ پووشکێك برد و ووتی ئەو پووشکەشیان نادەمێ، نیسك ڕژا و ئەسکوردیشی سووتا، کابراش گا کانی بردبوون. کابرای گابردی ڕۆیشت و لە ڕێگا گەیشتە مێگەلە مەڕێکی چاك. لە شوانەکەی پرسی، نایانفرۆشی؟ شوانیش ووتی بۆ فرۆشتنم داناون. کابرا بەناو مێگەل گەڕا و سی سەر مەڕی جوانی لێ بژاردن و جیای کردنەوە. ووتیە شوانی قوربەسەر ئەو پازدە مەڕانە دەبەم. ئەوانەیتریش هی منن، با بە ئەمانەت لەلات بن تا دەگەڕێمەوە و پارەکەت بۆدێنم. کابرا بەرەو ماڵ کەوتە ڕێ. لە ڕێگا زۆر شتی تری لێهەڵکەوتن، بەڵام ووتی ئەوەندەم بەسە. گەیشتەوە ماڵ ووتی ژنەکە زۆری لە تۆ بێ ئەقڵترم دیتنەوە، بۆیە لە تۆ خۆش بووم.

## لیرە

سێ ژن لە ڕێگەی کانی لیرەیەك دەدۆزنەوە، هەریەکەو دەڵێ بۆ من بێ. لەو کاتە پیرە پیاوێك تێ دەپەڕێ و دەڵێ ئەو هەرایەتان لەچیە؟ ژنەکان دەڵێن ئەو لیرەمان دیتیەوە و شەڕمان لەسەر ئەوەیە بۆ کامەمان بێ. پیرە پیاوەکەش دەڵێ کامەتان مەکرتان گەورەتر بێ با بۆ ئەوبێ. ئەوانیش کابرایان کردە سەرپشك کە بڕیاربدا.

ژنی یەکەم: مێردەکەم جووتیار بوو و حەزیشم لە پیاوێك دەکرد و بەیەکەوە دەمانویست مێرەکەم دەربەدەر بکەین. خۆشەویستەکەم نارد ماسی زۆر بگرێ و بەشەو لەو جێگایەی پیاوەکەم جۆت دەکات بیان نێژی. ڕۆژی دواتر مێردەکەم هەرزوو گەڕایەوە ماڵ و فەردە ماسی پێبوون. ووتم ئەوە چیە پیاوەکە؟ ووتی هەرخەتی جووتم دەکرد و ماسی بەدەردەکەوتن. منیش ووتم باشە ماسیمان زۆرە، بڕۆ بۆ ئێوارە پیاوە ماقوڵانی گوند کۆبکەوە و با ئەوانیش لەگەڵمان بخۆن، هەم خێرە و هەم بۆتۆش گەورەییە. مێردەکەم ڕۆیشت و منیش ماسیەکانم فڕێدان. پاش نوێژی عیشا چەندین پیاوی لێوەشاوەی گوند هاتن. مێردەکەم ووتی ژنەکە دەی خواردن بێنە. ووتم پیاوەکە خواردنی چی؟ ووتی ماسی؟ ماسی چی؟ جەماعەت ببینن چۆن پیاوەکەم تێکچووە، پرسیاری لێ بکەن بزانن ماسی لەکوێ هیناوە. مێردم ووتی لە وەردێ جۆتم دەکرد و ماسی دەهاتنە دەرەوە، بوو بە پێکەنین و هەرچەند مێردەکەم ووتی باوەڕبکەن شتەکە ئەوها بوو، کەس باوەڕی پێنەکرد و ڕۆیشتن. بۆ بەیانی منداڵیش گاڵتەیان پێدەکرد، نیتر ژیانی لە گوند نەما و جێیهێشت. منیش مێردم بەخۆشەویستەکەم کرد.

ژنی دووەم: ووتی منیش حەزم لە پیاوێك دەکرد و دەمویست لە مێردم ڕزگارم بێ. ووتمە خۆشەویستەکەم بچێ دەستە جلەکی عەسکەری و ووڵاغەکم بۆ بکڕێ. جل و ووڵاغەکەی هێنا و منیش مێردەکەم سەرخۆشکرد و بەوشەوە جلی عەسکەریم لەبەرکرد. بردمە دەرەوەی گوند و ڕیشمەی ووڵاغەکەشم لەدەست گرێدا و جێمهێشت. بەری بەیان مێردەکەم بە خۆی و بە بارگیر هاتەوە ماڵ و بانگی منی کرد. منیش هاوارم کرد ئەو عەسکەرە دەیەوێ مێردەکەم بکوژێ. چەند کەسێك دەورەیانگرت، زۆریان لێدا و دەریانکرد. نیتر ڕۆیشت و نەهاتەوە، منیش مێردم کردە خۆشەویستەکەم.

ژنی سێیەم: ووتی من خێزانی مەلا بووم و حوجرەش لە تەنیشت ماڵمان بوو. فەقێیەك لە حوجرەبوو و من و فەقێ حەزمان لەیەکدەکرد. بە فەقێم ووت بە مەلا بڵێ ژنێکت بۆ پەیدابکا. ڕۆژێك مەلا ووتی، فەقێ داوای ژنی کردووە ژنێکی بۆ بدۆزەوە. منیش ووتم دەگەڕێم تا یەکێکی بەدڵی خۆمی بۆ دەدۆزمەوە. مەلاژن ووتی کونێکم هەڵکەند لە ماڵەوە بۆ حوجرە و دەرخونەکم لەسەردانا. ماوەیەك پێچوو، ووتم مەلا ژنێکم بۆ فەقێ دۆزیوەتەوە، بەڵام لە ڕەنگ، لە دەنگ، لە هەموو شتی وەك منە، نەگەرلێت تێکەڵنابێ ئەوا بۆ فەقێی دەهێنین. مەلاش ووتی باشە لێم تێکەڵنابێ. ڕۆژێك ووتم مەلا ژنەکەم هێناوە و لە حوجرەیە. مەلا چووە حوجرە و منیش لە کونەکە چوومە ژورێ، کە مەلا

منی دیت بە پەلە گەڕایەوە ماڵ و منیش لە کونەکە گەڕامەوە ئەوبەر و خۆم بە قاپ شوشتن خەریك کرد. مەلا ووتی مەلاژن لام وایە ئەو ژنە ئەتۆی، ووتم مەلا ئەی ئەمووت هەموو شتی وەك منە؟ مەلا گەڕاوە و منیش پێش ئەو لە کونەکە چووم‌ەوە حوجرە، دیسان مەلا گەڕایەوە ماڵ و منیش ئەمجارە گەسکم لە ماڵ دەدا. مەلا ووتی مەلاژن ئەوە هەمووشتی تۆیە! منیش بە هێمنی ووتم مەلا بڕۆ مارەی بکە، ئەی ئەمووت هەمووشتەکی وەك منە. ئەگەر دەزانی لێت تێکدەچێ، بەردێك لەسەر ئەو بابەتە دانێ و با بڕوا! ووتی باشە ئەوە دەچم مارەی دەکەم. مەلا گەڕایەوە بۆ حوجرە و منیش چوومەوە ئەو بەر و لە فەقێی مارەکردم. بەڵام چونکە هەرژنی مەلابووم، مارەییم لە فەقێ نەهاتبوو. بەڵام بۆ ئەوەش پیلانێکم دارێشتبوو. بە فەقێم ووت ئێوارە بۆ نان خواردن مەلا داوەتبکە. بۆ ئێوارە مەلا چوو بۆ نانخواردن لە ماڵی فەقێ و فەقێ ووتی ژنێ ناو بێنە و با دەستمان بشۆین. منیش یەکەم جار ناوم لە دەستی مەلا کرد نەك فەقێ، فەقێ تەلاقی خواردن کەمنی ناوێ، چونکە پێش ئەو ناوم لە دەستی مەلا کرد. مەلا گەڕایەوە ماڵ منیش لە کونەکە گەڕامەوە. مەلا ووتی مەلاژن قەوما، ووتم چی بووە؟ ووتی فەقێ ژنەکەی تەلاقدا و بەسەرهاتەکەی بۆگێڕامەوە. منیش ووتم مەلا بڕۆ مارە بە جاشی بکەوە و پاشان تەلاقی بدە تاکو فەقێ بتوانێ دووبارە مارەیبکاتەوە. ووتی ئەوە شتەکی باشە وا دەچم. مەلا گەڕایەوە حوجرە و منیش لە شوێنی جاران گەڕامەوە ئەوێ. مەلا لەخۆی مارەکردم و ڕۆژی دواتر تەلاقی دام، ئیتر تەلاقم لێکەوت. ئینجا ووتم مەلا بۆچی تەلاقت دام؟ من ژنێکی خراپ بووم؟ بێ ناموس بووم؟ مەلا لەسەری خۆیدا و ووتی مەلاژن ئەوە تۆبووی ئەو فێڵەت لێکردم؟

پیرە پیاوەکە ووتی مەلاژن مەکری تۆ لەهەموویان گەورەتربوو و لیرەکە قابیلی تۆیە.

## زیر

پاشایەك زۆر حەزنەکا خەڵکی ناوچەکەی زیرەك و زانا بن، بۆیە زوو زوو لەگەڵ وەزیر و پاسەوانەکانی دەچێتە بازاڕ و پرسیار لە خەڵك دەکا. جارێك دەگاتە کوڕێك و چەند پرسیارێکی لێدەکا. کوڕەش زۆر ژیرانە وەڵامی پاشا دەداتەوە. پاشا بە وەڵامەکانی ئەو کوڕە سەرسام دەبێ و پاداشتی دەکا. داواشی لێدەکا ببێتە ڕاوێژکاری. لە دەرفەتێکی تردا، پاشا دیسان دەچێتەوە بازاڕ و ئەم جارە پیاوێك دەبینێ و چەند پرسیارێکی لێدەکا. پاشا لە وەڵامەکانی کابرا زۆر نارەحەت دەبێ و دەڵێ، ئەو کابرایە زۆر بێنەقڵە، لێیدەن و بیگرن. دوایی کوڕە

زیرەكەكە دەزانێ كە ئەوە باوكی ئەوە گیراوە! دەچێتە لای پاشا و پێیدەڵێ، من ئەمزانی خەڵاتەكەی جەنابت لەجیاتی خوێنی باوكم بوو. پاشا سەری سوڕدەمێنێ و دەڵێ چۆن ئەوە باوكی تۆیە؟ تۆ كەسێكی ئەوها ژیر و زیرەك و باوكیشت ئەو گەمژەیە! ئەویش دەڵێ جەنابی پاشا، زیرەكی من لە باوكم هاتوە، ئەو منی وەها فێركردوە. باوكم سوچێنیە كە باوكی ئەو ئەوی فێرنەكردوە. پاشا بە هەمان شێوەی جاران بە وەڵامەكەی كوڕە سەرسام دەبێ و دەڵێ كابرا بەردەن.

## دادوەرێكی زیرەك

دوو كەس لە سەر قەرز، لێیان دەبێتە مشت و مڕ. كابرای قەرزدار هەر ڕەتی دەكاتەوە كە پارەی ئەوی تری لەلابێ. ئەویش دەیباتە لای حاكم و بەسەرهاتەكەی بۆ باسدەكا. حاكم لە قەرزدەرەكە دەپرسێ شاهیدت هەیە كە پارەت دایتە ئەو كابرایە، كەس لەوێ بوو؟ ئەویش دەڵێ نەخێر. حاكم داوا لە قەرزدەرەكە دەكا بچێ هەندێك خۆڵ لەو شوێنە بێنێ كە قەرزەكەی لێداوە بە كابرای تر. بە قەرزدارەكەش دەڵێ ئەتو لێرە چاوەڕێبكە هەتا ئەو دێتەوە. دوای ماوەیەك، حاكم دەڵێ ئەو كابرایە هەر ناهاتەوە چی بەسەر هات؟ كابرای قەرزدار دەڵێ جەنابی حاكم شوێنەكە زۆر دوورە! ئیتر قەرزەكەی لەسەر دەبێتە ماڵ.

## كۆسە

دەگێردرایەوە كە جارێك چەند مەلا و فەقێیەك میوانی عەلی بەگی داسنی دەبن. عەلی بەگ پیاوێكی زۆر ماقوڵ بووە و پێموابێ ئیزیدی بووە. ئەوكات پیاوی گەورە كۆسەیان هەبووینە. كۆسە، واتا ڕاوێژكاری زیرەك. عەلی بەگ، یەكەم جاری بووە كە فەقێ و مەلا مێوانی دەبن. دیارە عەلی بەگ شانازی بە كۆسەكانی كردوە و ئەوان باسی هەواڵی سەیرو سەمەرەیان بۆ عەلی بەگ كردوە. بۆیە بانگی كردوون و لە پێش میوانەكان پرسیاری لێكردون كە لەو دونیایە چ باسە؟ كۆسەكانیش دەڵێن لە ڕۆژئاوا كوڕە پاشایەك ژن دێنێ و شاییە. لە ڕۆژهەڵاتیش پاشایەك مردووە، شین و گریانە و دوژمنیش هێرشی كردۆتە سەریان. عەلی بەگیش لە مەلا و فەقێیەكان دەپرسێ كە ئایا ئەوان چ دەبینن؟ ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن خوا نەبێ كەس ئەو شتانە نازانێ. عەلی بەگ قسەی مەلا و فەقێكانی دەچێتە ئەقڵ و ڕادەسپێرێ برنج و دوو مریشك

لیبنێن. یەك لە مریشکەکان لەسەر برنج دابنێن و ئەوەی دی لەبن برنج بشارنەوە. ئەوەی سەر برنج لە پێش مەلا و فەقێیەکان دادەنێ ئەوی تریش بۆ کۆسەکان دادەنێ. کۆسەکان تووڕە دەبن و دەڵێن ئەوانە دین دوژمنن و گۆشتت بۆ داناون و بۆ ئێمەش هیچ! عەلی بەگیش دەڵێ، ئێوە لە بن برنجی گۆشتێ نابینن کەچی دونیای لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەبینن؟! من تا ئێستا ئێوەم نەدەناسی، ماڵی ئەو مەلا و فەقێیانە ئاوابێ ئێوەیان بۆ ئاشکرا کردم. ئیتر باوەڕی پێیان نەما.

## ڕەزیل

دەگێرنەوە پیاوەکی دەوڵەمەند، بەڵام زۆر ڕەزیل و چروك، خێزانەکەی دووگیان ئەبێ و مەگیرانی بە جەرگ دەکا. مێردە چروکەکەشی بە ژنە دەڵێ، بۆ حەیوانت بۆ بکوژمەوە، دەچم جەرگ و هەناوت بۆ دەکڕم، لە کاتێکدا کە خۆی مەڕدار بووە. دەچێتە لای قەساب، بەڵام دەستی لێنابێتەوە جەرگ و هەناوەکە بکڕێ. قەسابیش کابرای چروك باش دەناسێ و دەیەوێ ماندوی بکا. پێی دەڵێ بڕۆ لە فلانە شار جەرگ و هەناو زۆر هەرزان دەفرۆشرێ. دەوڵەمەندەکەش هەر بیر لەوە دەکاتەوە دوو قڕۆشان پاشەکەوت بکا. لە ڕێگا شەوی بەسەر دادێ و لە دەرگای قەسرێکی گەورە دەدا، دەڵێ میوانم. خاوەن ماڵیش فەرمووی لێدەکا و بەخێری دێنێ. خاوەن ماڵ هەر بە خۆی و بە ژنەکەی لەوێ دژین و نانەکی چاك ئامادە دەکەن. بەڵام پێش ئەوەی دەست بە نانخواردن بکەن، ژنەکە دەڵێ بیکوتین ئینجا بیخۆین یان بیخۆین ئینجا بیکوتین؟ کابرای میوانیش نازانێ باسی چی دەکەن و دەپرسێ ئەمە چیە؟ خاوەن ماڵەکەش دەڵێ ئەو ژنەم مێردێکی دەوڵەمەندی زۆر ڕەزیلی هەبووە کە تێر بە زگی خۆشی نەخواردیە. دوای مردنیشی، هەر لەم خانووە ناشتراوە. منیش نەك هەر ئەم ژنەم هێنا، بەڵکو ئێستا خاوەنی ئەو هەموو سەروەت و سامانەشم کە ئەو کۆیکردبوەوە. هەموو ژەمێك من و ژنە لە پێش یان لە دوای نان خواردن، ڕێزە کوتکەك لە گۆڕەکەی دەدەین. بۆ بەیانی، دەوڵەمەندەکە هەرچی شتە دەکڕێ و لە پێش خۆی دەینێرێتەوە ماڵ. بۆ خۆشی ئەسپەکی زۆر چاك دەکڕی و دەگەڕێتەوە، هەر لە دوورەوەش دەڵێ بڕۆن دوو مەڕان بکوژنەوە و دابەشیکەن. ژنەکە سەری لە مێردەکەی سوڕدەمێنێ و هەر لێیدەپرسی ئەوەچیە پیاوەکە؟ تا ئێستا دڵت نەدەهات نانی بخۆی، ئێستاش نانی خەڵکی دەدەی! پیاوەکەش ووتی ژنێ، لێرە بەولاوە بەم جۆرە دەژین. ژنە هەر پرسیاری دەکرد کە چۆن و بۆچی وا گۆڕای. کابرا ووتی ژنێ، ئەوەی لە منی

دەدا بە چاوی خۆم دیت ئەوەی تۆشی دە... بەچاوی خۆم دیت. ئینجا ژنەکە تێگەیشت.

## سێ برای پیتۆڵ

سێ برای زیرەك بازرگانیەك دەکەن و قازانجێکی باشی لێدەکەن. دەچنەوە ماڵ و پارەکە لای دایکیان دادەنێن و دیسان دەگەڕێنەوە سەر کارەکانیان. دایکەکەشیان ژنێکی زۆر سادە و سافیلکە دەبێ. کابرایەکی فێڵبازیش بەدوای برایەکاندا هاتوە، چونکە دەزانێ پارەی چاکیان پێیە. کاتێك برایەکان قسە لەگەڵ دایکیان دەکەن، کابرا خۆی مەلاس دەدا و گوێی لێدەبێ کە پارەکە چەندە و لە کوێی دەشارنەوە. دوای چەند ڕۆژێك، کابرای فێڵباز خۆی دەگەیێنێتە لای دایکیان و دەڵێ کوڕەکانت بۆ پارەکەیان ناردووم. بەو شەرتەی پارەکە ئەوەندەیە و ئەوەتا لەو شوێنەش دانراوە. دایکە سادەکەش باوەڕی پێدەکا و پارەکەی بۆ دێنێ. کابرای فێڵباز پارەکە وەردەگرێ و بەپەلە لە شار دەردەچێ بۆ شوێنی خۆی.

دوای چەند ڕۆژێك، هەر سێ برا پێویستیان بە پارەکە دەبێ و دەگەڕێنەوە ماڵ. بە دایکیان دەڵێن پارەکەیان بۆ بێنێ. دایکە بەستەزمانەکەش دەڵێ ئەدی ئەو کابرایەتان نەنارد و پارەکەم بۆ ناردن؟! ئەوانیش لە دایکان دەپرسن کە باسی کابریان بۆ بکا تا سەرەداوێکی لێهەڵبکەن. دایکەش پیر و کوێر بووە و چاوەکانیشی کەم بینا بوونە، بەڵام دەڵێ کابرا فۆتێکی لەسەر بوو. ئەو سەرەداوە بۆ ئەوان بەسە بۆ ئەوەی شیعر ئاسا بە وەزن وقافیە و بە نۆرە بەدوایدا بچن و هەر جارە شتێکی بۆ زیاد بکەن تا کابرا دەدۆزنەوە. هەربۆیە برایەکیان دەپرسێ لەسەری فۆتە؟ برای دووەم وەڵامدەداتەوە و دەڵێ لەسەری فۆتە، لە ملی هەمبانە. برای سێیەم دەڵێ لەسەری فۆتە، لەملی هەمبانە، هەمبانی نانە. براکەی تر لێیوەردەگرێتەوە و دەڵێ لەسەری فۆتە، لەملی هەمبانە، هەمبانی نانە، چەند نوردیە نانە؟ ئەوەی تر دەڵێ لەسەری فۆتە، لەملی هەمبانە، هەمبانی نانە، چەند نوردیە نانە، نۆ نان نۆ نانە. بەم شێوەیە لە یەکیتر وەردەگرنەوە و هەر جارەی یەکێکیان هەمووی دەڵێتەوە و شتێکیشی دەخاتە سەر. لە کۆتاییدا دەبێتە: لەسەری فۆتە، لەملی هەمبانە، هەمبانی نانە، چەند نوردیە نانە، نۆ نان نۆ نانە، ناوی مام ڕەمەزانە، خەڵکی هەمەدانە، ماڵی لە گەڕەکی ناڵبەندانە، دەرگای لە قونەبانە، خانوەکەی لەسەر چوار ئەستوندانە، ژنی ناوی پورخەندانە، پارەیمە لەناو ناخوڕی گایانە.

برایەکان ملی ڕێگا بەرەو هەمەدان دەگرنە بەر. دەچن لە گەڕەکی نالبەندان پرسیاری ماڵی مام ڕەمەزان دەکەن و ماڵەکە دەدۆزنەوە. لە دەرگا دەدەن و مام ڕەمەزان لە ماڵ نابێ و پورخەندانی ژنی دەرگا دەکاتەوە. سێ براکە بەهەمان چەشنی مام ڕەمەزان قەناعەت بە پورخەندان دەکەن کە مام ڕەمەزان ناردونی بۆ پارەکە و پارەکە ئەوەندەیە و لەناو ناخوڕی گایانە. مام ڕەمەزانیش بە پورخەندانی ئەووتوە کە ئەوەندە پارەیەی لەناو ناخوڕی گایان شاردۆتەوە. بۆیە ژنە باوەڕیان پێدەکا و دەچێ پارەکە دەدۆزێتەوە و بۆیان دێنێ. لەو سەین و بەینەدا، مام ڕەمەزان دەگەڕێتەوە و دەبێتە کێشمەکێش و بینە و بەردە و مام ڕەمەزان شکایەت دەکا.

کە دەیان بەن بۆ لای حاکم، مام ڕەمەزان بە حاکم دەڵێ کە ئەو سێ کەسە ناناسێ و هاتون دزی لێبکەن. سێ براکەش بەسەرهاتی خۆیان بۆ حاکم دەگێڕنەوە و پێی دەڵێن کە ئەوان توانایەکی بێهاوتایان هەیە و دەتوانن شت ببینن و ئەگەر سەرەداوێکیان دەستکەوێ، ئەوا کاری ئەوان ناسانتریش دەبێ. حاکم بە قسەکانیان سەرسام دەبێ، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی لە دەست نابێ و دەیەوێ تاقیان بکاتەوە. پارەکە لای خۆی دێڵێتەوە و بە هەردوو لایان دەڵێ بۆ بەیانی بێنەوە لای. بۆ ڕۆژی دوایی، حاکم بانگی مام ڕەمەزان دەکا و لە لای خۆی دادەنیشێنێ و پێیدەڵێ، شتێك دەشارمەوە، ئەگەر ئەو برایانە زانیان چیە، ئەوا مانای ئەوەیە قسەی ئەوان ڕاستە. ئینجا بانگی برایەکان دەکا. هەر لەگەڵ ئەوەی هەرسێ براکە هەنگاو دەنێنە ناو ژووری حاکم، برا گەورەکە لە پێش ئەوانی ترە و بێ ئەوەی سەلام بکا دەڵێ نۆ! برای دووەم دەڵێ خرە وەکی گۆ، برای سێیەمیش دەڵێ حاکم بینە دەرێ، یان نارنجە یان لیمۆ. بێئەوەی حاکم پرسیاریش بکا، ئەوان زانیان چی لەبن ڕانی شاردۆتەوە و بەنیازی چ جۆرە پرسیارێکە. بۆیە حاکم ئەك هەر پارەکەیان بۆ دەگەڕێنێتەوە، مام ڕەمەزانیش زیندانی دەکا و برایەکانیش لای خۆی دادەمەزرێنێ هەتا تاوانبارانی بۆ بدۆزنەوە.

# دوو ڕوداوی خۆشناوەتی

## شەڕی هەرکی و خۆشناوان

باپیری خۆم ناوی قادر بووە بەڵام بە قادۆل ناسراوە و منیش بەناوی ئەو کراوم. بەداخەوە، من ئەوم نەدیوە چونکە بەر لەوەی من لەدایك ببم، کۆچی دوایی کردبوو. بەڵام، ئەم بەسەرهاتەم لە باوکم گوێ لێبوە کە ئەویش لە قادۆلی باوکی خۆی بیستبوو. ئەم بەسەرهاتە بۆ شانازی کردن بەو شەڕە نیە ئەوەندەی کارەساتێکی ترە کە کورد خۆبەخۆیی و لە ئەنجامی دواکەوتن و گیانی خێلەکیەتی بەسەر خۆی هێناوە. بەڵام هێشتا گێڕانەوەی باشترە لە نەگێڕانەوەی و پێم باشە بۆ مێژوو بمێنێ و وون نەبێ، بەڵکو نەوەکانی داهاتو هەندێ پەندو عیبرەتی لێ وەربگرن.

گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتە بەبێ بەستنەوەی بەمێژوویەکی کۆن، بێ ماناو کەم بایەخ دەبێ. دیارە لە سەردەمێکی زۆر کۆنەوە، کاروانی بازرگانی ئاوریشم بە کوردستاندا تێپەڕیوە و بۆتە هۆی بوژانەوەی ئابوری کوردستان. خەڵکی کوردستان هەم لەلایەك خەریکی بازرگانی بوون و لەلایەکی تریش خەریکی دابین کردنی پێداویستیەکانی ئەو کاروانچیانە بوون کە بارو بارگەکانیان بە ڕێگەی کوردستاندا گواستۆتەوە بۆ ئەوڕوپا. ئەم کاروان وکاروانچیانە لەکاتی تێپەڕینیان بە کوردستاندا پێویستیان هەم بە خواردن بۆ خۆیان وهەم بە ئالیك بۆ وولاخەکانیان بووە. هەروەها پێویستیان بە جل و بەرگ بۆ خۆیان وبە کورتان و ناڵ و بزمار بۆ وولاخەکانیان بووە. بەرهەم هێنان و دابینکردنی ئەم کەلوپەلانە لەگەڵ بازرگانیکردن بە ئاوریشم، کوردستانی کردبووە یەکێك لە شوێنە بوژاوەکانی دونیای ئەوێ سەردەمێ و شارەکانی کوردستانیش ئاوەدان بوون و جێگەی بازرگانی و کەسابەت بوون. هەروەها هاموشۆی ئەم خەڵکە بەناو کوردستان، بۆتە هۆی پێشکەوتن و تێکەلاوی خەڵکی کوردستان لە گەڵ خەڵکی وولاتانی تر و شارەزابونی کورد بە کەلتوری میللەتانی تر. مارکۆ پۆلۆی ئیتالی لە گەشتەکەیدا بە ڕێگای ئاوریشم هەتا وولاتی چین، بە کوردستنادا تێپەڕیوەو باسی کوردستانی وەك وولاتێك کردوە.

هەموو شەڕەکانی نێوان ئیمپرتۆریەتەکانی ئەم ناوچەیەش، لە دوو سێ هەزار ساڵی ڕابردوو، هەر لەسەر کۆنترۆل کردنی ئەم بازرگانیە و ڕێگای کاروانەکە بووە. گەرسەیریکی ئمپراتۆریەتی عوسمانیش بکەین، هەر لە دوای داگیرکردنی ئەستەنبۆل، پەرەیان بە شوێنی حەوانەوەی کاروانچیەکان داوە و بۆ کۆنترۆل

کردنی ڕێگاوبانەکانیش لە ناو کوردستاندا، خەڵکی تورکمانیان هێناوەو لەسەر ئەم ڕێگایانە نیشتەجێیان کردون. بەڵام، لەکاتی هێرشەکانی ئمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ کۆنترۆڵ کردنی ئەم بازرگانیە لەناو خاکی ئەوروپا لە ساڵانی ١٤٠٠ی زاینیدا، وەك کارتی فشار لەسەریان، ماوەیەك بازرگانی کردنیان بە ئاوریشم و کاروانەکانیان بەرەو ئەوروپا قەدەغە کردوە. هەر ئەمەش بۆتە هۆی هەوڵدانی ئەوروپاییەکان بۆ دۆزینەوەی ڕێگا دەریاییەکان بۆ گەیشتن بە هیندوستان و بازرگانیکردن بە ئاوریشم و چای و هەموو ئەو داودەرمان و بەهاراتەی لەوێ دەست دەکەوتن. هەر ئەم ڕێگرتنەش بۆتە هۆی دۆزینەوەی هەردوو کیشوەری ئەمەریکا.

جێگەی داخە، لەدوای دۆزینەوەی ڕێگا دەریاییەکان، گرنگی ڕێگای ئاوریشم نەماو لەجیاتی کاروانی دورو درێژی پڕ لە مەترسی و گەرما و سەرما و پەرینەوە لە ڕوبار و شاخ و بیابان وگواستنەوە بە پشتی وولاخ، ڕێگای دەریایی سەلامەتتر و گواستنەوە بە کەشتی بارهەڵگری گەورە هەڵبژێردرا. نەمانی ئەم ڕێگایە یان کەمبونەوەی ئەم بازرگانیە، زەرەرو زیانێکی یەکجار گەورەی بە کوردستان گەیاندوە، لەوانەیە ئەمە گەورەترین وسەرەکیترین هۆکاربێ کە کوردستان نەبۆتە وولاتێکی سەربەخۆ. لە دەرئەنجامی ئەم گۆڕانکاریە گەورەیەدا، ئابوری کوردستان زۆر کزبوو وە هەموو ئەو کارو کاسبیانەی لەسەر بنەمای بازرگانی وکاروانی ئاوریشم دامەزرابوون، لە ماوەیەکی زۆر کەم لەناوچوون. زۆر بەدەگمەن ئەبێ، چیتر خەڵکی وولاتانی تریش هاموشۆی کوردستانیان نەکردوە. لەپڕ کوردستان توشی نەهامەتیەکی یەکجار گەورە هاتوە و گەڕاوەتەوە سەردەمە تاریکەکانی دونیا. بەڵام چونکە خاکی کوردستان زۆر بەپیت و بەرەکەت بووە، لەجیاتی ئەوە خەڵکی کوردستان گەشەیان بە بەخێو کردنی مەڕوماڵات داوە.

بەخێوکردنی مەڕوماڵات، هەم خواردنی لە جۆری شیرو پەنیرو ژاژی و ماستی بۆ دابین کردون وهەم جلوبەرگ وڕایەخ وڕەشماڵیشیان لە خوریەکەیان دروست کردوە. بۆ پیویستیەکانی تریش، ئێریەکانیان فرۆشتوەو کەلوپەلەکانیان پێ کڕیوە. هەربۆیەشە، زۆربەی خواردنە کۆنەکانی کوردستان، لە دەورەی شیرو ماست و پەنیر کۆبونەتەوە وەکو کەشك و دۆین و دانۆك وبرنج بەشیر.. بەڵام بەخێوکردنی مەڕوماڵات، هەم پێویستی بە هاموشۆی گەرمێن کوێستان بووە وهەم پێویستیشی بە هێز بووە بۆ پاراستنی. لەمەش خراپتر، بەخێوکردنی مەڕوماڵات پێویستی بەژیانی کۆچەری هەیەو دژی نیشتەجێبونە لە شوێنێك. ئەم هۆکارانە وایانکردوە کە بەشێك لە میللەتی کورد بکەوێتە دوای پەزو دووربێ لە ژیانی نیشتەجێبون وشارستانیەت و قوتابخانە وزانست

وزانین و خۆی لەناو هۆزو خێل ڕێکبخا. بەداخەوە، لە دەرنجامی دوروستبونی ئەم خێڵ و گیانی خێڵەکیەتیە لە کوردستان، شەڕو ناکۆکی لەنێوان خودی خێلەکان لەسەر لەوەڕگاو شوێن و ڕێگای هاموشۆی گەرمێن کوێستانەکانیان دوروست بووە و بابەتەکەی ئێمەش لێرەدا سەرهەڵدەدا. هەروەها، هەرجارەی کورد لەگەرمێنەوە بەرەو کوێستان کەوتۆتەڕێ، عەرەب تخوبی کوردستانیان بەزاندوەو کەم کەمە، خاکی کوردستانیان داگیرکردوە.

ئەوەی دیارە، هۆزی خۆشناو زۆر بەدەگمەن گەرمێن وکوێستانیان کردوە، بەڵام خێلی هەرکی، کە شوێنی نیشتەجێبونی زستانەیان لەلای دیوین و ئەمبەرو ئەوبەری زێی بادینان بووە، لەکاتی بەهاران، بەدەم زێی بادینان و بەناو خێلی سورچی و گەڵی عەلیبەگدا بەرەو کوێستانەکانیان هامۆشۆیان کردوە و لە گەڕانەوەشیاندا، هەرهەمان ڕێگایان گرتۆتە بەر. بەڵام بەداخەوە، چوار ساڵ لەسەر یەك، ڕێگای گەڕانەوەیان گۆڕیوە. لەپاش گەیشتنیان بە خەلیفان، بەخۆیان و مەڕ و مالاتەکانیان لایان داوەتە دۆڵی بالیسان وهەتا سەر ڕێگای ڕانیە و بە دەوری کێوی هەورێ سوڕاونەتەوە لای کانی ماران و هێزۆپ و لەویشەوە چونەتە پشت شاخی سەفین و لەدەربەندی گۆمەسپانەوە بەدەم ڕوباری بەستۆڕەدا گەڕاونەتەوە هەوارگە زستانیەکەیان. بەم چەشنە، یەك دوومانگیان لەناو جەرگەی خۆشناوەتی بردۆتە سەرو هەتا بەفر بارین نەگەیشتونەتەوە هەوارگەکەیان. وەك دەزانن، خۆشناوەتی لە ڕووباری بەستۆڕدا دەستپێدەکا هەتا دۆڵی مەلەکان. لەم یەك دوو مانگەدا، خێلی هەرکی بە ناو ڕەزو باخ و بەروبومی خۆشناوان تێپەڕیون و زەرەرو زیانێکی یەکجار گەورەیان بە بەروبومی پایزیی خۆشناوان، وەکو نیسك و ماش و کونجی وترێ وهەنجیر وهەرمێ و برنج وهەموو شینایییەکانی تریان گەیاندوە و خەڵکەکەیان نەك هەر زۆر زەرەرمەند کردوە، بەڵکو بێ خواردن و زەخیرەیان کردون لە زستاندا. لەوەش زیاتر، هەرچی پاوان و لەوەڕگای خۆشناوان هەبووە، مەڕومالاتی هەرکیانی تێکراوە و مەڕومالات و بزن و مانگای خەڵکی ناوچەکەی لێ بێ بەشکراوە. کاتێك خۆشناو چونەتە لای سەرۆك هۆزی هەرکیان و شکایەتیان کردوە، وەلامیان ئەوە بوە کە "دەبێ خەڵك بەروبومی خۆی لەسەر ڕێگای ئەوان لاببا".

لەکاتی تێپەڕینی هەرکیەکان بەناو خۆشناوەتیدا، هەندێ کاوڕو هێزە ڕۆن و پێستە پەنیریان بۆ هەرسێ ماڵە میری خۆشناوان لە بالیسان و بێتواتە وقەڵاسنج بردوە وەکو سەرانە و باج، تاکو ڕێگریان لێ نەکەن. بۆساڵی دووەمیش، بە هەمان چەشنی ساڵی یەکەم، زەرەریان لە خۆشناوان داوە. ناچار، خەڵك چونەتە لای هەرسێ میر وگلەیی خۆیان پێراگەیاندون وە ناچاری

ماڵە میرەکانیان کردوە کە ئەم بارودۆخە چیتر قبوڵ نەکرێ و چارەسەربکرێ. بۆ ساڵی سێیەم، میری خۆشناوان چەندین جار هەوڵیاندا ئەم کێشەیە بەڕێگەیەکی ئاشتیانە چارەسەربکەن، بەڵام هەوڵەکانیان بێسود بوون و خێڵی هەرکیان هەر لەسەر ڕەوشی خۆیان بەردەوام بوون. بۆ ساڵی چوارەم، هێزی خۆشناوان کۆدەبنەوەو بڕیاردەدەن ئەم بێویژدانیەی هەرکیان قبوڵ نەکەن و سنورێکیان بۆ دابنێن. ئەوەی جێگەی داخە، مێژوی ئەم ڕووداوە دیارنیە و پێدەچێ لە دەوروبەری ساڵانی١٨٧٠ تا ١٨٨٠ بووە، باپیرم گەنج بووە کاتێك ئەم شەڕە ڕویداوە وە لەگەڵ زۆربەی پیاوەکانی خۆشناوان بەشداریان لەم شەڕەدا کردوە.

هەرکی خێڵێکی یەکجار گەورە بوون وهێزێکی یەکجار زۆریان هەبوو. بۆیە سەرکردەکانی خۆشناوان پلانێکی تۆکمەیان دارشت و بەرنامەیان دانا کە لە دوو شوێن لە خێلی هەرکیان بدرێ. سەرەتا لە دۆلی بالیسان و پاشان لەپشت شاخی سەفین. لە دۆڵی بالیسان، بڕیاریان دا کە هەتا سەرایی هەرکیان نەگاتە گوندی کانی ماران، لێیان نەدرێ. بەم چەشنە، هێزی هەرکیان بەدرێژایی دۆڵی بالیسان لێك کێشراوەتەوە، ئەو هێزەی سەرەتا، ئەی توانیوە بگەڕێتەوە دواوە وبەهانای هێزەکەی پشتەوە بێت. ئەم بەرنامەیە، سەبرێکی زۆری لە هێزی خۆشناوان ویستوە، چونکە خێڵی هەرکیان زۆر لەسەرخۆ لە دۆڵی بالیسان پێشەکشەیان کردوە. لە هەمان کاتدا، دەبوایە هێزی خۆشناوان ئاشکرا نەبێ وهەواڵی ئامادە باشیەکەیان دزە نەکاتە ناوهەرکیان. کاتێك سەرایی هەرکیان گەیشتۆتە کلکەی دۆڵی بالیسان، لە یەك کاتدا لە هەردو دیوی دۆڵەکە، لە بەنی هەریرو زەرتکان و هەورێ لە لایەك و لەلایەکەی تریش هەر لە بێتواتەوە تا دەگاتە گوندی خەتێ لە هەرکیان دراوە. باپیرم وای بۆ باوکم گێرابووەوە کە زۆربەی پیاوەکانی هەرکیان بەشداریان لە شەڕەکەدا کردوە و ژنەکانیشیان باروبارگەکانیان بارکردوە تا لە مەیدانی شەڕەکە دەربازبین.

بەداخەوە، شەڕ ماڵوێرانیە و زەرەر و زیانی هەیە و دوای شەڕێکی قورس، هێزی هەرکیان هەر ئەوەندەیان پێماوە بەپەلە خۆیان لە دۆڵی بالیسان دەرباز بکەن، بەوهیوایەی شەڕەکە لەوێ کۆتایی پێبێ. بەڵام پاش گەیشتنیان بۆ دۆڵی سماقوڵی وکاتێك هێزەکەیان بە درێژایی دۆڵەکە بلابۆتەوە، جارێکی تریش لە هەردوولای دۆڵەکە کەوتونەتەوە بەر هێرشی هێزی خۆشناوان. ناچار، ئەوخێلە گەورەیەی هەرکیان پەرت وبڵاو بووە و ئەوەی ماوە، بەپەلە خۆیان گەیاندۆتەوە هەوارگە زستانیەکەیان. هێزی خۆشناوانیش هەتا دیوین دوایان کەوتون وشەڕێکی قورسیش لەوێ ڕویداوە.

دوای ماوەیەك، چەند عەشیرەتەکی خێرخواز وەکو گەردیەکان، بەکاری ناوبژی هەڵساون نوێنەریان ناردۆتە لای خۆشناوان و لەوەڵامیشدا، سەرکردەکانی هێزی خۆشناوان وەڵامیان بۆهەرکیان ناردوە کە بەرنامەیان داناوە وشەڕی گەورە لە وەرزی بەهار دەستپێدەکا، کاتێك کە هەرکیی بەرەو کوێستانەکانیان لە تەك سنوری خۆشناوەتیدا تێدەپەڕن. وایان پێڕاگەیاندون، کە "هێرشی گەورە لە گەڵی عەلی بەگ دەقەومێ و بەیەکجاری کۆتایی بەو کێشەیە دێ". لەوێ ڕۆژێوە، خێڵی هەرکی بڕیاریاندا کە هاموشۆی گەرمێن وکوێستانیان بە ئەوبەری زێی بادیناندا بکەن و جارێکی تر تخونی سنوری خۆشناوەتی نەبنەوە. دوای ماوەیەکی زۆر و بۆ سارێژ کردنی ئەم برینە، هەردوو ماڵە میری هەرکیان وخۆشناوان، بە ژن خواستن و خوێن تێکەڵ بوون، ئەم برینەیان هەتاهەتایە سارێژ کردوە. شایانی باسە، لە دوای ئەم ڕووداوە، خێڵی هەرکی لەگەڵ هۆزو خێڵەکانی تریش لێیان بوە بە ناخۆشی.

## عەمەرخانی باکوری کوردستان

ئەم ڕووداوەشم هەر لە حەمەدئەمین قادۆلی باوکم گوێ لێبوە، کە بەداخەوە مێژوو و بەرواری ڕوودانی دیار نیەو تۆمار نەکراوە. بەڵام پێدەچێ لە دەوروبەری ساڵانی ۱۹۲۰ ڕویدابێ و زۆر لەوانەشە لەسەردەمی هێرشەکەی نۆزدەمیر پاشا بۆ سەر ڕەواندوز بوبێ. عەمەرخان سەرۆکی هۆزێك بووە و بەخۆی وهۆزەکەی لە زوڵمی دەوڵەتی تورکیا ڕایانکردوە و خۆیان پێ نەگیراوەتەوە هەتا گەیشتونەتە حاجی بایزی پشت شەقلاوە. عەمەرخان هێزێکی چەکداری زۆری لەگەڵ بووە و بەخۆیان ومەڕوماڵاتەکانیان گەیشتونەتە ئەوێ و پێدەچێ لە دەمەو پایز گەیشتبن.

ئەوەی جێگەی داخە، عەمەرخان و هۆزەکەی وەك هەرکیان مەڕوماڵاتی خۆیان بەرداوەتە ناو بەیارەکانی قەشان وپاش تەلانی شەقڵاوەییان، کە دەکەونە نێوان دەربەندی شەقڵاوە و حاجی بایز، زەرەرو زیانێکی گەورەیان بە بەیارەکانی ترێ گەیاندوە. وەك دیاریشە خەڵکی شەقڵاوە لەو سەردەم، جگە لە هەندێ میوە وگوێز وترێ و ماش و نیسك و برنج، شتێکی تریان نەبووە پێی بژێن. هەر ئەو میوە وترێیەیان بردۆتە دەشتی هەولێر و بەگەنم جۆیان داوە، یان کاروانی لای ئاکرێیان پێ کردوە و بە برنجیان گۆڕیوەتەوە. هەر ماڵە وهەندێك ترێی لە مشتاغەکانیش ڕاکردوە تا ووشك بوەو بۆتە مێووژ. هەندێکی تریشیان لەناو کۆل گوشیوەو ئاوەکەیان کوڵاندوەو هەندێ گڵی سپییان تێکردوە تا چڕبۆتەوەو بووە بە دۆشاو. هەروەها، لەخوار دەربەند و لەدەم ڕوباری

ڕوسارك، هەندێك لە زەویەكان كرابونە ماش و نیسك و برنج، ئەم بەروبوومانەش خەریك بوو بەهۆی مەڕومالاتی خێلی عەمەرخان لەناوبچن.

بە گەیشتنی عەمەرخان بە خۆی و هۆزەكەی و مەڕومالاتەكەیان، وە گوێ نەدانیان بە تەنها بەروبومی شەقلاوەییەكان، ژیانی ئەوخەلكەی ڕەزەكانیان كەوتبوە پاشتەلان، خستبوە مەترسی. هەر بۆیە ئەو خەلكە چونەتە لای میرانی قادربەگ و نارەزایی خۆیان گەیاندۆتە ئەو. میرانی قادربەگیش شانێدێكی پێكهاتو لە حاجی بایزبەگ، حەمەدئەمین قادۆلێ، حاجی مەجید بەگ، حوسێنی ڕەسولی، ئەحمەدی ڕەسولی، عەزیزی حەمەد بەگی، عەزیزە گۆج و دە تا پازدە چەكداری نازا بەرێ كردۆتە لای عەمەرخان. لەڕێگا دەبینن چەند چەكدارێكی عەمەرخان خەریكی ترێ ڕنینن لە بەیارەكانی قەشان و پاش تەلان، ئەوانیش دەستبەجێ چەكدارەكان چەك دەكەن و لەگەل خۆیان دەیانبەن بۆ لای عەمەرخان. كاتێك گەیشتونەتە ئەوێ وعەمەرخان دەبینێ پیاوەكانی چەككراون، تورە دەبێ و دەست بە گوڕوگیف دەكا. حاجی مەجیدبەگ دێتەدەم وپێی دەلێ "عەمەرخان، تۆ پیاوێكی ئاوارە و لێقەوماوی و هانات هێناوەتە بەر ئێمە. ئێمەش زۆرت بەخێر دێنین و هەر یارمەتیەكیشت لە ئێمە پێویستبێ، بە چاوان یارمەتیت دەدەین. بەلام ناكرێ تۆ بێی ئێمە لەسەر مال ومولكی خۆمان ئاوارە بكەی و خۆشت بكەی بە ئاغا لەسەر سەری ئێمە و ڕەزو باخاتی ئێمە بەربدەی". حاجی مەجید بەگ لە درێژەی قسەكانیدا باسی شەڕی هەركیان دێنێتە گۆڕێ و دەلێ، "بەر لە هاتنی تۆ، خێلی هەركی هاتن وتەعەدایان لە ئێمە كردو منەتی ئێمەشیان نەزانی، ئێمەش سنورێكمان بۆدانان. ئێستاش تۆ لێتقەوماوە و هانات بۆ ئێمە هێناوە، ئێمەش سەر سەرو سەرچاو یارمەتیت دەدەین. بەلام ئەگەر بە تەعەدا بێ، تۆ دەبێ ئەو ڕاستیە بزانی كەتۆ لەناو جەرگەی ئێمەی و هیچ شوێنێكیشت نیە بۆی بچی، بۆ هەرلایەك بچی لێتدەدەین و دەرباز نابی".

عەمەرخان بەم قسانەی حاجی مەجید بەگ دێتەوە سەرخۆی، وە ئەمر دەكا نان و چای حازربكەن وخەبەر بۆ هەموو هۆبەكانی هۆزەكەی خۆی دەنێرێ كە كەس نابێ كاری نابەجێ بكا و مەڕومالات بەربداتە ڕەزی خەلك. لەمەودوا جگە لە لەوەڕگا گشتیەكان و ئەو پاوانانەی كەوتونەتە دامێن میراوە و پشتی حاجی بایز وهەتا ماوەران، نابێ هیچ شوێنێكی تر مەڕومالاتی تێبكرێ. ئەوەی جێگای خۆشی بووە، ئەو پایزە زۆر سارد نەبووە و ناوە ناوە بارانێك باریوە و لەوەڕگاكان سەوز هەلگەڕاون وهەتا گەڕانەومیان، هیچ گرفتێكیتر لەگەل هۆزی عەمەرخان دوروست نەبووە.

# پەندی پێشینان

هەندێ پەندی کوردی تایبەت بە ناوچەیەکن و هەندێکیشیان لە گشت کوردستان بەکاردەهێندرێن. سەرەڕای شوێنی جوگرافی وولاتان، لە زۆر کەلتوری دونیا پەندی پێشینان شتێکی باوە، بگرە هەندێ پەند هاوبەشن لە زۆر کەلتوری جیا جیا. هەرچەندە زۆر لە پەندی پێشینان پێکدێن لە چەند ووشەیەك، بەڵام هەندێکیان واتاکانیان زۆر سوودبەخشن و زۆر جار مرۆڤ بەئاگا دەهێنن. لەبەر کەمی ڕۆشنبیری و نەبوونی تەکنۆلۆجیا تاکو بەر لە نیو سەدەی ڕابردوو، پەندی پێشینان کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر خەڵکی کوردستان. پەند، وەك ئامرازێك و یاسایەك سوودیان لێ وەردەگیرا بۆ ڕاستەڕێکردنی کار و تەگەرەکانی ڕۆژانە. لێرە تەنها باسی چەند نمونەیەك لەو پەندانە دەکەم کە لە کۆن زۆر گوێم لێدەبوون.

"ئەگەر هات دەرگای وەکە، ئەگەر چوو دەرگای وەکە". مانای بە هەر دوو جۆر دەرگا بکەوە، چونکە هیچ دەسەڵاتت بەسەر قەدەردا نیە. مەلا سادقی شەقڵاوە بۆی گێرامەوە کە کۆنە دەوڵەمەندێکی دەشتی هەولێر ئەو بەسەرهاتەی خۆی بۆ گێرابوەوە؛ کاتێك ئەگبەتی مێوانی کابرا دەبێ، هەرچی دەستی بۆ بردوە نەهاتی بووە. لەو هەموو موڵك و ماڵەی کە کابرا هەیبووە، تەنها چێڵ و کەرێکی بۆ ماوەتەوە. چێڵەکە نەخۆش دەکەوێ و ئەویش دڵی نایێ بیکوژێتەوە، بەو هیوایەی کە چاك ببێتەوە. دوای چەند ڕۆژێك لە کەم خەوی و چاوەڕوانی، مێوانێکی دێتە ماڵ. بە میوان دەڵێ من ماندووم، ئەگەر خەوم لێکەوت و چێلەکە لرخە لرخی کرد، ئەوا بیکوژەوە بالێمان مردار نەبێ. کابرای مێوانیش ئەڵێ باشە و بێ خەم بخەوە. شەو چێڵ لرخە لرخی دێ و میوانیش بە چاوی خەواڵوو و بەتاریکە شەو بەپەلە دەیکوژێتەوە. بۆ بەیانی دەبینن چێڵ مرداربووە و کەریش کوژرایتەوە!

کابرا دەڵێ، جاران بۆ من بە پێچەوانە بوو، بە هەموو شێوەیێك بۆ من هاتی بوو. دەڵێ جارێکیان لە شەوێکی باران بە سواری ئەسپ دەگەڕامەوە ماڵ و لیرەیەکم لێکەوت. منیش لە سواری هاتمە خوارەوە و بە ڕۆناکی چەرخ لیرەکەم لەسەر پنجە گیایەك دۆزیەوە. کاتێك گەیشتمەوە ماڵ و پێڵاوەکانم داکەند، لیرەکەی خۆم لەناو پێڵاو بوو و ئەوی تریش زیادە. مەبەستی ئەوە بووە کە هاتی بوو، بەهەمووشێوەیەك بەسەریدا دەباری.

"هەتا گندۆر گندۆر بوون مەیلت لەلای من زۆر بوون، گندۆر هاتنە خەلاس بوون، مەیلت لەلای من ساردبوون". هەتا هەبووی، مشەخۆر هەر لە لاتە و لە ماڵت دەخوا، کە نەبوونیش بووی بەجێت دەهێڵێ.

"ناو و ناو چی". بۆکەسێکی خراپ بەکاردێ کە ناتەوێ جارێکی تر بیبینیەوە.

"با ناوی سارد بخواتەوە". کە کەسێك دەزانێ یەکێکی تر لێی توورە بووە، ئەمە دەڵێ. مەبەستی ئەوەیە کە کات بداتە خۆی تاکو هێور بێتەوە.

"هیچ ناوی لێنەبوون، چوو لە کانیێ گوندی ڕێ". بۆ کەسێکە کە بە هەر شێوەیەك بێ ناوێك بۆخۆی پەیدا بکا.

"بێ دەورەت ماڵی خۆی دەشکێنێ". کابرای نەزان لە جیاتی مەدح، زەمی ماڵ یان کەسێکی خۆی بکا. پێموابێ دەورەت لە دەوڵەت هاتووە و بە واتای سامان. جاران کە دەگەیشتیە مام شوانێك لە جیاتی بلێی ماندوو نەبی، دەووترا "بە دەورەت بی"

"لە ژۆشکیان پرسی تووکی فەرخەی چ ئاژەڵێك لە هەموو تووکێك نەرمترە، ووتی هی من" یان "کەس بە دۆی خۆی ناڵێ ترشە" ئەوانە بۆکەسێك دەوترێن کە خۆی نەشکێنێ و کەم و کوڕیشی زۆربن.

"ئەگەر کەڵەبابیش نەبێ، ڕۆژ هەردادێ". بە کەسێك دەوترێ کە کارت بکەوێتە لای و بۆتی جێبەجێ نەکا، تۆش بزانی بەبێ ئەویش کارەکە هەر دەکرێ.

"لە بێ کەسی، ئەتوم بەسی". بۆکابرایەك ئەووترێ کە بێ کەڵك بێ، بەڵام ئەو دەمە پیویستیت پێی هەبێ.

"پشیلە سەرچۆپی هەر بۆلای ماستی دەبا". بۆ کەسێك دەوترێ کە بابەتی گفتوگۆ هەر دەهێنێتەوە سەر ئەو باسەی کە ئەو مەبەستیەتی.

"مردی خەڵکی بە خەڵکی چاوزەقە". بۆ کەسێك بەکاردێ کە کارەساتێکی گەورەی بەسەرهاتبێ و دەور و بەرەکەشی پێیان شتێکی وا نەبێ یان گرنگی بە کێشەکەی ئەو نەدەن.

"ئاغای داس لە سەپانی شاردەوە". کاتێك دەتەوێ خزمەتی کەسێك بکەی، کەچی ئەو ڕێگریت لێ بکا.

"ئانی بدە ئانکەری، نیوەی لە بەرِرا بخوا". بە مانی هەرچی بدەی بە ئیشکەری چاك، زەرەرنیە.

"ئیعتیبار لە ماڵی دونیا چاکترە". کەسێك کە ڕێز و حورمەتی لەناو خەڵك هەبێ، لە کاتی نەبوونیش پەکی ناکەوێ.

"چێڵ بە دۆ بایە، لە دەرگای ساحێبی دەبوو". بۆ شتێك دەووترێ کە دەیکڕی و چاك دەرناچی.

"گران بێ حیکمەت نیە، هەرزان بێ عیللەت نیە". زۆرجار باشی و خراپی شت، بە بەهاکەی دەستنیشان دەکرێ.

"یەك جار بە بەفر دەڵێن ساردە". بە مانای ڕاستی تەنها یەك جار ڕوونکردنەوەی دەوێ.

"لە کەس نامری". بۆ کەسی خۆپەرست دەووترێ، کە تەنها خەمی خۆی بێ.

"ئەگەر پیاو هەبن، تاریکە شەو زۆرن" یان "شەو قەلاتی مێردانە". مەبەست تۆڵەیە.

"بروشی مێردان بە کەڵێن دەکولێ". بۆ کەسێك دەووترێ کە زولمی لێ کرابێ، بەڵام لە ئێستادا بۆی ئەرەخسێ کە تۆڵە بکاتەوە و چاوەڕوانی هەلێك بێ.

"زاڵم ببێتە پرد، بە سەریدا مەڕۆ". بە واتای خۆت لە کەسی زۆردار دوور بگرە.

"گۆزەی ئاوێ، لە ڕێی ئاوێ دەشکێ". کەسی خراپ لە ڕێگای خراپە توشی کێشە دەبێ، یان پیاوی ئازا لە شەڕ دەکوژرێ.

"کەربەستە و خەم ڕەستە". کاری خۆت بە تەواوی بکە، بێ گومان بێخەم دەبی.

"هەتا ئەتنا لە تەبەق، نەتووت سەدەق". بۆ کەسێکی پەشیمان لە کردارەکانی بەکاردێ.

"شەڕ بە شیری، مامەڵە بە دراوی". واتا هەر شتە و بە مەبەستی خۆی.

"چاو غەنیمەی خۆی دەناسی". بە مانای چاو ئەو کەسە دەناسی کە خۆشی دەوێ یان رقی لێدەبێتەوە.

"ئەگەر هەتاوبێ، جۆتی ئەو دەگەڕێ". خەڵکی بە توانا و زیرەك هەمیشە کارەکانی بۆ بەڕێك و پێکی دەڕۆن.

"لێم بوویە گوریسی ناو هەمبانان". بە کەسێك دەڵێی کە قسەکانی بە ناڕونی بێنی و ببا. گوریسی ناو هەمبان دیار نیە کە چەندە درێژە.

"مێرد، یەك و هەزار دەبڕی". بۆ پیاوی مەرد بە کاردێ.

"گورگی باران دیتەیە!". بۆ کەسێك بەکاردێ کە شارەزایی زۆری هەبێ.

"ئەگەر دز و ماڵخۆ یەکبوون، گای لە کولانکێ ئاواکەن". مەبەست خیانەتە.

"پێشەنگی قەتارێ، کەرە". بۆ سەرکردەی لێ نەوشاوە بەکاردێ.

"ئەگەر هەر هیچت نەزانی، خۆیی مەدە بە بیانی". هەردەم خۆیی لە بێگانە باشترە.

"هەر تەیرەو، بە ڕەوەی خۆی". بەمانای نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ قاساب.

"لە هەموو دیزان ئەسکوە". بۆ کەسێ ئەووترێ کە خۆی لە هەمووشتێك هەڵبقورتێنێ و کاری ئەویش نەبێ.

"بە ڕۆژێ سۆفی یە، بە شەوێ دەلالیە". بۆ کەسی دوو ڕوو بەکاردێ.

"مەلەوانی زیرەك، لە ناوی قوڵ و بەرین ناترسێ". بۆکەسێ چاونەترس بەکاردێ.

"هەرچی لە مشك بێ، هەمبان دڕە". زۆرجار پیاوی خراپ، کوڕەکەی وەك خۆی دەبێ.

"داکی ببینە و دۆتی بخوازە". زۆرجار کچ دەچێتەوە سەر خوڕەوشتی دایکی.

"سەگ دەوەڕی و کاروان ڕادەبری". بۆ کەسێکە کە لۆمەی کەسێکی تر کاری تێنەکا و بەردەوامبێ لە ئەنجامدانی کارەکانی خۆی.

"زێ بە دەوی سەگ پیسنابی". بۆ کەسێکە کە خۆی بە گەورەتر بزانێ لە لۆمەی کەسێکی نەفام.

"لە کەرێ جل و جۆڕ، لە ژنان سەر و پۆڕ". ژنی پێشان سەروپێچیان لەسەر دەنا، زێڕ یان زیویشی پێوەدەکرا. ئەوە کاتێك دەوترا کە ژنێکی جوان مێردی بە پیاوێکی چاك، بەڵام ناشرین بکردبا.

"ئەگەر مێردت بە دڵی خۆبی، شەونوێنت چارۆگی خۆبی". ئەم پەندە بۆ ژنانە، واتا خۆشەویستی و بەختەوەری باشترە لە ماڵی دونیا.

"میری گۆتێ تاژی جلکە". بۆ کەسێ ئەووترێ کە خۆی بە گەورە بزانێ و فیز لێبدا، تەنها لەبەر ئەوەی پیاوێکی گەورە یان میر، شتێکی سادەی پێ سپاردووە. لە زستان کە تاژی دەبردرێ بۆ ڕاو، پارچە قوماشێکی دەخەنە سەرپشت کە پێی دەوترێ جل. میر تەنها داوای لە کابرا کردوە جل بەسەر تاژی دابدا، کەچی لە نێو خەڵك خۆی زۆر بە گەورە زانیوە.

"پێچك چوارە بەژمارە". بەمانای شتەکە دیارە و پێویستی بە ڕونکردنەوە نیە.

"هێلکەی بێ زەردێنەیە". بۆ کەسی بە فڕوفێڵە.

"دۆشاو لە پاشای قاتنیە". بەمانای کابرای هەبوون هەموو شتی پێ دەکرێ.

"تەبەقی قوڕێ، بە دەستی ناغای سوکە". لەوکاتە بە کاردێ کە کەسێ کاربکا و ماندوبێ، یەکێکی تریش زیاتری لێ ڕەچاوبکا.

"بەزی بە کتك سپاردیە". بۆکەسی کەم متمانە بەکاردێ.

**"خەڵك لە دین دەبێ، لە خوێن نابێ". واتا خزمایەتی لە زۆر شت گەورەترە.**

**"لە کەریان پرسی قۆناغت لە کوێیە، ووتی تۆبز دەزانی". کەر تەنها بە لێدان کار ئەنجام دەدا.**

**"لە بارگیریان پرسی قۆناغت لە کوێیە، ووتی جۆرك دەزانی". جۆرك (توورەکەی نالیکی وولاغە) واتا، تا خواردنی هەبێ بەردەوامدەبێ.**

**"لە هێستریان پرسی قۆناغت لە کوێیە، ووتی خاوەن دەزانی". واتا لە هەموو وولاغەك چاکترە بۆ خاوەنەکەی.**

**"بیور تیژبی، دار گەندەڵبی، یار لەدیاربی". بۆ کەسێکە کە هەلی بۆ بڕەخسێ و خۆی زۆر بە توانا پیشانبدا.**

**"مێشی لە دار دۆزیتەوە". بە مانای هەلێکی چاکی بۆ هەڵکەوتوە. مێش، بە مانای هەنگ.**

**"ئەوەی گا دەکا، گا ناخوا". بۆ دڵدانەوەی کەسێك دەووترێ کە کارێکی چاك و گەورە بکا، بەڵام خەڵکی تر خێر لە کارەکەی ببینن و منادوبوونیش بۆ ئەو.**

**"ئەگەر خەو چابا، کەروێشك گابا". بۆ کەسی تەمبەڵ بەکاردێ، چونکە کەروێشك زۆر حەزی لە خەوە.**

**"کەر بە کاروانان قەڵەو نابێ". بۆکەسێ دەووترێ کە خۆی لەسەر خەڵك بەڕێوەببا.**

**"حازر خۆری بەر سێبەرێ". بۆ کەسی تەمبەڵ بەکاردێ.**

**"لە دەنگان میری زەنگان، لە ئیشیش ڕیخ لە لینگان". کەسێك کە قسەی زۆر گەورەبێ و بە کردەوەش هیچ نەبێ.**

**"هەموو ڕۆژێ کار نامری، شفتەك بێتە پارەکی". کە هەلت بۆ ڕەخسا دەبێ بیقۆزیەوە.**

"ڕۆژی کۆرێ، هی کۆرنیه". واتا ئەگەر کارێکت دەستپێکرد، تا تەواوی ئەکەی وازمەهێنە.

"لە بێ خەبەران کەشکەك سەڵاوات". بۆ کەسێکە کە زۆر درەنگ هەواڵێکی پێبگا و لە دونیایێکی تر بێ.

"کەر لە کێ کەتیە، کوندە لە کێ دڕایە". بۆ کەسێ ئەووترێ کە دوو بابەتی جیا تێکەڵبکا.

"گاڕان بە گاوانەوە ڕۆی، پیرەژن تازە لە گۆلکە سۆرێ دەپێچێتەوە". کارێك زەرەری زۆر گەورەی دابێ، کەسێکیش لە شتی کەم بپێچێتەوە.

"جۆت و گا لەبەر بەرازی تەرك ناکرێ". ناکرێ لەبەر زەرەرێك یان بەهۆی کەسێك واز لە کار و بەرنامەکانت بێنی.

"کێ بە زار و دەوە مەزنێ گوندی ئەوە". بە واتای ئەوەی قسە زان بێ، دەتوانێ خۆی گەورە بکا. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆش دەتواندرێ بۆ میدیای پارتە سیاسیەکان بەکاربێ.

"بۆ من چ گورگ، چ سوار". گورگێك مەڕ لە شوان دەبا، سوارێکیش لەودەم پەیدا دەبێ و مەڕەکە لە گورگ دەسێنیتەوە، بەڵام بۆ خۆی دەبا. کەچی بە شوان دەڵێ بزانە چ سوارێکم؟ شوانیش ئەم پەندە دەڵێ. واتا بە هەردوو شێوە، مەڕەکە لە شوان ڕۆیشتوە.

"ئەگەر هەموو تەیر هەنجیرخۆر بان، بەشی ساحێبی نەدەما". بە واتای، هەموو کەس نازانێ لە دونیا بە خۆشی بژێ.

"بە قوڕێ گیرێ". جاران لە کوردستان، بەتایبەتی لە ناوچەی هەولێر، ئەگەر ئاغایەك یان پاشایەك کوڕێکی گەنجی بمردبا، دەرگای ژوورەکەیان بۆ ماوەی پەنجا، شەست ساڵ بە قوڕ دەگرت و بەرمبابی داهاتوو دەیانکردەوە.

"مازیکەرێ کون دەپاشۆلێ". بۆ کەسێك دێ کە ڕەنج بە خەسارێ.

"تفەنگ و ماین و ژن موڵکی پیاوی نینە، کەوتنە دەست کێ، ئەو خاوەنە". ڕفاندنی ئەو سێ شتە لە کۆن باو بووە.

"ژنی درێژ مازیی لە لێری، قەدە ژن گۆییی لە زێری، کورت ژن فتنان نەگێری" لێر، مەنای کەندار. گۆ مانای گوڵی قایشی ژنان.

لە کۆن دەووترا ئەوانە پەسەند نینە:

"گۆلکی چرمن، جاشکی کولکن، ڕەزی بەفریز، کوڕی داك حیز".

"گۆتنی لە هەورازی، غاری لەدو بەرازی، کوڕ بێوەژنی بخوازی".
هەرچەندە من لەگەڵ ئەوەی کۆتایی نیم، چونکە زۆر بێوەژن هەیە لە خۆی باشتر پەیدانابی.

"مشکی تەڕازنی، بەرخی بەر بزنی، مێردی دەستی ژنی، هەرسێك لۆ مردنی". مشکی تەڕازنی مانای مشکی کوێستانان کە زۆربەی کاتی ساڵ لە ژێر بەفر ژیان بەسەردەبا. ئەگەر بەرخیش دایکی بمردبا، لەبەر بزنیان دادەنا ئەویش قبوڵی نەبوو.

دەووترا ئەوانەی خوارەوەش خۆش و پەسندن:

"ئاوی کەندۆران، گۆشتی بەرخۆڵان، ماچی کیژۆڵان".

"نوستنی سەرەو لێژ، گۆشتی مەڕی گێژ، ماچی ژنی درێژ".

"ئاوی لێژان، گۆشتی گێژان، ماچی درێژان".

# سەرهەڵدانی کوردایەتی

چونکە هەر لە کۆنەوە شەقڵاوە بنکەی هیچ میرنشینێکی گەورە نەبووە، هەروەها لەبەر سەختی شوێنەکەی، نەکەوتۆتە سەر ڕێگای کاروانی بازرگانی. هەر بۆیە ئەم شارە نەبۆتە شوێنی هاموشۆ و تێکەڵاو بوون لەگەڵ خەڵکی شارەکانی تر. هەروەها تا دامەزراندنی حکومەتی عێراق، جگە لە خوێندنی ئاینی لە مزگەوتی گەورە، هیچ قوتابخانەیەکی لێ نەکراوەتەوە و کەسیش نەچووە لە شوێنێکی تر بخوێنێ. هەر لەبەر ئەم چەند هۆیەش بووە کە شەقڵاوە تا سەرەتای بیستەکانی سەدەی ڕابردوو، بەشداریەکی ئەوتۆی لە خەباتی کوردایەتیدا نەکردوە.

## سەردانەکانی سمایل ئاغای شکاک

من بە چاکی دەزانم کە هەردوو سەردانەکەی سمایل ئاغای شکاک (سمکۆی شکاک) بۆ شەقڵاوە، بە سەرەتای دەستپێکردنی کوردایەتی لەم شارەدا دابنێین. ئەوەندەی من بزانم مێژووی سەردانەکانی سمکۆی شکاک بۆ شەقڵاوە تۆمار نەکراوە و من دەماودەم لە باوکم بیستوە. لە دەوروبەری ساڵی ١٩٢٥، سمکۆ بۆ ماوەی چەند مانگێك لە بەحرکە میوانی جەمیل ئاغای گەردی بووە. پێدەچێ هەردوو سەردانەکەی بۆ شەقڵاوە لەو ماوەیە و لە ڕێگای چوونی بۆ دیدەنی شێخ مەحمود بووبن لە سلێمانی. من ئەوەندە دەزانم کە لە سەردانی یەکەمیدا پێشوازیەکی زۆر گەرمی لێکراوە و زۆربەی زۆری پیاوە ماقوڵانی شەقڵاوە بەرەوپیری سمکۆ چوون. لە سەردانەکەیدا، سمکۆ زیاتر لە چوارسەد سواری لەگەڵ بووە. کاوێس ئاغا یەکێك بووە لەو پێشوازیکەرانە و پاشان لە چەند سەردانێکیدا بۆتە هاوڕێی سمکۆ. ئەو دۆستایەتیەش کە لە نێوان سمکۆ و کاوێس ئاغا دروست بووە، بۆتە هەوێنی لاوکی شیوەنی سمکۆ کە پاشان دێینە سەری. دوای پێشوازیەکەش، سمکۆ لە ماڵی میرانی قادر بەگ میوان بووە.

باوکم کە یەکێك بوو لە بەگزادەکانی شەقڵاوە و هەمیشە پیاوێکی پۆشتەو خاوەن تفەنگێکی جامبیزاری زۆرچاك بوو، لە پێشوازی سمکۆ بەشداری کردوە و پاشان یەکێك بووە لەو کەسانەی کە لە دیوەخانی میرانی قادر بەگ ئامادە بووە. هەر باوکم دەیگێرایەوە کە چایەکیان بۆ سمکۆ هێنا، بەڵام سمکۆ وەرینەگرتوە و یەکەوسەر میرانی قادر بەگ ووتویەتی چایەکە بۆ من دابنێن. بە هەمان شێوە سمکۆ چای دووەمیشی ڕەتکردۆتەوە و میرانی قادر بەگ چایەکەی بۆ یەکێکی تر داناوە. دیارە میرانی قادر بەگ وە خەڵکەکە پێیان

وابووه كه سمكۆ مەترسى ئەوەى هەبووه كه ژەهرخوارد بكرێ، هەر بۆيه ميرانى قادر بەگ به يەكێك له هاوڵەكانى سمكۆ دەڵێ كه بچێ خۆى چايەك بۆ سمكۆ تێبكا، ئەويش چايەكى زۆر كەم ڕەنگ و زەردى بۆ تێدەكا. دياره لاى ئێمه هەر له كۆنەوه چاى به ڕەنگ و ڕەش باو بووه، كەچى له كوردستانى ڕۆژهەڵات چاى كەم ڕەنگ باوه. دواتريش قاوه پێشكەش به ميوانان كراوه، بەڵام پێدەچێ هەندێك له سوارەكانى سمكۆ بۆ يەكەم جار قاوەيان تام كردبێ، چونكه يەكێكيان فڕێك له قاوەكه دەداو دەڵێ "تووبەح.. لەوێ زەهيرێ!".



سمكۆى شكاك

له سەردانى دووەميدا، كه پێ دەچێ هەر له سەر له سەر و بەرى ساڵى ١٩٢٥ ڕويدابێ، سمكۆ هەر به شەقڵاوه تێپەر بووه و تەنها بۆ نانخواردن لايداوه. لەوانەشه دەسەڵاتى حكومەتى عێراق بەهێزتر بوبێ و هەندێك كەس خۆى پاراستبێ. بۆيه لەم سەردانەيدا پێشوازيەكى گەورەى لێنەكراوه و زۆر له شەقڵاوه نەماتەوه. له يەكێك له سەردانەكانى، سمكۆ گوێى له دەنگى زەنگولى كلێسەى سەرگرد دەبێ و هەندێك قسەى نەشياو دەرحەق به برا مەسيحيەكانى شەقڵاوه دەكا. ميرانى قادر بەگ زوو دێته وەڵام و نەك هەر ڕێگه نادا سمكۆ لەوه زياتر لەسەر ئەو بابەته بدوێ، بەڵكو زۆر بەتوندى پشتگيرى له برا مەسيحيەكانيش دەكا و به نەهێنى دەكەوێته خۆئامادەكردن و بڵاوەپێكردنى چەكدارەكان. سمكۆ، له كوردستانى ڕۆژهەڵات و بەر له هاتنى بۆ بەحركه، لەگەڵ مەسيحيەكانى دەروپشتى شارى ورمێ توشى كێشه بووه و دەرەنجامى زۆر ناخۆشى لێكەوتۆتەوه. ئەم كارەى سمكۆش بۆته لەكەيەكى ڕەش له مێژووى كورد. كورد و برا مەسيحيەكان سەدان ساڵه لەگەڵ يەك دەژين و كوردستان هەميشه جێگەى بيروباوەڕ و ئاينى جيا بووه، بەڵام دياره ئينگليز

دەورێکی زۆر ڕەشیان لە دروستکردنی ئەم ناڕاوەیە گێڕاوە. کۆکردنەوەی برا ئاشوریەکانی پارچەکانی تری کوردستان و هێنان و جێگیرکردنیان لە کوردستانی خوارو، بەشێك بووە لەو بەرنامەی ئینگلیز.

سمکۆی شکاك لە ناوەڕاست لەگەڵ چوار لە پێشمەرگەکانی لە دیوەخانی جەمیل ئاغای گەردی

## کاوێس ئاغاو لاوکی نیشتیمانی

چونکە کاوێس ئاغا خاوەن دەنگێکی زوڵاڵ و پیاوێکی کوردپەروەر بووە، توانیویەتی ڕۆڵێکی گەورە لە مێژووی کوردایەتی نەك هەر لە شەقڵاوە، بەڵکو لەسەرتاسەری کوردستان ببینێ. کاوێس توانیویەتی لاوك بەسەر سێ شۆڕشەکەی ئەو سەردەمی کوردستان دابنێ. سەرەتا شۆڕشی شێخ مەحمودی و پاشان شۆڕشی سمکۆی شکاك و دوای ئەویش شۆڕشی شێخ ئەحمەدی بارزان. تا ئێستا کەم هونەرمەندی کورد توانیویانە گۆرانی بەبێ جیاوازی بچڕن. کاوێس یەکەم لاوك بێژ بووە کە لە سەردەمی ڕاپەڕینی ئەو سێ شۆڕشەدا لاوکیان بەسەردا بڵێ.

لاوك بەشێوەیەکی گشتی زۆری باس لە قارەمانێتی و ئازایەتی دەکا، هەتا ئەگەر لاوکەکە باسی عیشق و خۆشەویستیش بێ. هەروەها لاوك باسی چیرۆکی کۆن و ڕابردووە کە لای خەڵکی باو بوونە و دەماودەم گێڕدراونەتەوە و پاشان کراون بە لاوك تاکو وون نەبن. دیارە زۆربەی میللەتانی دونیاش بەم قۆناغەدا تێپەڕیون، بەڵام چونکە کوردستان قەت دەوڵەتێکی سەربەخۆ نەبووە،

ئێمەی کورد ئەمان توانیوە مێژوو و کەلتوری نەتەوەییمان بنوسینەوە و دۆکیومێنتی بکەین. هەربۆیە، گۆرانی و لاوك و دەماودەم گێرانەوەی بەسەرهاتەکان، تەنها رێگە بوون بۆ پاراستنیان لە فەوتان. لە لاوکی هەرسێ شۆرشدا، کاوێس بە بەهرە شیعریەکەی خۆی توانیویەتی لاوك بەسەر قارەمانێتی و نازایەتی هەرسێ شۆرشی سەردەمدا بڵێ و توانیویەتی هەرسێ شۆرشەکە و سەرکردەکانیان بەخەڵك بناسێنێ و لای خەڵکی کوردستان بەگشتی و خەڵکی شەقڵاوە بەتایبەتی خۆشەویستیان بکا. لەو سەردەم، دەنگی کاوێس ئاغا تاکە میدیا بوو لە ناوچەکە.

دیارە هەندێك لە لاوکەکانی کاوێس ئاغا وون بوون و من دڵنیا نیم کە ئاخۆ لاوکی شۆرشی بارزان تۆمار کراوە یان نا، بەڵام من ئەم لاوکەم چەندین جار لە خودی کاوێس ئاغا گوێ لێ بووە. کاوێس ئاغا دۆستێکی نزیکی باوکم بوو و باوکم زوو زوو میوانداری کاوێسی دەکرد. هەروەها باوکم زۆر حەزی لە شتی جوان دەکرد و سەمەوارێکی میرسواری زەردی رووسی زۆر جوانمان هەبوو لەگەڵ مافورێکی بەرچاوی کاشان. هەر جارەی کاوێس ئاغا مێوانی ئێمە بوایە، مافورەکەمان بۆ رادەخست و دایکم سەمەوارەکەی هەڵدەکرد. دوای نان خواردن و چای خواردنەوەش، کاوێس دەستی بە لاوك گوتن دەکرد تا شەو درەنگان. من لاوکی بارزانم چەندین جار لەم بۆنانە گوێ لێ بووە، بەڵام بەداخەوە هەمووییم بیر نەماوە، تەنها ئەم چەند دێرەی خوارەوە نەبێ. هەرچەندە زۆر جاریش هەندێك لە لاوکەکانی بە شێوازی جیاواز دەگوتنەوە:

مەلیکۆ بەلایێ خۆ لە وولاتێ مە وەکە

وولاتی مە چیایە

داروبارێ چیایێ پیرە فاتێ خۆلێکدایە

شێخێ بارزان لە مەیدانێ هەرستایە

بە رۆژێ گرێنێ تەیاران و شرقێنێ مەترەلۆزان

بەشەوێ گازەگازێ نۆبەتداران و لاوکێ دێوانان

پاش سەردانەکانی سمکۆ بۆ شەقڵاوە، دۆستایەتیەکی توند لە نێوان سمکۆ و کاوێس ئاغا دوروست بووە و کاوێس ئاغا هاورێیەتی سمکۆی کردوە بۆ چەند

شۆێنێك. هەر بۆیە ئەم هاوڕیەتیە بۆتە هەوێنی لاوکی شیوەنی سمکۆ، کە دوای شەهید بوونی لە شاری شنۆ دانراوە. هەرچەندە ئەو لاوکە وون نەبووە، بەڵام زۆر بە دەگمەن دەست دەکەوێ. ئەم لاوکە لاوکێکی درێژە و وەك گوتم شیوەنە بۆ سمکۆ، زیاتر لەوەی بە شان و باڵی ئەو و شۆڕشەکەیدا هەڵبدا. ئەم چەند دێرەی خوارەوەش بەشێکە لەم لاوکە دوور و درێژە:

دەلێ لێ، دەلێ لێ سوارۆ

شەڕەکی گەورە کەتە جادا شنۆیێ

شەڕەکی مەزنە

ئەورۆ شاد و شودێ سمایل ئاغا، بابێ خەسرەو گەلەکن

گازدەکاتە خورشید، بابێ فەیسەل

گەلێ عەشیرەتان دەست هەڵینانەکی بکەن

ئەورۆ ئەمرێ تارانێ لۆ قوماندارێ شنۆیێ هاتیە

لە مابەینێ مەغریب و عیشایێ، عەسکەرێ خۆ و جبەخانێ دانا بنە

ئەورۆ دەنگێ سێ تیران و جامبێزاران، ئاگر بەردا دنیایێ

وەلی مخابن سمایل ئاغا، بابێ خەسرەو

ئاگری دارێ سێ تیرێ، پاکەتی باوێتە ناوێ

...

لاوکی شێخ مەحمود بزر نەبووە و ئاسان دەست دەکەوێ، بەڵام سەردانی کاوێس ئاغا بۆلای شێخ مەحمود، حەق وانیە پشت گوێ بخرێ و تۆمارنەکرێ. من لە خودی کاوێس ئاغام گوێ لێ بووە کە لە سەردانەکەیدا، شێخ باوەڕی نەکردووە کە کاوێس لاوك بێژە دەنگ خۆشەکەبێ، چونکە کاوێس لە قسەکردندا لاڵ بوو. هەر بۆیە شێخ ناردوویەتی سەندوق بێنن و قەوانەیەکی

کاوێسیان پێ لێداوه و هەمان لاوکی بە کاوێس دووبارە کردۆتەوە. ئینجا شێخ باوەڕی کردووە کە ئەوە کاوێسە و پاشانیش کاوێسی خەڵات کردووە.



شێخ مەحمود

کاوێس ئاغا لە لاوکی گەنج خەلیل، کە پێدەچێ لاوکێکی زۆر کۆنبێ و تەمەنی سەدان ساڵ بێ، باس لە کوردایەتی دەکا. کاتێك کە حەوسەت خان بە شانازیەوە ئامادەیە دەست لە زێڕو خشڵی خۆی هەڵگرێ و کەزی و بسکی خۆی ببڕێ تا ئەسپی گەنج خەلیلی پێ برازێنێتەوە کە ئەسپێکی کەوێتەی ڕەشە. ئینجا بە سواری ئەو ئەسپە ڕەشە ڕازاوە، بە ناو تورکە عوسمانیەکاندا بیهێنێتە ناو بازاڕ، تاکو کەسیان بە هیچ شێوەیەك نەتوانن ڕەخنە لە ڕێك و پێکی، نەك تەنها گەنج خەلیل، بەڵکو لە سوارێکی کورد بگرن. وەك لە لاوکەکە دەڵێ:

کەمەرێ پشتێ خۆ بشکێنم بۆ ئەسپێ گەنج خەلیل بکەمە ناڵە،

بازنێ خۆ بشکێنم بکەمە وورده بزمارە،

بسکێت خۆ ببڕم بکەمە سەرڕێشمە و سەرچاو بکەمە تۆق و سەرهەوسارە،

گەنج خەلیل بینم سوار بکەم لە کەوێتەکێتاڵە،

بەڵێ کوڕماما خۆ بینم بە ناو شارێ عوسمانیاندا بینمە خوارێ،

کەس لۆمەی کورماما من نەکەن،

بەڵێ نەبێژن سوارەکی کوردە، چەندی بێ کاروبارە،

سەرەڕای ئەوانەش، کاوێس ئاغا کوڕەکانی خۆشی بەگیانی کوردایەتی پەروەردە کردوە. بۆ نمونە، پاش ئەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان بە ڕەسمی مۆڵەتی کارکردنی لە ساڵی ١٩٥٩ وەرگرت، ئەحمەدی کوڕی کاوێس سەرپەرشتی شانەیەکی پارتی دەکرد و دەوری هەبوو لە دامەزراندنی بارەگای خەبات لە شەقڵاوە. هەروەها لە دوای کۆتایی هاتن بە گفتوگۆی نێوان پارتی و حیزبی بەعس لە ساڵی ١٩٦٣ کە جارێکی تر شەڕ هەڵگیرسایەوە، ئێمە چەند پێشمەرگەیەك لە هێزی سەفین ئەرکی کۆنترۆڵ کردنی دەربەندی کۆڕیمان پێ سپێردرا بوو. بەڵام دوای ئەوەی لەو شەڕە پاشەکشەمان کرد، هیچ شوێنێکمان نەما لێی بگیرسێینەوە تەنها ئەشکەوتی حۆداوە نەبێ لە چیای سەفین، بەڵام زۆر برسی و ماندو بووین. جەمیلی کوڕی کاوێس ئاغا، تاکە کەس بوو کە بوێرانە خواردنی لە شەقڵاوە بۆ هێناینە ئەو ئەشکەوتە.

هەر بۆیە وا باشە، کاوێس ئاغا بەسەر قافڵەی کاروانی سرودی نیشتمانی لە کوردستان دابنرێ، چونکە ئەوسێ شۆڕشەی بە خەڵك ناساندون و سەرەتایەکی بۆ کوردایەتی داناوە.

## حزبی هیوا و سەرەتای ڕێکخراوی سیاسی لە شەقڵاوە

بەگۆك ئەفەندی بە شۆڕە سواری کاروانی ڕێکخستنی سیاسی لە شەقڵاوە دادەنرێ، چونکە یەکەم کەس بووە هاتۆتە ئەم مەیدانە و بەردی بناغەی ڕێکخستنی حیزبایەتی لە شەقڵاوە داناوە. هەر ئەویش لەگەڵ خەلیل بەگی کوڕی حەمەد بەگ هەوڵی ڕێکخستنی خەڵکیان داوە، تا بە گیانی کوردایەتی پەروەردەیان بکەن. دوای دامەزراندنی حیزبی هیوا لەلایەن چەند قوتابیەکی کورد لە کەرکوك کە دڵداری شاعیریەکێك بوە لەم قوتابیانە، بەگۆك ئەفەندی و دواتر خەلیل بەگ پەیوەندیان بەم حیزبە کردوە. پاشان ئەم چەند قوتابیانە پەیوەندیان بە ڕەفیق حلمی کردوە بۆ ئەوەی ببێ بە سەرۆکی حیزبەکەیان. بەڵام لە شەقڵاوە واباو بوو کە حسین حوزنی موکریانی سەرۆکی حیزبی هیوا بووە. من لە ڕێگای محمد مەولودی نوسەر، موکریانیم ناسی. پیاوێکی ڕێك بوو و ڕدێنێکی سپی هەبوو.

لەو دەور و بەرە، خەلیل بەگ گۆرانیەکی بۆ هاندانی خەڵك بۆ چوونە قوتبخانە دانا، کە ئەم دوو دێرەیم لەبیر ماوە:

ئەی منداڵینە با بچینە مەکتەب
بۆ دەردی جاهیل مەکتەب دەرمانە

...........
ئەمڕۆ زەمانی عیلم و عرفانە

...........

کۆمەڵێك گەنج لە شەقڵاوە پەیوەندیان بە حیزبی هیوا کرد و خۆیان و خەڵکیان لە ناو ئەو حزبەدا ڕێك خست. ئەم کۆمەڵە گەنجە بوون بە سەرقافلەی ڕێکخستنی سیاسی لە شەقڵاوە. ئەوەندەی من شارەزام و ئەو ناوانەی بیرم ماون: خەلیل حمد بەگ، محمد مەولود(مەم)، مامۆستا ئیسماعیل حسێن، وەسمان قادرە ڕەش، عزیز مام مەحمود، ڕەسوڵ کاکۆ، بەگۆك ئەفەندی، قادری سەلیم بەگ، ئەحمد حەمەدئەمین قادر، حەمە ساڵح کامەلا، عەلی قادری مەدێ (ناسراو بە عەلی ئەفەندی)، مەلا گچکە، محمود حاجی وەسمان، مام تەها کاوانی، حاجی خدر کامەلا، سەلیم ئەفەندی، حاجی ڕەشید، مەلا حوتان، عەمەر سولەیمان بەگ، ساڵح مینۆ، حەسەن یاری، سەبری کاکۆ، جەمیل میران، عەبدوڵا ئومەر، عثمان سۆفی برایم، تۆما بیا خۆشناو. هەر ئەم کۆمەڵە گەنجەش توانیان کۆمەڵێك خەڵکی ترلە ناو ڕیزەکانی حزبی هیوادا ڕێکبخەن.

من لە ساڵی ١٩٤٠، لە ڕێگای مەم پەیوەندیم بە حزبی هیوا کرد. ئەوکاتە وا باو بوو کە هەرکەسێك پەیوەندی بە حیزب بکردبا، دەبوایە سوێند بدرێ و پەیمان بدا کە خیانەت لەگەڵ کورد و حزب ناکا. بە پێی ئەم ڕێ و شوێنە، منیان بردە لای محمد ساڵح کامەلا و سوێندی پێ خواردم. بۆ سوێند خواردنەکەش، محمد ساڵح منی بردە مزگەوتی گەورە وە لەلای قەبری میران ژوورێك هەبوو قورئانی لێ دانرابوو. منیش دەستم لەسەر قورئانی پیرۆز دانا و سوێندەکەم خوارد. لە یادیشمە سوێندخواردنەکەم بەم شێوەیە بوو "قورئان بە حەقت بە ساحێبت، ئەمن کوردم، خیانەت لە میللەتی کورد ناکەم، ئەگەرهەر خیانەتێکیشم کرد، ئەوا مستەحەقی کوشتنم".

من بەتەنها سویندم خوارد، بەڵام گەر لە یەك كەس زیاتر و بەیەكەوە پەیوەندیان بە حزبی هیوا بكردبا، ئەوا بەیەكەوە سویند دەدران. لە كاتی سویند خواردنەكە، قورئانی پیرۆز و خەنجەریك و ئاڵای كوردستان دادەنران. هەندیك جار لە كاتی كۆبونەوەكانیشدا هەمان سویند و بەهەمان شێوە دووبارە دەكرایەوە. ئەوەندەی لە بیرم ماوە، ئاڵایەكەی كوردستان چیایەك و ڕۆژێك وخەنجەرێكی لەسەر بوو.

ئاڵای ئیستای كوردستان، سەرەتا لە ساڵی ١٩٢٠ لەلایەن ڕێكخراوی خۆییبون لە كوردستانی توركیا دروست كراوە و پاشان لە شۆڕشی چیای ئاگری (ئاگری داغ) بە سەركردایەتی ئیحسان پاشا هەڵدراوە. دواتر بۆتە ئاڵای حكومەتی كوردستان لە مەهاباد، وە ئەمڕۆ لە سەر تا سەری باشوری كوردستان بەرز كراوەتەوە.

دوای پەیوەندیكردنم بە حزبی هیوا، من و هەریەك لە: عزیز مام یونس، عەبدوڵا ئۆمەر، مستەفا حسێن مسری، وە چەند كەسێكی تریش كە ناوەكانم بیرنەماون، لەیەك شانەدا ڕێكخراین. محمد مەولود سەرپەرشتی شانەكەی دەكرد و كۆبونەوەی پێدەكردین. ئەوكات من ناوی ئەهێنیم ئەبەز بوو.

حزبی هیوا زۆر زوو گەشەی كرد و ئەوەندەی من ئاگاداربم، كابرایەك بە ناوی عەزیز فەتاح سەرپەرشتی حزبی هیوای هەر لە هەولێرەوە تاكو ڕەواندز و بارزان دەكرد. عەزیز فەتاح زوو زوو سەردانی شەقڵاوەی دەكرد و لەگەڵ ئەو گەنجانەی كە سەرپەرشتی شانەكانیان دەكرد، لەسەر ڕێگای دەربەندی شەقڵاوە پیاسەیان دەكرد و هەر بە ڕۆیشتن كۆبونەوەی پێدەكردن. بۆ ئەوەی لە شێوەی كۆبونەوە نەچێ و حكومەت پێی ئاگادار نەبێ.

جارێكیان سەلیم ئەفەندی كە لە بەغدا دەیخوێند، نامەیەكی بۆعثمان قادر ناردبوو كە بە وەسمان قادرە ڕەش ناسراوە. بەڵام ئێلیای بەرید نامەكە بە هەڵە بۆ عثمان قادر میران دەبا و وادەزانێ نامەكە بۆ عثمان بەگە. نامەكەی سەلیمە ئەفەندی زەمی دەرەبەگەكان دەكا وە هانی لایەنگرانی حزبی دەدا كە لە دژیان بوەستن. ئەم ڕوداوە چەند گرفتێكی بۆ سەلیمە فەندی و وەسمان قادر دروست كرد. چەندین جاری تریش ئێلیای بەرید نامەی وەسمان قادری بۆ عثمان بەگ بردبوو. تا وای لێهات جارێكیان وەسمان قادر هەڕەشەی لە ئێلیا كرد، ئیتر ئەم كارە دووبارە نەبووەوە.

له كۆبونەوەكان باس له مێژوی كورد و سەركردە قارەمانەكانی وەك كەریم خانی زەند، سەلاحەدینی ئەیوبی و بنەماڵەی بەدرخان دەكرا. هەروەها باس له دەوڵەتی ماد وغەدری ئینگلیز له كورد و چۆن ئەو میللەتانەی دەوروبەری ئێمە هەموویان ئێمە به بەشێك له میللەتی خۆیان دەزانن. كەچی ئێمه زۆر لەوان كۆنترین و هەر لەسەر خاكی كوردستان ماوین. له كاتێكدا كه میللەتانی تر له شوێنی ترەوە هاتوون و كوردستانیان داگیر كردووە. هەر بۆیە حیزبی هیوا توانی چاوی میللەتی كورد بكاتەوە و ببێ به سەرەتایەك بۆ دامەزراندنی حزبێكی تری پتەو و تۆكمە.

من له بیرم نیه دوای من كێ پەیوەندی به حزبی هیوا كرد، بەڵام هەر له رێگای محمد مەولود زانیم كه عثمان میران كه له من بەتەمەن تربوو، ببوە ئەندام له حزبی هیوا. هەر ئەو هۆیەش بووە وای كردوە كه ناوی كوردی له كوڕەكانی خۆی بنێ وەك: ئازاد، ئەوزاد، شێرزاد، كامەران... كه ئەوكات كەم كەس ناوی كوردی بۆ كوڕەكانی خۆی هەڵدەبژارد. هەروەها عثمان میران دەستی نوسینیشی هەبوو، من له یەكێك له گۆڤارەكانی گەلاوێژ نوسینێكی عثمان بەگم خوێندۆتەوە.

هەر به رێگای حزبی هیوا، پاش ئەوەی رەشید عالی گەیلانی بۆ جاری دووەم دەسەڵاتی گرتە دەست و بریاریدا شەڕی ئینگلیز بكا، خەلیل بەگ توانی یەكەم خۆپیشاندان له شەقڵاوە رێكبخا. ئەم خۆپیشاندانە چاوی خەڵكی شەقڵاوەی له دژی زوڵم و زۆری ئینگلیز لەسەر كورد كردەوە. لەم خۆپیشاندانەدا كه زۆربەی گەنج و پیاوانی شەقڵاوە بەشداریان تێداكرد، چەندین دروشم بەرزكرانەوە و خەڵكەكە له دوای خەلیل بەگ دەیان گووتنەوە. هەندێك لەو دروشمانەی كه تا ئێستاش لەبیرم ماون:

"ئەمرۆ لەرێی سەربەستی، گیان فیداینە بەمەستی"

"سەربەستی نادۆڕێنین، چاوی ئینگلیز دەردێنین"

"سۆری چاوشین قڕانیان، زووهات بەدەستی كوردان"

"لا اله الا الله، ئینگلیز دەشكێ ان شاء الله"

"تا دوژمن بژی له نێو وولاتمان، هەر ژێردەست دەبین نابێ ئەجاتمان"

"وەتەن بۆ دوژمن سەد شێر لە مەیدان،
پەرت و بڵاویانکەین بە وولاتی  کوردان"

دوای خۆپیشاندانەکە، ساڵحە لار(لاڵ) توانی سی تا چل کەسێك کۆبکاتەوە کە بچن لە قشڵە خۆیان ناونوس بکەن و ئامادیی خۆیان پیشانبدەن بۆ شەڕ لە دژی ئینگلیز.

شایانی باسە، ژنێکی قارەمان بەشداری لەم خۆپیشاندانەکرد کە ناوی حەلیم خان بوو، ناسراو بە (حەلێ فاتێ). حەلیم خان خێزانی جامی برای سعید جامی بوو و پاش مردنی مێردەکەی، شوی نەکردەوە و لە هەموو شین و شاییەك لە ڕیزی پێشەوە بوو. لەم خۆپیشاندانە، ئاڵایەکی گەورە لەلایەن پلك (پور)ە حەلیم هەڵگیرا بوو.

هەر لەم سەروبەرەدا، وەستا عەبدوڵای ئاسنگەر و وەستا کەریمی چەخماخچی (ناسراو بە کۆرین) کە هەردووکیان ئەوکات سەربازی میری بوون، ئامادە نەبوون بەشداری شەڕبکەن لەگەڵ سوپای ئینگلیز و لە دژی ڕەشید عالی گەیلانی. هەر بۆیە هەردوکیان توانیان لە سەربازی ڕابکەن و بێنەوە بۆ شەقڵاوە. چەند ساڵێکی پێ چوو هەتا وەستا عەبدوڵا ئاشکرا بوو و دیسان بردیانەوە بۆ سەربازی. بەڵام چونکە وەستا کەریم کەمتر لە شەقڵاوە دەمایەوە و بۆ کارەکەی خۆی هاموشۆی شوێنی تری دەکرد، توانی خۆی لە سەربازی بدزێتەوە.

لە ساڵی ١٩٤٢، حەمە ڕەشیدخانی بانە توانی لە دژی حکومەتی شای ئێران بوەستێ و ناوچەیەکی فراوان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی. مەلا گچکەی کوڕی مەلا عەوڵای موفتی، وەك پیاوێکی شۆڕشگێر شەقڵاوەی بەجێهێشت و پەیوەندی بە حەمە ڕەشید خان کرد. ماوەی دوو ساڵ لەوێ مایەوە، پاشان پەیوەندی بە حکوموتی کوردستان کرد لە مەهاباد. هەربۆیە مەلا گچکە بە یەکەم پێشمەرگەی شەقڵاوە دادەنرێ. هەرچەندە یاخی بونەکەی حەمە ڕەشید خان بە شۆڕش لە قەڵەم نەدراوە، بەڵام ئەمە لە شۆڕشگێریەتیەکەی مەلا گچکە کەم ناکاتەوە، چونکە ئەو بە ناوی شۆڕشەوە پەیوەندی بە حەمە ڕەشید خان کردبوو.



چەند سوارێکی کورد

لەسەر پەیوەندیەکانی بە حیزبی هیوا و دوای تەواو کردنی قوتابخانە لە ساڵی ۱۹٤۲، مامۆستا ئسماعیل حوسێن بۆ ماوەی دوو ساڵ لە ماڵەوە دەستبەسەر کرا. بەڵام مامۆستا ئسماعیل بەم هۆیەوە نەك هەر لە حیزب دانەبڕا، بەڵکو نامەیەکی حیزبی هیوا و کۆمەڵەی ئەفسەرانی کوردی بۆ ئەمین ڕەواندوزی برد، کە ئەو کات لە کاولۆکان فەرماندەی فەوجی سنور بوو. بەر لە گەڕانەوەی بارزانی لە سولێمانیەوە بۆ ناوچەی بارزان، بارزانی و ئەفسەرە کوردەکان ویستویانە هەڵوێستی ئەمین ڕەواندزی بەر لە هەڵگیرسانی شۆڕش بزانن.

ساڵح بەگ ئەندامێکی سەرەکی حیزبی هیوا بوو و لە ڕیزی پێشەوەی کوردایەتی بوو لە شەقڵاوە. هەر بۆیە کاتێك بارزانی لەساڵی ۱۹٤٤ بڕیاری شۆرشی دووەمیدا، پەیوەندی بە چەند سەرۆك هۆزێکی کوردستان کرد و سەردانی هەندێکیانی کرد. ساڵح بەگ یەکێك بوو لەوانەی کە بارزانی لە ساڵی ۱۹٤٤ سەردانی کرد و هانیدا کە بەشداری لە شۆڕشەکە بکا.

بەر لە دامەزراندنی پارتی و دوای دامەزراندنیشی، بارزانی چەندین جار سەردانی شەقڵاوەی کرد. زۆربەی جارەکان لە ماڵی ساڵح بەگ میوان دەبوو. سەردانی دووەمی بارزانی دوای گەڕانەوەی بوو لە یەکێتی سۆڤیەت و هەر لە ماڵی ساڵح بەگ بوو. من محمدی کوڕم لەگەڵ خۆم بۆ سەردانی بارزانی برد، ئەویش تەوقەی لەگەڵ محمد کرد. بۆ جاری دواتر، بارزانی لەگەڵ شێخ ئەحمەدی بارزان هاتن بۆ شەقڵاوە و هەر لە ماڵی ساڵح بەگ میوان بوون. دوای ئەوەش جارێکی تر لە ڕێگای چوونی بۆ بەغدا لە قشڵە دابەزی و لەگەڵ قائمقام کۆبوەوە.

هەربۆیە کاتێك بارزانی شۆڕشی بەرپاکرد، ساڵح بەگ بە خۆی و چەند کەسێك چوونە گوندی ترگارە و بریار بوو لەوێوە بچنە گوندی خەتێ لە دۆڵی بالیسان وە ئەوێ بکەن بە یەکێك لە بنکەکانی شۆڕش. ساڵح بەگ و ئەو چەند کەسەی کە لەگەڵی بوون، ڕەشاشێك و چەند تفەنگێکیان پێ بوو، بەڵام سەدیق بەگ بە دوایان داچوو و ساڵح بەگی ڕازی کرد کە بگەڕێتەوە بۆ شەقڵاوە.

بەر لە چوونی ساڵح بەگ بۆ ترگارە، حکومەت هەوڵیدەدا کە وەك سەرۆك هۆزی خۆشناوان، بیکات بە ئەندامی پەرلەمانی عیراقی. دوای ئەو ڕوداوە، ڕۆلی ساڵح بەگ لەلای حکومەت کەمبوەوە، بەڵام ڕێزی لای میللەتی کورد زۆر گەورەتر بوو. شایانی باسە، لە کاتی سەردانی بارزانی بۆ شەقڵاوە لەساڵی ١٩٤٤، وێنەیەکی لەماڵی ساڵح بەگ گیراوە. ئەسعەدی کوڕم، توانی ئەم وێنەیە لە پەرتوکێکی ئینگلیزی بەناوی "کوردستان لە سێبەری مێژوو" بڵاو بکاتەوە.



بارزانی لە ماڵی میرانی
ساڵح بەگ شەقڵاوە
ساڵی ١٩٤٤

دوای بەرپابوونی شۆڕشی مەهاباد و دامەزراندنی کۆماری کوردستان لەسەر دەستی پێشەوا قازی محەمەد، پێنج کەس شەقڵاوەیان بەجێ هێشت و بەرەو مەهاباد کەوتنە ڕێ، بۆ ئەوەی بەشداری لە شۆڕش بکەن. ئەم پێنج کەسە بریتی بوون لە محەمەد ساڵح کامەلا، قادر سەلیم، عەبدوڵا نۆمەر، مەلا گچکە و حاجی خدر سەعید کامەلا ناسراو بە حاجی هەمینێ. محەمەد ساڵح و قادر سەلیم بەیەکەوە بەرەو ڕانیە کەوتنە ڕێ، بەڵام دوای ڕۆیشتنیان حاجی سەلیمی مامی محەمەد ساڵح کابرایەکی نارد بە شوێنیان. ئەم کابرایە توانی لە ڕانیە بیاندۆزێتەوە و هەردوکیان ڕازی بکا کە بگەڕێنەوە بۆ شەقڵاوە. حاجی خدر کامەلا گەیشتە مەهاباد، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت و لەبەر چەند هۆیەکی تایبەت گەڕایەوە شەقڵاوە. عەبدوڵا نۆمەر بەر لە هەموویان بەرێ کەوت و نەگەڕایەوە و بوو بە پێشمەرگەی کۆماری کوردستان و کرا بە ئەفسەر لەوێ،

بەداخەوە دوای ماوەیەك كەوتە بەر بۆمبارانی فرۆكە و شەهید بوو. عەبدوڵا نۆمەر بە یەكەم شەهیدی ڕێگای ڕزگاری كورد و كوردستان لە شەقڵاوە دادەنرێ. بە ڕای من عەبدوڵا نۆمەر و مەلا گچكەی شاعیر، شایانی ئەوەن كە هەرچی زووە پەیكەر یان هەر سومبولێكی تری نەمریان لە شەقڵاوە بۆ دوروست بكرێ. یەكیان وەك یەكەم پێشمەرگە و ئەوەی تر وەك یەكەم شەهیدی ڕێگای ڕزگاری كورد لە شەقڵاوە.



پێشەوا قازی محەمەد

بەر لە شەهید بوونی و لە هاوینی ١٩٤٦، عەبدوڵا نۆمەر بە سەردان گەڕایەوە شەقڵاوە. من لە باخچەكەیان لە سەرگرد چوومە سەردانی. لە ناوەندی باخچەكەیان چەند قەدێك چرۆی لە دەوری خۆی چەقاندبوون تا لە چوارڕیانی سەرگرد دیار نەبێ. عەبدوڵا گلەیی لە من و هاوڕێكانی خۆی لە حیزبی هیوا كرد كە بۆچی لەگەڵ ئەو نەچووین بۆ مەهاباد بۆ پشتگیری حكومەتی كوردستان لەوێ.

شایانی باسە، مەم لە ڕۆمانی "كاروان" بە هێما باسی قادر سەلیم و محمد سالح كامەلا دەكا، یەكێكیان بەناوی میرزا و ئەوەیتریان بەناوی خێلە، بەڵام هەر بەناوی خۆی باسی عەبدوڵا دەكا. مەم و عەبدوڵا هاوڕێی زۆر نزیكی یەك بوون و كاتی خۆی لە قوتابخانە بەیەكەوە بوون. هەر لە ڕۆمانەكە باسی عەبدوڵا دەكا كە گوایە ئەو لە نەشغال بووە و مەم لە شوێنی حەسانەوەی نەشغال لە نزیك قەبرستانی شارۆچكەی خەلیفان سەردانی كردووە. هەر لە ڕۆمانەكەدا وە لە هەمان سەرداندا، مەم باس لەوە دەكا كە هەمزە عەبدوڵا لە هەمان شوێن لەگەڵ عەبدوڵا نۆمەر بووە. مەم لەو ڕۆمانەدا بە ناوێكی نهێنی باسی هەمزە عەبدوڵا دەكا، من ئەم زانیاریەم لە خودی مەم گوێ لێبووە، كە ئەم ناوە نهێنیە هەمزە عەبدوڵایە. شایانی باسە، هەمزە عەبدوڵا یەكەم سكرتێری پارتی دیموكراتی كوردستان بووە و بە هەماهەنگی لەگەڵ بارزانی

بیرۆکەی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستانی لە مەهابادەوە هێناوەتە کوردستانی باشور.

لە دانیشتنەکەمدا لەگەڵ عەبدوڵا نۆمەر، پێی ڕاگەیاندم کە گەنجێکی دەوروبەری شەقڵاوە کە هیچ پەیوەندیەکی بە حیزبی هیوا نەبوو، پەیوەندی بە حکومەتی کوردستان لە مهاباد کردبوو. لەوێ عەبدوڵا نۆمەر دەبێ بە کەفیلی و تفەنگێکی دەدەنێ، بەڵام زۆر مەخابن ئەم گەنجە تفەنگەکەی ڕفاندبوو و گەڕایەوە بۆ ناوچەی شەقلاوە.

## دامەزرانی پارتی دیموکراتی کوردستان

دوای دامەزراندنی پارتی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە ساڵی ١٩٤٥، کوردی کوردستانی باشور کەوتنەخۆ بۆ دامەزراندنی هەمان پارت. هەربۆیە ساڵێك دوای دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان لە مەهاباد  و لە هەمان ڕۆژ لە ١٦ ئابی ١٩٤٦، پارتی دیموکراتی کوردستان لە عێراق دامەزرا. هەمزە عەبدوڵا لەلایەن پارتی ژیانەوەی کوردستان (ژ. ك.) بانگهێشت کرابوو بۆ کوردستانی ڕۆژهەڵات و دوای دامەزراندنی پارتی لەوێ، گەڕایەوە بۆ کوردستانی باشور و پەیوەندی بەسەرانی حیزبی ڕزگاری و حیزبی شۆڕش کرد و بیرۆکەی پارتی دیموکراتی کوردستانی پێ ڕاگەیاندن.

دامەزراندنی پارتی لە کوردستانی باشور سەرەتایەکی نوێ بوو، بەتایبەتی کە بارزانی بە سەرۆك هەڵبژێردرا، چونکە بارزانی تازە سەرکردایەتی شۆڕشێکی کردبوو، هەروەها بەشداریشی کردبوو لە دامەزراندنی حکومەتی کوردستان لە مەهاباد، وە ببوو بە ئەستێرەیەکی درەوشاوە لە ئاسمانی کوردستان. پارتی دیموکراتی کوردستان (پ د ك) زۆر زوو گەشەی کرد و خەڵك بە کۆمەڵ بەشداریان تێداکرد. حیزبی هیوا کە پێشتر پەیوەندی لەگەڵ بارزانی هەبوو، لە ناو پارتی دیموکراتی کوردستان توایەوە و زۆربەی ئەندامانی بوون بە بەشێك لە پارتی دیموکراتی کوردستان. حیزبی ڕزگاری و شۆڕشیش هەمان هەنگاویان نا. (پ د ك) وەك حزبێکی خاوەن دیسپلین، توانی شانەی قول دابمەزرێنێ و زوو گەشە بکات.

ئەوەندەی من بیرم مابێ و ئەوانەی لە ڕیزی پێشەوە بوون لە پەیوەندی کردن بە پارتی دیموکراتی کوردستان لە شەقڵاوە: قادر حەسەن، خەلیل بەگ، محمد مەولود، مام تەها کاوانی، ئیسماعیل حوسێن، وەسمان قادرە ڕەش، بەگۆك

ئەفەندی، حەمەدئەمین حاجی ڕەشید، ئەحمەد حاجی حەسەنە شەل، پەتۆ مامەکە، کاکۆ ئێلیا، سەلیم ئەفەندی، عەزیز مام مەحمود و عوسمان ئەفەندی.

قادر حەسەن دەورێکی زۆر سەرەکی بینی لە ڕێکخستن و گەشەکردنی پارتی، چونکە ئەك هەر توانی خەڵك لە شەقڵاوە ڕێکبخا، باڵکو بە حوکمی ئەوەی لە ئەشغال کاری دەکرد، توانی خەڵکێکی زۆر لە ناوچەی باڵەکایەتیش ڕێکبخا. هەروەها مامۆستا ئیسماعیل حوسێن و مامۆستا بەگۆك کە ئەوکات لە ناوچەی باڵەکایەتی مامۆستا بوون، دەورێگی گرنگیان لە پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی پارتی لە مەهاباد و حیزب لە کوردستانی باشوردا بینی و لەبەر ئەو چالاکی و ماندوبونەیان، نامەیەکی ڕێز و سوپاسیان لە کۆماری مەهابادەوە پێشکەش کرا.

دوای شکستی حکومەتی کوردستان لە مەهاباد، زۆربەی ئەندامە بەرزەکانی ئەو حکومەتە دەستگیرکران، بەڵام هەندێکیان کوردستانی رۆژهەڵاتیان بەجێهێشت. یەکێك لەوانەی گەیشتە شەقڵاوە، شاعیرو نوسەری گەورەی کورد مام هەژاری موکریانی بوو، بەڵام بەداخەوە ڕۆژ و ساڵی گەیشتنەکەیم لەیاد نەماوە. تەنها مامۆستا ئیسماعیل حوسێن، مامۆستا بەگۆك، محمد مەولود، مام تەها کاوانی و من دەمانزانی کە مام هەژار لە شەقڵاوەیە. لە یادم نەماوە کە کێ ئەوکات مائمور نفوس بوو و ئایا ئاگادارمان کردەوە یان نا، بەڵام ئەوەندە دەزانم کە توانیمان سجلی نفوس لە قشڵە بێنینە دەر و ناوی مام هەژاری بە ناوی گوندی زیارەت تێدا تۆمار بکەین و دەفتەر نفوسێکی بۆ دەربێنین. دوای ئەم هەنگاوە، مام هەژارمان ڕەوانەی بەغدا کرد و لەوێ لە ماڵی عەبدوڵا کانی مارانی حەشاردرا و دوای ماوەیەك ڕەوانەی سوریا کرا. ئەم هەوڵە شانازیەکی گەورەبوو بۆ شەقڵاوە کە توانرا شاعیر و نوسەرێکی گەورەی کورد ڕزگاربکەین. ئەم هەوڵە ئەبوایە، لەوانەبوو شاکەڵەکانی وەك چێشتی مجێور، شیعرەکانی خەیام، مەم وزین، هەمبانە بۆرینە، وەرگێرانی قورئانی پیرۆز بۆ کوردی و چەندین پەرتوکی بەنرخی مام هەژار ڕوناکیان نەدیبا. هەر لەو سەرو بەرەدا، مامۆستا عەبدولرەحمانی زەبیحیش هاتە شەقڵاوە، بەڵام من ووردەکاری ئەم زانیاریەم لەیاد نەماوە.

عەونی یوسف لە ساڵی ١٩٤٧، توانی بۆ یەکەمین جار مۆڵەتی ئاهەنگ گێرانی ئەوروز لە شاری هەولێر وەربگرێ و ئاهەنگێکی قەشەنگ ڕێکبخا. من ئەوکات لە هەولێر سەربازبووم، عەزیز مام مەحمودیش لەگەڵ ئێمە سەربازبوو. ئەو توانی ئامر سریەکەی خۆی ڕازی بکا کە بۆ ڕۆژی ئاهەنگی ئەوروز ئەیەتە سەربازگە و بەشداری لە ئاهەنگەکە کرد. لە سەربازگە ڕۆژانە

تفەنگیان بۆ مەشق کردن پێدەداین. بۆ نیوەڕۆش تفەنگەکانیان لێ وەردەگرتینەوە و ئێمەش دوای نان خواردن دەچووینە ناوشار. بەڵام بۆ ئەوەی حکومەت ڕێگا لە ئێمە بگرێ تا بەشداری لە ئاهەنگەکە نەکەین، ئەو ڕۆژە تفەنگەکانیان تا سەعات پێنجی ئێوارە لێ وەرنەگرتینەوە و هەر مەشقیان پێکردین.

زۆر لە مەلایەکان لە ساڵانی سی و چلەکان دژی نەورۆز بوون. ئەوەی ئاگری نەورۆزی بکردبایەوە پێیان دەووت "ئاگر پەرست". لەبیرمە من و ئەحمەدی کوڕی مامم منداڵ بووین، لە سەربانی خانوو ئاگرمان دەکردەوە. زۆر جار لە نەورۆزەکان پۆلیس بەسواری ئەسپ دەگەڕان، بۆ ئەوەی ڕێگری بکەن لە خەڵك کە ئاگر نەکەنەوە. ئەوکات من و عبدوڵای مەلا خدر وە چەند کەسێکی تر ئاگرمان لەسەر بانی ماڵی حەمەدی مەلا ڕەحمان کردبووەوە و خەریك بوو بگیرێین.

لە ساڵی ١٩٤٨، خۆپیشاندانێکی جەماوەری گەورە لە شەقڵاوە ئەنجامدرا و شیوعیەکان سەرپەرشتی ئەم خۆپیشاندانەیان دەکرد. ڕابەر یان ڕێکخەری خۆپیشاندانەکە، کچێکی چاونەترس و ئازای هەولێر بوو بە ناوی سامیە شاکر ئاغا. شاکر ئاغا خواردنی زیندانیەکانی بە قۆنتەرات لە حکومەت گرتبووەوە و ئەوکات من دۆستایەتیم لەگەڵی هەبوو. بە ووتەی نوسەر و ڕۆشنبیری شەقڵاوە، مامۆستا زرار سەرتاش دەڵێ "دواتر سامیە بوو بە شاعیر و نوسەرێکی گەورە. هەروەها لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو لە حکومەتی عیراق بوو بە وەزیر و بە سامیە چاوشلی ناوزەد کراوە. ئەو کچە، کچێکی یەکجار بە جەرگ بووە کە لەو ڕۆژگاردا حکومەتی عیراق حیسابی تایبەتی بۆ کردوە. هەر لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو لە بەر زوڵم و ستەمی بەعسیەکان ڕای کردوە بەرەو ووڵاتی ئەڵمانیا. لەوێش بڕوانامەی دکتۆرای بەدەست هێنا و ئێستا یەکێکە لە ژنە چالاکەکانی جیهان لە بواری بەرگری کردن لە مافی ژنان و لە چەندین ڕێکخراوی جیهانیدا ئەندامە".

ساڵی ١٩٥١ ڕێکخستنەکانی حزبی شوعی لە عێراق ئاشکرا بوون و خەڵکێکی زۆر لە ئەندامان و کادیرانیان لە سەر تا سەری عێراق گیران. من لە شوعیەکانم بیستوە کە بەڕێوەبەری مینای بەسراش لەو هەڵمەتەدا گیرا. ئەوانەی لە شەقڵاوە گیران و دێنەوە بیرم: حەنە جبرائیل، یوسف قەشە حەنە شێر، یەلدای شابەی حانێ، عەزیز ساڵح حاجی وسو، برایمی ئەحمەدی لێفێ، عبدالرحیم کوڕی مەلا ئەحمەد، قادر خەلیفە، محمود حمیدی ئاغا و قادر سلیم بەگ. هەندێکی تریش گیران، بەڵام ناوەکانم بیرنەماون. ئەوانەیان گرتن و

زۆریان نەشکەنجەدان کە یەکەم جار بوو شتی وا لەشەقڵاوە ڕوو بدا! ماڵی قادر سەلیم زۆر دوور نەبوو لە ماڵی ئێمە، بەڵام فاتمەخانی عەلی بەگ کە خوشکی ئەو بوو، لەگەڵ ئێمە جیران بوو. لە هاوینان زۆربەی ماڵەکان دەچوونە ناو باخەکانی خۆیان، بەڵام باخی قادر سەلیم هەر لە دامێن خانوە زستانیەکەی بوو. دیاربوو ناوەکانی حیزبی شیوعی و بڵاوکراوەکان لە ماڵی قادری سەلیم بەگ حەشاردرابوون. فاتمەخان زۆر باوەڕی بە من هەبوو و ئەو نهێنیەی لای من درکاند. بەیەکەوە تەگبیرمانکرد کە چۆن ئەمانە دەرباز بکا. فاتمەخان چووە ماڵی قادری برای و زۆر بە گورجی خرارێکی داگرت و هەرچی پەرتووك و کاغەزی قادر سلیم هەبوون خستیە ناوی و لە پشتی خۆی هەڵدا. لە ماڵی ئەوان نەهاتەوە سەر ڕێگا، بەڵکو لەبن دوودەرانیەکەی ماڵی حاجی سەلیم چووە دامێن قشڵە و لە خواروی تاوکان بەرەو ئاش چوو. گوایە باراشی پێیە و لە ئاشی دەکا. لەوێشەوە بردیە ناو باخچەکەیان و حەشاری دان. پاشان حکومەت ئەو ماڵە گەڕاو هیچیان نەدۆزیەوە. دیاربوو قادر سلیم بەرپرس و باوەڕپێکراو بوو لە حیزبی شوعی. ئەوانەی گیران هەموویان لە دوو تا دەساڵ زیندانی کران. دوای ئازادبوونیشیان، هەندێکیان لەژێر چاودێری بەردەوامدا بوون. ئەو ژنە قارەمانە ژیانی دەیان و سەدان کەسی ئەو حیزبەی پاراست. هەرچەندە هەندێکیان گیران، بەڵام ئەگەر ئەو نەبوایە ئەوا هەر هەموو ڕێکخستنەکانی ئەو حیزبە ئاشکرا دەبوون و هەموو ئەندامەکانی دەگیران.

نەك هەر میری، بەڵکو ئەمریکاو ئینگلستانیش زۆر لە شیوعیەکان و بڵاوبونەوەی شیوعیەت دەترسان. یەکێك لەو ڕێگایانەی ئەو وولاتانە بەکاریان دەهێنا و تا ئەمڕۆش بەکاری دێنن، ناردنی گروپ و دەستەی مسیۆنەریە بەناوی ڕێکخراوی خێرخواز. یەکێك لەو گرۆپە مسیۆنەریانە، کۆمپانیایەکی ئەمریکی بوو بە ناوی هۆبەی چوار، کە بە مەبەستی کردنەوەی دەواجین و دەرزی لێدان لە چێڵ و مەڕ و بزن لە سەرمەیدانی شەقڵاوە بنکەیەکی کردەوە. زۆر لە کادیرانی حزبی شیوعی لەم کۆمپانیە بە فەرمانبەر دامەزران. لە ناویاندا کەسایەتی ڕۆشنبیری شەقڵاوە مەحمود حەمید ئاغا و کۆمەڵێك تێکۆشەری تری حزبی شیوعی کە تازە لە زیندان ئازاد کرابوون، لەو کۆمپانیاکە دەستبەکار بوون.

مەحمود حەمید ئاغا، مرۆڤێکی زۆر بە توانا بوو و هەر زوو فێری زمانی ئینگلیزی بوو. کاربەدەستانی کۆمپانیاکەش زۆر سەرسام بوون بە زیرەکی ئەو مرۆڤە و بریاریان دا بۆ خولی فێربوون ڕەوانەی وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکای بکەن. کە مەحمود لە ئەمریکا گەڕایەوە، بۆی باس دەکردین کە لە

ئەمریکا دەواجینی مریشك و پۆڕ و زۆر لە پەلەوەرەکانی تر هەن، ئێمەش پێمان سەیر بوو!

یەکەم ئەورۆز کە بەڕەسمی لە شەقڵاوە کرابێ لە ناوەڕاستی پەنجایەکان بوو، بەڵام من دڵنیانیم کە ئایا ساڵی ١٩٥٥ یان ١٩٥٦ بوو. جەلالی حاجی ڕەشید بەگ، توانی مۆڵەتی ئاهەنگ گێرانی ئەم ئەورۆزە وەربگرێ. دەهۆڵ و زوڕنای هێنا و ئاهەنگێکی ئەورۆزی زۆر خۆشی لە چایخانەی سیمۆن ڕێکخست و جەماوەرێکی زۆری شەقڵاوە بەشداریان تێداکرد. شایانی باسە جەلالی حاجی ڕەشید بەگ لە ساڵی١٩٧٤، بووبە پارێزگاری هەولێرو و دوای ئەوە بوو بە ڕاوێژکار لە یەکێك لە وەزارەتەکانی بەغدا.

لە ساڵانی جەنگی جیهانی دووەم، ئینگلیز توانی خەلك لە لەشکرێکی تایبەت ناسراو بە "لیڤی" ڕێکبخا. لە شەقڵاوە چەند کەسێك بەشداریان لەو لەشکرە کرد لەوانە: ئەحمد حەمەدئەمین، مرشد مەلا شێخە، ڕەشید و تەها و مستافا بن دیان، خالید حەمەدئەمین، تەها محمود سلیمان، ساڵح قادر خەلیفە، واحد سۆفی ئەحمەد و چەند کەسێکی تر کە بەداخەوە ناوەکانم بیرنەماون. ئەحمد حەمەدئەمین یەکێك بوو لەوانەی کرا بە ئەفسەر و بردرا بۆ دورگەی قوبرس و دواتریش بۆ فەلەستین. قادر شۆڕش، کە لە دوای ١١ی ئازاری ١٩٧٠ بوو بە لێپرسراوی ناوچەی شەقڵاوەی پارتی دیموکراتی کوردستان، بۆی گێڕامەوە کە لەگەڵ ئەحمد حەمەدئەمین و چەند کوردێکی تر، لە ڕۆژی ئەورۆزی ساڵی ١٩٤٨، ئاهەنگێکی قەشەنگی ئەورۆزیان لە دورگەی قوبرس سازکردوە.

دوای شۆڕشەکەی عبدالکریم قاسم لە ساڵی ١٩٥٨، پارتی مۆڵەتی لە حکومەت وەرگرت و بە ڕەسمی دەستی بەکارکرد. بارەگایەکی پارتی و یەکێکی حیزبی شیوعی لە بەرامبەر مزگەوتی گەورە بەلای سەرەوە کرانەوە. هەندێك لەو کەسانەی کە سەرپەرشتی شانە سەرەکیەکانیان دەکردن و لەبیرم ماون: مامۆستا عارف ڕەئوف، بەگۆکە ئەفەندی، ئسماعیل حوسین، ئەحمەد کاوێس، حەمید کاوانی، شاخەوانە ئەفەندی. ئەوانە دەورێکی سەرەکیان بینی و چایخانەی مەحمودی مەلاسەعید بەناوی "خەبات" کرا بە شوێنی کۆبونەوە. ڕۆژانە جەماوەری پارتی لەم چایخانەیە کۆدەبونەوە و باسی کوردایەتی دەکرا.

لە یەکێك لە گۆڤارەکانی "ڕۆژی نوێ"ی ساڵی ١٩٦٠، شیعرێکی جەمال شارباژێڕی بەناوی "کوردم" بڵاوکرایەوە. شیعرەکە ئەوەندە بە تام و چێژ بوو، چەندین جار بەدەنگێکی بەرز بۆخۆم خوێندمەوە. ئەسعەدی کوڕم کە ئەوکات تەنها پێنج ساڵان بوو، هەر بە خوێندنەوەکەی من شیعرەکەی

لەبەرکرد و دەیگوتەوە. هەندێك لە هاورێکانم لە پارتی بەمەیان زانی و ڕۆژانە ئەسعەدیان دەبرد بۆ چایخانەی خەبات و لەسەر مێزێکیان دادەنا و ئەم شیعرەی بۆ دەخوێندنەوە. ئەم شیعرە هەستی نەتەوایەتی لە ناخی دڵی جەماوەری پارتی دەوروژاند، هەر بۆیە ئەسعەد زۆرخۆشەویست بوو لەلایان. لەبەر خۆشی شیعرەکە لێرەدا دەینوسمەوە:

" کوردم "

کوردم، کوردم
ئەوەی مەردم
ئاشتی خوازم
هەر ئاشتیە،
بەستەی سازم وە ئاوازم
من شەڕکەرنیم
جەنگاوەرنیم
ئاشتیم دەوێ
ژینی شادی و خۆشیم دەوێ
بەڵام ئەگەر بکەوێتە لایەنی شەڕ
شەڕکەرێکم شەڕکەر، شەڕکەر
ئەوەی شەڕم پێبفرۆشێ
باش دەینۆشێ
هەر وەکو سەگ دەیگەوزێنم
دەی تەزێنم
ئامبەزێنێ
دەیبەزێنم

من نامەوێ ژێر دەستەبم
دەزگای دەستە بە دەستەبم
ئەوەی هات تێم بسرەوێ
واز ئەهێنێ
ژێر کوتەك و چەپۆکیبم
ملکەچی بم
ئەشڵێم بۆچی وام لێدەکەن؟
بۆ وا بەم دەردەم دەبەن؟
هەرچیم هەیە لێمبسەنێ

واز نەهێنێ
لە دوایی پێم پێبکەنێ
نەء...دوژمن با چاك بزانێ
كە ناتوانێ
چونكە كوردم
نەوەی مەردم

من دەمەوێ بژیم ئازاد
وەکو هەموو ئادەمیزاد
من ژینی سەربەستیم دەوێ
ژینی شادی و خۆشیم دەوێ
بۆ خۆم ئەوێ ووڵاتی خۆم
هەر خۆم بۆ خۆم
ئەو سەروەتەی هەمە دەیخۆم
بەسمە بەس
نایدەم بە کەس
نایخەمە ناو گەرووی ناکەس
پێی دەژیم چاك
بێ پەروا و باك
ووڵاتەکەم دەپارێزم
بەرامبەر بە ئیمپریالیزم
زۆر بەهێزم

من ئەو لاوەم
نەوەی کاوەم
لە نەوەی سەلاحەدینم
بەهێزە ئاین و دینم
هێزی دوژمن
حەدی چیە
کەوا لە من
نزیك وەبێ
لەوانە بێ
کە ناتوانێ
چونکە کوردم
نەوەی مەردم

وەك شێر دڕم
جەرگی دوژمن هەڵئەدڕم
ئەو داربێ
من وەك ئاگرم
گڕ ئەگرم
ئەو ئەگرم
ئەیکوژم بە ئازار و ئێش
ئەیکەم بەچی؟
بە خۆڵەمێش

بۆمبای دەروون ئەتەقێنم
تەختی دوژمن ئەلەقێنم
ئەیڕوخێنم
با بۆ نیشتیمان بخوێنم
سەر و گیانم بۆ ئەو ئەوێ
خۆشم ئەوێ
ئەمەوێ ئاڵام ئەسرەوێ
ووڵاتەکەم دەپارێزم
بەرامبەر بە ئیمپریالیزم
زۆر بەهێزم

لە ساڵی ١٩٥٩ حکومەت ڕێگای ئەقابە دروستکردنیدا، پارتی منی بۆ پۆستی سەرۆکی نیقابەی کرێکارانی شارەوانی شەقڵاوە هەڵبژارد، حیزبی شیوعیش هاوڕێی دڵسۆزم عەوڵای قادر شامی بۆ هەمان پۆست هەڵبژارد. لە هەڵبژاردنەکەدا من دەنگی زیاترم هێنا. تا دەست پێکردنی شۆڕشی ئەیلول لە ساڵی ١٩٦١، من بە سەرۆکی نیقابەی کرێکاران لە شارەوانی شەقڵاوە مامەوە.

لەو ساڵانەدا، بەداخەوە پەیوەندی نێوان لایەنگرانی پارتی و شیوعی لە شەقڵاوە ڕۆژ بەڕۆژ توند تر دەبوو. لە ناو جەماوەری هەر دوو حیزبەکە، خەڵکێك هەبوو کە دووبەرەکی دروست دەکرد. ئەوکات خەڵکێکی زۆر تر پەیوەندیان بە حزبی شیوعی کردبوو. لایەنگرانی ئەم دوو حزبە کەوتنە ملمڵانێ و دوژمنایەتی کردنی یەکتر. ڕۆژێکیان لە بۆنەیەکی نیشتیمانی ویستمان لەگەڵ حیزبی شیوعی بەیەکەوە لەلای گردی زەیتون خۆپیشاندانێك

بکەین، بەڵام حیزبی شیوعی ڕۆژێك دوای ئێمە وە بە جیا خۆپیشاندانیان ئەنجامدا، بۆ ئەوەی بسەلمێنن کە جەماوەرێکی زۆرتریان لە پارتی هەیە. دوای ماوەیەك، خەڵك زۆر زیاتر و بە کۆمەڵ پەیوەندیان بە پارتی دەکرد. هەربۆیە تا هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول، پارتی زیاتر گەشەی کرد و بوو بە حزبی سەرەکی لە شەقڵاوە. کوردایەتی و بێ بەشی میللەتی کورد لە هەبوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆ، حەقیقەتێکی زۆر مەزن و بەرچاو بوو و تا دەهات خەڵك هەستی نەتەوایەتی بەرزتر دەبووەوە.

دوای شۆڕشەکەی عبدالکریم قاسم، شێخ ئەحمەدی بارزان کە پێشتر بۆ خواروی عیراق دوور خرابووەوە، گەڕایەوە کوردستان و لە چایخانەی قادر حەمەدنەمین (ناسراو بە قادرە شێت) لە شەقڵاوە دابەزی و جەماوەرێکی زۆری پارتی لە دەوری کۆبونەوە. حزبی شیوعی ویستی بەرەنگاری ئەم کۆبونەوەیە بکا و چەند لافیتەیەکیان دڕاند، کە یەکێکیان نوسرابوو "شێخ ئەحمەدی بارزانی، خۆشەویستی کوردانی". هەروەها دەمەقاڵێیەکی گەورە لە نێوان هەردوو جەماوەری پارتی و شیوعی دروست بوو و خەریك بوو ببێ بە شەڕێکی قورس. کەسێك لەناو جەماوەری حزبی شیوعی هەندێك هوتافی نابەجێی گووتن، بەڵام عەونی یوسف کە لەگەڵ شێخ ئەحمەدی بارزان بوو، بەرێك و پێکی وەڵامی دایەوە و نەیهێشت گرژیەکە تەشەنەبکا.



شێخ ئەحمەدی
بارزان و
یاوەرەکانی

لە ساڵی ١٩٥٩ پارتی لە ڕەواندز زۆر کز و لاواز بوو. حزبی شیوعی توانیبوی دەست بەسەر بازاڕ دابگرێ و ترس و دڵەڕاوکێ لە نێو ئەندامانی پارتی لە ڕەواندز دروست بکا. یەکێك لەو هوتافانەی کە حزبی شیوعی لە ڕەواندز بەرزی کردبووەوە دەیووت "ئێمە شوعي کانی قورین، زگی پارتیان هەڵدەدڕین".



ڕەواندز
سەرەتای ساڵانی
١٩٣٠

ئەوکات لێپرسراوی پارتی لە ڕەواندز، دکتۆر ئەسعەد خەیلانی بوو و لەگەڵ ئەحمەد حەمەدئەمین قادر گچکە کە لێپرسراوی دارستان بوو و ئەندامێکی کارای پارتی بوو لەوێ، بە مەبەستی بەرزکردنەوەی ورەی ئەندامانی پارتی لە ڕەواندز، داوایان لە ناوچەی پارتی شەقڵاوە کرد کە سەردانێکی جەماوەری بۆ ڕەواندز ڕێکبخەین. هەر بۆیە حەفتا تا هەشتا کەسێکی پارتی لە شەقڵاوە ڕێکەوتین و چوار تا پێنج ئۆتومۆبیل لەگەڵ لۆریەك و پاسێکمان بەکرێ گرت و بەرەو ڕەواندوز کەوتینە ڕێ. لە ڕێگا و لەکاتی تێپەڕبونمان بە ناو حەریر و خەلیفان، دەستمان دەکرد بە هوتاف لێدان تا خەڵکی بزانن کە پارتی جەماوەرێکی زۆری هەیە و لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر پشتگیری یەکتر دەکەن. لەوانەی لەبیرم ماون کە لەم سەردانە جەماوەریە بەشداربوون: ئیسماعیل حوسێن، واحد ئەفەندی، بەگۆکە ئەفەندی، مەدێ ئەفەندی، ئەحمەد کاوێس، قادر حەسەن، سەید تالیب، سەید موستەفا و چەندین کەسی تر کە بەداخەوە ناوی هەمویانم بیر نەماوە. هەر بە گەیشتنیشمان بۆ ڕەواندز، بە ناو شار تێپەڕین و لەبەردەم بارەگای پارتی کۆبوینەوە و جەماوەری پارتی ئەوێ پێشوازیەکی گەرمیان لێ کردین. ئەم هەوڵەی پشتگیری کردنی پارتی لە ڕەواندز شوێنی خۆی گرت و بووە هۆی گەشەکردنی پارتی لەوێ.

هەر لەو بۆنەیەدا و لە بازاری ڕەواندز، ناسیاوێکی خۆم بینی و چاك و چۆنیمان لەیەك کرد. ئەو برادەرە زۆری پێ ناخۆش بوو کە ئێمە سەردانی پارتیمان لەوێ کردوە، چونکە ببوو بە شیوعی و دەیگوت "من لە حزبی پێغەمبەرم"! کابرا پێشتر دەروێشی ماڵی کاکی هیران بوو و لە شەقڵاوە دەژیا، دوایی گەڕابووەوە ڕەواندز و لەوێ ببوە سەرپەرشتیاری کرێکارانی شارەوانی. ئەم کابرایە هەرچەندە کۆنە دەروێش بوو، بەڵام ببوە شیوعی. سەیر لەوەدابوو

کۆنە دەرویشێك ببێتە شیوعی و بڵێ من لە حزبی پێغەمبەرم، ئەم دوو شتە کوجا مەرحەبا!

پاش ئەوەی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم لە بەڵێنەکانی بۆ میللەتی کورد پەشیمان بووەوە، نازدیەکان کەمبونەوە و ئەگەری هەڵگیرسانی شۆڕش دەستیپێکرد. حاجی ناسر، دۆستێکی نزیکی من و باوکم بوو. زۆر جار کە لە بەیاری قەشان دەهاتمەوە، باوکم دەیگووت بەر لەوەی ترێیەکە بهێنیەوە، بەشی ئەوی لێبدە. چەند ساڵێك بوو خەڵکی زۆر بە پەرۆشەوە کوردایەتیان دەکرد و بە هەموو شێوەیەك هەوڵدەدرا شۆڕش سەربکەوێ. حاجی ناسریش خۆی و کوڕەکانی بە دڵ گەرمیەوە بەشداربوون. لەو سەروبەرەدا، مام ناسر بە مەبەستی سەردانی خزمەکانی لە ناوچەی سورچی دەگەڕایەوە، بەڵام بەداخەوە لە نزیك پردی نارداش لە خواروی دەربەندی شەقڵاوە بە دەستی چەند کورد نەویستێك شەهیدکرا. ئەوکات ڕۆژگارەکان زۆر تەنگبوون، تەنانەت کەس نەدەوێرا لاشەکەشی بنێژێ. من بە سودفە لە ڕگای بەیاری قەشان دەهاتمەوە و چاوم بە لاشەکەی کەوت. هەر بە پەلە چووم بۆ دانیرەی غابات کە لە موهەندیس خانەبوو و داوام لە ئەحمەد حەمەدئەمینی هاوڕێم کرد کە هەندێك کرێکار و کەلوپەل بنێرێ، ئەویش زۆر مەردانە بە هانامان هات و ئەوەبوو لە گۆڕستانی شێخ گوڵێ بە خاك سپێردرا.

ڕۆژ دوای ڕۆژ دۆخەکان توندتر دەبوون و هەم ئەوانەی لە ڕیزی پێشەوەی پارتی بوون کەوتنە خۆ بۆ پەیوەندیکردن بە شۆڕش، وە هەم حکومەت بڕیاری گرتنی هەندێکیانی دەرکرد و هەندێکیشیانی خستە ژێر چاودێری. مامۆستا ئیسماعیل حوسێن و مەلا محەمەد بەیەکەوە لە ڕۆژی ١٩٦١/٨/٢٨ بەرەو شاخ ڕۆیشتن وە هەردووکیان بڕیاری گرتنیان دەرچوو بوو. حەسەن ئەحمەد هۆری و ئەحمەد سەلیم گردە لە هاوینە هەواری سەلاحەدینەوە بەڕێکەوتن کە ئەوکات لەوێ کاریان دەکرد. شێخ محەمەد وسو کامەلا و عومەری برازاشی لە هەولێرەوە پەیوەندیان کردبوو بە شاخ.

من لە ڕێگای خزمێکی خۆمەوە کە عەریفێکی پۆلیس بوو، هەواڵم پێگەیشت کە من و چەند هاوڕێیەکی تر لە ژێر چاودێری حکومەتداین و لەوانەیە بەم زووانە بگیرێین. پەیوەندیم بەهەندێك لەو برادەرانە کرد و ڕامسپاردن کە ئاگاداری ئەوانی تر بکەنەوە. من و ئەو برادەرانە پەیوەندیمان بە مامۆستا ئیسماعیل حوسێن کرد کە ئێمە چی بکەین باشە. هەرچەندە ئەو هاتی ئێمەی دەدا کە لە ناو شار بمێنینەوە، بەڵام من و حەوت کەس لەو برادەرانە بڕیاری خۆماندا کە ببین بە پێشمەرگە. هەندێك لەو برادەرانە چەکیان هەبوو، بەڵام من بەر لەو

ڕۆژە بیرم لە چەك نەكردبوەوە. هەربۆیە هەوڵمدا چەكێك پەیدابكەم. محەمەد ساڵح كامەلای زاوام پیاوێكی زۆر شۆڕشگێر بوو، چەكێكی هەبوو و بەڵێنی پێدام كە چەكەكەم پێبدا. ماڵی ئەو لە پشت قشڵەبوو و ماڵی منیش لەناو باخچان بوو، بەڵام چونكە من لە ژێر چاودێری دابووم، كارێكی ئاسان نەبوو كە بە ڕۆژ چەكەكە بێنم. ناچار خەدیجەی خێزانی خۆم ڕاسپارد كە بەیانی زوو و لە ڕۆژی نۆی ئەیلول بچێتە ماڵی ئەوان و چەكەكە بێنێ. ئەو ڕۆژە من لەگەڵ هەندێك لەو برادەرانە خەریكی ڕا و تەگبیر بووین و خێزانیشم هەر چوار كوڕەكەمانی لە ماڵ بەجێ هێشتبوو تا چەكەكە بێنێ. محەمەد ساڵح و حەلیمەی خوشكم چەكەكەیان بۆ ئامادە كردبوو و ئەویش لە ژێرعەباكەی شاردبوەوە. خێزانم هێشتا ترسی ئەوەی هەبووە كە خەڵك پێی بزانێ، بۆیە بەو كۆڵانە تەنگەی سەرووی ماڵی ئەوان هاتبوە پشت قشڵە و بەناو ئەو باخەی پێیان دەگوت "بەرتاوكان" هاتبوە ئەو شوێنەی كە ئێستا مزگەوتی خانەقای لێیە. لەوێشەوە بە كۆڵانی كانی عەمەر بەگ هاتبوە لای كۆنە ئاش. ئیتر لەوێوە دەبوە چۆڵی و ترسی نەمابوو و جادە و جادە هەتا ماڵەوە هاتبوو. ئەوكات پایز بوو و كەم كەس خانوی لەناو باخان دوروست كردبوو.

بڕیارماندا بۆ شەو لە ماڵی من كۆببینە و دوا بڕیاری خۆمان لەو بارەیەوە بدەین. دوای حەوتی شەو حەمید قەساب، قادر حەسەن، ئەحمەد زەخۆك، عەبدوڵا عەزیز تریانكەری كوڕی خاڵم، حاجی خدر كامەلای زاوام، عەبدوڵا حاجی مستەفا، ئبراهیم حەسەن بەگ ناسراو بە برایمە خڕە و حاجی كوڕی حاجی حەسەن هاتن بۆ ماڵی من لە ڕەزی بەردی و هەتا سەعات دوازدەی شەو بیروڕاكانمان ئاڵوگۆڕ كردن. دوا بڕیار گەیشتینە ئەو ڕێكەوتنەی كە هەر ئەو شەوە بەرەو گوندی چنێران بكەوینە ڕێ، چونكە ئەگەر بمابایناوە دەگیراین و ڕەوانەی گرتوخانەی نوگرە سەلمان دەكراین. دوای ماوەیەك گەیشتینە گوندی چنێران و لەوێش لەگەڵ مامۆستا ئیسماعیل حوسێن و برادەرانی تر یەكترمان گرتەوە. لە ڕۆژی دەی ئەیلولی ١٩٦١ و یەك ڕۆژ بەر لەوەی شۆڕشی ئەیلول دەستپێبكا، بووین بە پێشمەرگە.

# بیرەوەریەکانی سەردەمی پێشمەرگایەتیم

هەروەك لە بەشی پێشتر باسم کرد، لە شەوی ٩/١٠ی ئەیلولی ١٩٦١، من و چەند هاورێیەکی خەڵکی شەقڵاوە بەرەو گوندی چنێران بەڕێکەوتین و پەیوەندیمان بە شۆرشکرد. ئەوکات شەر دەستی پێنەکردبوو، بەڵام کۆمەڵێك خەڵك و هەندێك پۆلیسی ناسراو پەیوەندیان بە شۆرش کردبوو. پاشان هەندێك لەو پۆلیسانە بوون بە فەرماندەی قارەمان و بەناوبانگی شۆڕش. بۆ ڕۆژی دواتر، نزیکەی ٥٠ کەسێك لەوێ کۆبوینەوە.



قادری گوزێ چیای
سەفین ١٩٦١

لە ڕۆژی ١١ی ئەیلول، پارێزگاری هەولێر بەدرەدین عەلی، لە چیای سەفین هێرشی هێنا. کە شەڕ دەستی پێکرد، پێشمەرگە لە لوتکەکانی چیای سەفین نەبوو، بەڵام لەسەر تیشی چنێران و بەدرێژایی تیشەکە، سەنگەرمان دامەزراندبوون. من، ئیسماعیل ئەفەندی، قادر حەسەن، حەمید قەساب و برایمەخرە بەیەکەوە لە سەنگەرێك بووین. من تفەنگێکی چیکیم پێ بوو کە فیشەکی بچوکی دەخوارد و زۆر دور نەدەڕۆیشت. چیلە بەردێکیشمان لە سەر جادە دروست کردبوو، وامان دەزانی ئەگەر دەبابە هات، ناتوانێ بەسەر ئەو بەردانە بکەوێ! ئینجا دەچین بە خەنجەران سەربازەکان دەکوژین. کەس لە ئێمە شەڕی نەبینیبوو و زۆر سادەبووین. ئەمان دەزانی کە شەڕ کارێکی ئەوەندە ئاسان نیە. هەرچەندە تێگەیشتنمان لە شەڕ کەمبوو، بەڵام زۆر فیداکار و جەرگسوز بووین. من خێزانم و چوار منداڵم بەجێ هێشتبوو، بێ ئەوەی هیچ سەرچاوەکی گوزەرانی ژیانیان هەبێ. کوڕە گەورەکەم نۆ ساڵان و

بچوکەکەشیان منداڵێکی ساوابوو. باوکیشم تەمەنی گەورەبوو وە براکانیشم بچوکبوون. بەڵام کوردایەتی ئەوەندە خۆشەویست بوو لەلای ئێمە، نە ماڵ و نە گیان لە بەرامبەر کوردایەتی بەهایەکی ئەوتۆیان نەبوو.



خەدیجەی خێزانم و هەر چوار کوڕەکەم محەمەد، ئەسعەد، هونەر و بەختیار ١٩٦١/٧
وێنەگر: عومەر گوزێ

## یەکەم هێرشی دوژمن

حکومەت بە تەقەیەکی یەکجار زۆر لە سەفین هاتەپێشەوە. بە هاوەنی عوقدە سێ و بە ڕەشاش، بەشێکی سەفینیان هەتا کەپکی کایسای گرت. سەعید شێخۆی ناقوبانی، بەخۆیی و دەستەیەك لە پێشمەرگە، چوون بۆ کانیاوی زیزنێ. کەپکی زیزنییان کۆنترۆلکرد و بەریان لە دوژمن گرت. ناچار جاشەکان پاشەکشەیان لە شاخی سەفین کرد. بۆ ڕۆژی دووەم، لە تیشی میراوە هێرشیان هێنا و قوپی سوریان گرت. ئەوکات سەرباز لەگەڵ هێزەکەدا نەبوون، تەنها جاش و پۆلیس بوون، کە پۆلیسی قوەی سەیاریان پێ دەگووتن. دوای ئەوەی قوپی سوریان گرت، گوندی لاسێیان بە هاوەن تۆپ باران کرد و ژنێك و دوو منداڵ شەهید بوون. خەڵك تۆپبارانی نەدیبوو وە ئەو تۆپبارانە کاریگەری لەسەر خەڵکی ناوچەکە دروست کرد. سەعید مەسیفی کۆمەڵێك پێشمەرگەی برد و ئەو ڕۆژە تا ئێوارە شەڕێکی سەخت کرا.

ئێمە نزیکەی ٦٠ـ٧٠ کەسێ دەبووین و کە ئێوارە هەمووومان لە تیشی چنێران یەکترمان گرتەوە. هەندێکمان دوو یان سێ فیشەك، هەندێکیش بەپاکەت فیشەکیان پێمابوو. هەندێك پێشمەرگە دەیانووت فیشەکمان دەوێ، نان و ناومان دەوێ و گلەییان دەکرد. هێشتا کاروبارەکان ڕێك نەکەوتبوون، هیچ تەنزیمێك نەبوو و شۆڕش پێداویستیەکانی پێشمەرگەی پێ دابین نەدەکرا.

بۆ بەیانی، جاشەکان زۆرتر هاتنە پێش و ئەوەندە نزیك بوون کە مەترسی هەبوو پشتمان لێبگرن. ناچار ئێمە لە تیشی چنێران کشاینەوە و چووینە ئەشکەوتی دەرەکە لە چیای سەفین. سێ تا چوار رۆژی تری پێچوو، دوبارە دوژمن هاتەوە پێش و ویستیان پشتمان بگرن. بەڵام پاشەکشەمان کرد و هەرلە چیای سەفین، چووینە کانی شیلان. چوار پێنج کۆڵێتی ڕەزەوانان لەسەر کانی شیلان هەبوون، هەمووی حەوشە بوون و بە تولە مێوان سەریان گیرابوو. ئێمە خەڵکێکی زۆرمان گرتبوو کە یان جاش بوون و لەو یەك دوو شەڕە گیرابوون، یان خۆیان بۆ جاشایەتی ناونوس کردبوو، یان بۆ کاری سیخوڕی پەیوەندیان بە میری کردبوو، هەندێکیشیان هەر بە هەڵە گیرابوون. ئەوانە هەموویان لەوێ داندران. دوو کەسی خەڵکی شەقڵاوەش لەوێ بوون، بەناوەکانی یونس و ساڵح، بەڵام ئێمە کەفالەتمان کردن و پێمان ووتن کە ئەتوانن بچنەوەماڵەوە. ووتیان ئێمە ناگەڕێینەوە و لەگەڵ ئێوە دەبین بە پێشمەرگە! جگە لە شەڕ و نۆبەتگرتن، دەبوایە نان و ناوی خواردنەوەش بۆ ئەو پێشمەرگانە دابین بکرێ کە لەسەر سەفین لە کەپکی زاوا و بوکان و دەوروبەری کەپکی شیلان هەتا نزیك کانی گوێز بوون. ئەوکات ناو بەکوندە و هەر جارەی بۆ دەستەیەك دەهات.

جاشەکان گەیشتبوونە گوندی ناقوبان و سوتاندبوویان، من و شەمسەدین موفتی و عەبدە بەنای کۆیی، کە پیاوێکی بەتەمەن بوو، لەبن تاوێرە بەردێك دانیشتبووین. شەمسەدین موفتی پارێزەر بوو، پیاوەکی زۆر تێگەیشتو بوو، وە ئەوکات بەرپرسی ئیداری سەرکردایەتی بوو. زۆر بە غەمباری ووتی "بەخوای پێویستە بچم بەرەنگاری ئەو جاشانە بم، تەنها دوو ڕستەم لەسەر بنوسن کیفایەتە". دانیشتن لەگەڵی زۆر خۆش بوو، بەڵام شەڕ سەختە و ئەویش زیاتر پیاوێکی ئیداری بوو.

کە هێزی جاشان گوندی ناقوبانیان گرت و سوتاندیان، بەری لای ئەسپینداره و کەوەرتیان و بەرەکە کەوتە ژێر کۆنترۆلی جاشەکان. شوێنی ئێمە بەرز بوو و تەیارەش هەموو ڕۆژی دەهات تاکو دەگەیشتە هیران، لەم دۆڵە جادە و جادە نزم دەفڕی، بەڵام تەقەی نەدەکرد. ئەمانە تەیارەی کۆنی ئینگلیزی بوون. لەو بەینە، جاش لە دەربەندی گۆمەسپانیش هێرشی هێنابوو وە حکومەت بەتەیارە شاخەکانی ئەو ناوی بۆمباران کردبوو. کاتێك ئێمە لە چیا لە بەرامبەر چنێران کشاینەوە، پێشمەرگە لە دەربەندی گۆمەسپان شکابوون. مام شێمحەمەدی وسو کامەلا، کە لە بەری دەربەندی گۆمەسپان بوو ووتی، "تەیارە کەلکی بڕی و کەس خۆی ڕانەگرت". هێزەکە هەمووی هاتە دیوی ئێمە. دواتر حکومەت تیشی کێشکە و ئەو ناوەی گرت و گوندی خۆران و زیارەت کەوتنە نێوان پێشمەرگە و حکومەت. جاش لە ئەسپینداره هاتنە پێش بۆ گوندی پونگینە و

ویستیان پونگینە بگرن، بەڵام بەرگریەکی چاك كرا و جاشەكان نەیانتوانی بێنەپێش. دەرویشێکی ماڵی کاکی هیران هەبوو، ناوی دیوانە حەمەدنەمین کاخۆر بوو. کاخۆریان پێ دەووت، لەبەر ئەوەی زۆرجار کە حاڵی دەگرت، کای دەخوارد. چونکە دەرویش بوو، گەلێك جار تفەنگی لە خۆیدەدا و هیچی لێنەدەهات. کەچی بەداخەوە ئەو ڕۆژە بە گولەی جاشەکان شەهیدکرا. ئەگەر جاش زیاتر هاتبانە پێش و کەرکی گەرۆتەیان بگرتبا، ئەوا ئێمە ڕێگەی نان و ناومان لێ دەبڕدرا.

ئەمری پاشەکشە بۆ ئێمە هات و ووتیان سەفین تا سەر شەقڵاوە گیراوە. ئێمەش بەسەر کەرکی گەرۆتە کەوتین تا گەیشتینە کانی سمایلان کە دەکەوێتە پشت هیران. بۆ ئێوارە بەرێ کەوتین بۆ ناوچەی گوندی کونەفلوسە و بەو شەوە تاریکە چووینە چیای ئەوبەر بۆ گەلی بەردەکەرێ. کە گەیشتینە ئەوێ، بەرەو بەیان بوو. ئەو ڕۆژە ئێمە لە گەلی بەردەکەرێ ماینەوە. هەندێ لە پێشمەرگەکان لایاندابوو بۆ کونەفلوسە و چەك کرابوون. ڕۆژی دواتر بوو بە تەقەیەکی زۆر. هەندێك کەس گیران و ئەو تفەنگانەی لە پێشمەرگەکانیان بردبوون، وەرگیرانەوە و هەندێکیش لە جاشەکان هەڵاتن. بەندەکانیان هێنانە لای ئێمە و دواتر بە گەلیەکە بەرێکەوتین بەرەو گوندی ڕفتێ. ئەو گەلیەی پێیدا ڕۆیشتین، یەکجار خۆشبوو. هەر دوو لای گەلیەکە بەیار و داری باوی بوون. مشتاغیش کرابوون و تۆزێك ترێ مابوو.



ڕیزی دواوە لە ڕاستەوە: حەمید قەساب، نەناسراو، قادر گۆزێ، ئەحمەد زەخۆك، ئەوانیتر نەناسراون.

پێدەچێ کانی ڕفتێ گوندێکی زۆر کۆن بێ و کانیاوێکیشی لێیە. ناوی گوندەکە هەر لە سروشتی شاخەکانی هاتووە، چونکە شاخەکانی دەورەی هەر لەخۆوە دانەڕمێن و هەمووی بەردی تەنکی لەسەر یەکترن و خۆڵی کەم تێدایە.

هەرچوار دەوری کانی ڕفتی گۆڕاییە وە دارەبەنی زۆر زۆر گەورەی لێبوون. ئێمە داری واگەورەمان نەدیبوو! من و ئیسماعیل ئەفەندی دارەکەمان بە بست پێوا، وابزانم ٣٥ بست بوو. هەرچوار دەورەی دارەکانیان بریندارکردبوون، کۆجیلەی بەقوڕیان لێکردبوون وە بنێشتەتاڵیان لێ کۆدەکردنەوە. کابرایەکم بینی سەتلێك و کەوچکێکی ناسن و هەندێ ڕۆنی پێبوو. لە نزیکەوە تەماشام دەکرد، کەوچکە ئاسنەکەی لە ناو ڕۆن هەڵدەهێنا و بنێشتە تاڵەکەی لەناو کۆجیلەیەکیان دەردەهێنا. چواردەورەی خاوێن دەکردەوە، چونکە پوش و شتی تری تێدابوو. لێم پرسی وتم چی لەو بنێشتە دەکەی؟ ووتی ئەیکەینە بنێشتی کوردی و چۆنیەتی دروستکردنی بۆ باسکردم. ئەو ووتی کە هەرسێ ڕۆژ جارێك بنێشتە تاڵەکەی هەڵدەگرنەوە. سەرەتا، ئەو بنێشتە گەرم دەکەن و خاوو دەبێتەوە و وەك ئاوی لێدێ. ئینجا دەیکەنە مەنجەڵێکی ئاوی کوڵاو، تاکو پووش و هەر پیساییەك هەبێ، سەر ئاو بکەوێ. بنێشتەکەش دەکەوێتە بنی مەنجەڵەکە. دوای ئەوە دەیکەنە ناو کیسە خامێك و دەیشێلن. دەبێ بە بنێشت و قالبی لێدروست دەکەن.

سەردوڵ، کە لە ڕفتی نزیکە، جێگایەکی زۆر خۆشە. من نەچومەتە ئەو شوێنە، بەڵام لەوێ باسیان دەکرد کە ناوچەیێکی کەم ئاوە، بەتایبەتی لە هاوین. دەڵێن "ئەگەر منداڵ شەو بۆ ئاو بگری، ئاو نیە بیدەن بە منداڵەکە". لەبەر بێ ئاوی، لە هاوین مەڕ و ماڵاتی خۆیان دەنێرنە گوندەکانی نێوێ، چیوە و ئەو گوندانەی تری دۆڵی بالیسان.

چەند ڕۆژێك لە دێی ڕفتی ماینەوە. پاشان لە چیاکەی پشتی، کە پێیدەڵێن هەورێ، سەرکەوتین. ئەو چیایە، بەیار و ڕەزی دێمەکاری زۆرن و بەیارەکانیش زۆر بە بەربوون. کۆڵیتی ڕەزەوانانی لێبوون کە بە تولە مێو سەریان گریرابوو. دیوارەکانیش هەرووشکە بەرد بوون و لەسەر یەك دانرابوون. ئەم شوێنە بەرازی یەکجار زۆر بوو. بۆیە، هەر بەیارەو چەند تەنەکە بەردێکی لەناو هەڵواسرابوون، بۆ ئەوەی لەگەڵ با بجوڵێن و بەرازەکان لە دەنگەکەی بترسێن. خەڵکی ئەو ناوە دەیانووت لەو شوێنە بەراز بەڕەوە دەبینرێ، چونکە داری بەرووی زۆر لێیە و بەرازیش حەزی لێدەکا.

ماوەی چەند ڕۆژێك لەو شوێنە ماینەوە. ئەوەبوو شەڕ لە بالیسان دەستی پێکرد. ئێمە دابەزین بۆ سەر ئەو کانیاوەی کە لە پشت گوندی دەراشە و شەڕەکە لە ئێمە دیاربوو. پێشمەرگە داوای لە جاشەکانی ئەو هەشت ڕەبایەی کە لەپشت بالیسان بوون کردبوو کە خۆبەدەستەوە بدەن، بەڵام ئەوان

ڕەتیانکردبووەوە. چوار تا پێنج جاش لەگەڵ ئافرەتێك کە ناوی بۆ دەبردن کوژران. بەداخەوە پێشمەرگەیەکیش بە ناوی ساڵح لەو شەڕە شەهید بوو.

بە شەو جاشەکان دزەیان کردبوو و هاتبونە سەری هەورێ. بۆ بەیانی زوو، بەشێکمان لەگەڵ مەلا عەوڵا، ناسراو بە مەلا ماتۆڕ، و میرانی ساڵح بەگ چوونە سەری هەوری و تا نیوەڕۆ شەڕ هەرگەرم بوو. هەرچەندە هەندێ پێشمەرگە پاشەکشەیان کرد و شوێنی خۆیان بەجێ هێشت. عەزیز، کە پێشمەرگەبوو لەگەڵ ئێمە، زۆر هاواریکرد خۆتان بگرنەوە، خۆتان بگرنەوە، بەڵام کاری نەکرد. بۆ ئێوارە بە کۆمەڵێك دیلەوە بەرەو گوندی شێخ وەسان ڕۆیشتین. سەرەڕای ئەو ماندوبوونە، خەڵکی شێخ وەسان هەموو هاتنە سەرڕێ و ڕێگایان لێگرتین، ووتیان نابێ لێرە تێپەڕن، با شەڕ نەکەوێتە ناوچەی ئێمە. ئیتر دڵمان نەشکاندن و ڕوومان کردە دەرەشێر و بەسەرکەوتین. دەرەشێر ڕێگایەکی یەکجار عاسێیە، لەو شاخە تەلانە ڕێگەیان دروست کردبوو. لە هەندێ شوێن داریان دانابوون و چیلە بەردیان لەسەر دروست کردبوون. ڕێگایەکی یەکجار سەخت بوو. ئێمە برسی و تینوبووین و حاڵیشمان زۆر شڕبوو، بەڵام بە هەر جۆرێك بێ سەکەوتین.

ڕۆژی دوایی بۆ بەیانیەکەی، گەیشتینە کانیێ باراوایێ، کە شوێنی خێڵەساتی گوندی مەلەکان بوو. ڕەشماڵ لە سەر ئاو هەڵدرابوون و جیگایەکی زۆر خۆشە و ئاوەکەی زۆرساردە. مەلەکیەکان هاتنە لامان و باسیان کرد کە چۆن لە رواندز خەبەریان بۆ هاتوە و داوایان لەوان و لە گەرەوەییەکان کردوە کە بێن بە جاش و چەك هەڵگرن. مەحمود کاوانی زۆر لێیان قەڵس بوو ووتی، "شەرم ناکەن، ناتوێنەوە، چەکتان بە ئێمە هەڵگرت و شەڕتان بە ئێمە دەستپێکرد. ئێستاش ئێمە لێمان قەوماوە، ئێوەش پشتتان لە ئێمەکردووە". زۆر هاواری لەسەرکردن و ئەوانیش بە پەشیمانی گەڕانەوە دێ. دوای چەند کاتژمێرێك هاتنەوە و هەریەکەو مەنجەڵێك ساوار و نانیان هێنا.

دوو ڕۆژ دوای ئەوە، من پێشنیارم کرد کە کۆبونەوەیەك دەربارەی بەندکراوەکان بکەین و بەڵکو ئازادیانبکەین. ئێمە ١٥ ـ ٢٠ پێشمەرگە دەبووین، لەوانەی بیرم ماون، قادرحەسەن، عەبدوڵا عەزیز، حەمید قەساب، برایمە خڕە، مام تەها ڕەش، ئیسماعیل ئەفەندی، مەحمود و حەمید کاوانی... ووتم ئێمە خۆمان لە برسان خەریکە ئەمرین و بەلایەنی کەم یەك ملیۆن کەسمان دوژمنە، با ئەو بیست کەسەش لەگەڵ ئەوملیۆنە بێ. ئینجا باسەکەمان لەگەڵ مەلا عەوڵا کردەوە. ئەویش پێی باشبوو و بڕیاریدا ئازادیان بکەین. بەندەکانمان کۆکردنەوە و پێمان گوتن، ئێمە ئازادتان دەکەین، ئێوەش خۆتان و شیری

خۆتان. خیانەت مەکەن، کوردایەتی بکەن، دوور و نزیك، ئێمە هەر سەردەکەوین. یەکێك لە بەندکراوەکان، هەردەم خۆی دەشەلاند و ئێمەش زۆر هاوکاریماندەکرد، بەڵام کە ئازادکرا، وەك کەروێشك لە پێش هەموویان بەسەر چیا کەوت. ئێمەش زۆر پێکەنین.



مامۆستا ئیسماعیل حوسێن
لە ئەرشیڤی خۆی وەرگیراوە

رۆژی دواتر رۆیشتین بۆ کوێستانەکانی سایە و سیوۆکان و هەرتەل و شیری، کە کوێستانی زۆر خۆشن. شێخ سەمەدی سەران گەورەی ئەوناوە بوو، گوندەکی بچکۆلەی لێبوو و کە ئێمە چووین، سێ ماڵی لێ مابوون. سەرەتای مانگی دە بوو، بەڵام ئەوناوە زۆر سارد بوو. سێ چوار رۆژ لەوێ ماینەوە، ماڵەکانیش کەم دەرامەت بوون و نانی پێشمەرگەیان پێنەدەدرا. ئێمەش لە برسیەتی، زۆر بێهێز ببووین. حەمید کاوانی گیسکێك و پەنجا نانی لە ماڵەکان کری.

کەشەکە گۆرا و باران دەستی پێکرد. ئێمەش هەندێ ناردمان بۆ هات، بەڵام هیچمان نەبوو نانی پێبکەین. تەنکە بەردێکی تەمۆخمان دوو کاتژمێر لەسەر ئاگردانا، بۆ ئەوەی نانی لەسەربکەین. بەڵام سودی نەبوو و هەویرەکە بە بەردەکە دەنوسا و نەدەبوو بە نان، بارانیش هەر بەردەوام بوو. حەمید قەساب کاتی خۆی فرنی نانی هەبوو و شارەزابوو، لەبەر باران بە چوارکەس بەتانیەکمان هەڵدابوو و ئەویش شتێکی پێکهێنا و هەندێك نانمان کرد. هەمووومان لە برسان کەوتبووین، بەڵام ئەوەی زۆر خەممان بوو، عەبدوڵا عەزیزی کوری خاڵم بوو. هەرچەندە وورە بەرز بوو، بەڵام ئەوکات گەنجێکی زۆر خوێن گەرم و ئازا بوو و لە هەمووومان بچوکتربوو، زۆریش خۆشەویست بوو.

خەبەرمان بۆ هات کە جاش لە سەری کەپرە و ناراسن هەن، بۆیە بۆ دۆڵی شاوڕێ ڕۆشتین و بارانیش دەباری. بەرەو پڵینگان کەوتینە ڕێ و لەبەر باران پێشخۆمان نەدەدی. ڕووناکیەك بەدیارکەوت، کە چووین ناشێك لەوبەری ڕووبار بوو. بە ناو ڕووبار کەوتین و پەڕینەوە، ئەوەندەیتریش تەڕبووین. پرسیارمان لە ناشەوان کرد کە پڵینگان لە کوێیە. ئەویش ووتی لەگەڵ ناو بڕۆن و دەیگەنێ. کە گەیشتین، چووینە ماڵی مەلا برایم پڵینگانی، بەڵام ماڵی پڕ ببوو لە پێشمەرگە و خەڵکی گوند. لەبەر دوکەڵی جگەرە، خەڵکت نەدەدی. ئەشکەوتێکیان بۆ ئێمە دیاریکرد و کاتژمێر دەی شەو بەرەو ئەشکەوت بەڕێکەوتین. هەرئەو ئەشکەوتە ئاژەڵی گوندەکەشی تێدابوو و بەو سەرما و تەڕیە لەوێ ماینەوە.

عەباس ئاغا بەخۆی و بە کوڕێکی سەردانیکردین. مەلا عەوڵا تفەنگێکی پەڕەشوتی بە دیاری دایە کوڕەکەی و ئەویش گڵتیدا دوو عەربە گەنممان بداتێ. نزیکەی مانگێك لەو ئەشکەوتە ماینەوە و بڕێك ماندوبوونمان سایەوە. سەردانی دۆڵە رەقە و شوێنی ترمانکرد. پێشمەرگە کەمینێکی لە زینەتیر دانابوو، کە گوایا حکومەت لەوێ تەقەدوم دەکا، کەچی لە سەری هەورێی هاتبووەپێش. بەڵام ١٥ ووڵاغی جاشەکان کەوتبوونە کەمین، ئێمەش ووڵاغێکمان بۆ هات.

## پاراستنی بێتواتە

پاش بارانەکان، پەرە کەوت و ئێمە فەرمانمان بۆهات کە لەوێ بڕۆین. بەسەر چیای ماکۆك سەرکەوتین و گۆڕاییەکی زۆر خۆشبوو و داری زۆر گەورەی لێبوون. پێم سەیر بوو کە ئەوشوێنە ناکەن بە بەیار! بەڵام گوندەکانی ئەو ناوە، وەکو ئەندێك و ئەنگۆر و نامانج، ژیانیان تەنها لەسەر مەڕ و ماڵاتە. ئێوارە دابەزین بۆ دێی ئەنگۆز و لەسەر بانی مزگەوت خڕبووینەوە. خەڵکەکە لە مزگەوت هاتەدەرەوە و هەریەکەو دوو سێ پێشمەرگەی لەگەڵ خۆی بردنەوە ماڵ. تەنها من و حەمید قەساب ماینەوە، کە زۆر هاوڕێ بووین و هیچ کات بێی یەکتر نەبووین. مەلا هاتەدەر و گوتی ئێوەش لەگەڵ من وەرن. چووینە ماڵی مەلا، جێگایەکی خۆش و ڕێکی هەبوو. دەستە جگەرمیەکی بۆنداری لە پێش دانان و منیش زۆر حەزم لە جگەرەی بۆنداربوو. چوار مانگیش دەبوو چێشتێکی گەرممان نەخواردبوو. کەشکەك (گەنمە کوتا) و چەلاوی مریشکیان لە پێش دانان. من لە ماڵی خۆم کەشکەکم نەدەخوارد، بەڵام ئەو ڕۆژە لە

هەموو چێشتێکم پێخۆشتر بوو. زۆر قسە و باسمان لەگەڵ مەلا کردن. پاشان مەلا پرسیاریکرد خەڵکی کوێن، گووتمان شەقڵاوەیین. مەلا گووتی، جارێك من و هاوڕێیەکم ڕێمان کەوتە شەقڵاوە و لە پێش ماڵی کابرایەکی تێپەڕ بووین. کابرا زۆر داوایکرد میوانبین و ئێمەش نانمان خواردبوو، بەڵام میوەیەکی زۆری لەپێش دانایین. منیش گوتم، مامۆستا، ئەوە تۆ بووی لەگەڵ مەلا محەمەدی بالیسانی، کە هەنار و هەرمێ و ترێم بۆ دانان و کە ڕۆیشتن سێ کیسەشم بۆ داگرتن؟ مەلا لەو قسانەی من حەپەسا و گوتی ئەوە تۆ بووی قادر؟ مەلا هەڵسا سەرپێ و ماچی کردم و گوتی لێر بەولاوە، ئەگەر لەو ناوچەیە بووی، ماڵی من ماڵی تۆیە. ڕاستە کورد دەڵێ "تەنها چیا ڕێی بە چیا ناکەوێ، بەڵام چاو هەر بە چاو دەکەوێتەوە". لەگەڵ مەلا تا درەنگانی شەو نەخەوتین و شەوەکی خۆشمان بەسەربرد. مەلا محەمەدی بالیسانی کادرێکی چالاکی پارتی بوو و پێشتریش هاتبووە شەقڵاوە. من بە ڕێگەی محەمەد مەولود و مام تەهای کاوانی ئەوم دەناسی.

بەیانی ڕۆیشتین بۆ دێیەکانی ئەندیك و ئامانج و لەوێ دووبارە دابەشبوین، ئێمە ئامانجمان بۆ دانرا. کاولە هۆڵێکی مەڕوماڵاتی لێبوو، چاکمانکرد و خۆرەبانمان کردەوە، بۆ ماوەیەکیش لەوێ ماینەوە. ئێمە بەزۆری شەقڵاوەیی بووین، ئەوانەی لە بیرمن و بەیەکەوە بووین، حەمید قەساب، عەبدوڵا عەزیز، ئەحمەد سەلیم، حەسەن ئەحمەد هۆری، یونس حەمەد مەلا یونس، ساڵح حەسن حوسەین میسری، حوسێن کاوانی، حەمید کاوانی، برایمە خڕە، جەوهەر قادر کە نائب عەریف بوو، عەریف علی و کاکۆ ئەحمەد کوردە، ئەوانە پێشتر پۆلیس بوون. لەوێ ماینەوە و ڕۆژانە دەرچوونمان هەبوو تا ناوچەی هەرتەل و هەتا نزیك بالیسان دەچووین. بەڵام بالیسان جاش وپۆلیس و عەسکەری تێدابوو، هەروەها لە بەرەکەی تریش، زۆرجار دەچووین بۆ ناوچەی خەلەکان و کەمینمان دادەنەوە یان ڕێگامان دەگرت. ئێمە ئەرکی پارێزگاری لە بێتواتەمان پێسپاردرابوو، کە ئەوکات بەشێك لە سەرکردایەتی شۆڕش لەوێ بوو.

## یەکەم کۆبونەوەی سەرکردایەتی

شەوێك بەرەو چیایی هەیبەت سوڵتان بەڕێکەوتین، لەوێش چووین بۆ شیوەشان. کۆشکێکی بەکر ئاغا لەوێبوو و لێژنەی مەرکەزی هەمووی لەوێ کۆببونەوە. ئێمە بەمەبەستی پاراستنی ئەمنیەتی ناوچەکە چووبووین و ڕەشماڵێکمان بۆ هەڵدرابوو. مام جەلال، عومەر دەبابە، نوری ئەحمەد تەها،

حەمید باتاسی... هەندێك بوون لەو سەركردانەی كە لەوێ بوون. هەندێك ڕۆژان سێ چوارێكیان دادەبڕان و دەچوونە چۆڵی، پێدەچوو تاوتوێی بار و دۆخەكەیان دەكرد و پاش چەند كاتژمێرێ دەهاتنەوە. ڕۆژێك مام جەلال و ڕۆژێك عومەر دەبابە چێشتیان ئامادە دەكرد. ئەو ڕۆژانەی مام جەلال چێشتی لێدەنا، زۆر خۆشبوو، چونكە گۆرانی دەگووتن. لەبیرمە گۆرانی هەینار هەیناری دەگووت. دەنگی مام جەلال زۆر خۆشبوو، هەروەها خواردنی زۆر بە دادپەروەرانە دابەشدەكرد. پێموابێ مانگی یەكی ساڵی ۱۹٦۲ بوو كە زانیمان شۆڕش بڕیاری داوە شەڕبكاتەوە. ماوەیەك بوو مفاوەزات بوو لەگەڵ حكومەت، بەڵام شۆڕش هیچی بۆ وەگیرنەكرا. بۆیە سەركردایەتی بڕیاریدا شەڕ دەستپێبكاتەوە.

شیوەشان گوندێكی زۆر خۆشبوو، بەڵام ئاوەكەی خۆشنەبوو. گۆمێك هەبوو ئاوی بارانی لێدەپەنگایەوە و پێیان دەگووت ئاوی شیرین. ئەریتێكیش لەوێ باوبوو. دوو هەفتە بەرلەوەی كچێك بەبوك بچێ، هەموو ڕۆژ خۆی دەرازاندەوە و لەگەڵ دەستە خوشكەكانی دەچوونە سەر ئاوی شیرین. بە چەپلەڕێزان دەچوون و دەهاتنەوە و ئاویان دەهێنا.

دوای تەواوبوونی دانیشتنەكان، ئەندامانی لیژنەی مەركەزی هەموویان ڕۆیشتن كە هەندێكان یەك تا دوو پێشمەرگەیان لەگەڵدابوون. ئێمەش گەڕاینەوە و دكتۆر خالید و حەمید كاوانی سەرپەرشتی گرووپی ئێمەیان دەكرد. پێش ئەوەی ڕۆژهەڵبێ، لە چیای هەیبەت سوڵتان ئاوابووین. لەوێش چووینە ئەشكەوتی جەلی. ماوەیەكیش لەوێ بووین، ئینجا بۆ ناوچەی ئەندیك و ئامنج گەڕاینەوە.

## دابینكردنی دارایی

چەند ڕۆژێك پاش گەڕانەوەمان و هێشتا ماندوبونەكەمان نەحەسابوەوە، سەركردایەتی هەواڵی بۆمان نارد كە پارەیێكی زۆری حكومەت بەرەو كۆیە دەچێ و دەبێ دەستی بەسەردا بگرن. دوبارە مەفرەزەیەكمان چووینەوە بەرەو ئەشكەوتی جەلی و دوایی لە چیا پەڕینەوە. لەسەر ڕێگای كۆیە و لە شوێنی مەبەست بۆسەمان دانایەوە و بە نۆبەت دەچووینە سەر جادە. ئێمە بەشێكمان لە ئەشكەوت چاوەڕوان بووین، هەندێكیش لە كەمین. ئەوەبوو برادەرانمان دەستیان بەسەر ۳۲۰۰۰ دینار داگرت لەگەڵ ۱۰۰۰ دینار پول. بەڵام بەداخەوە، ئەو كوڕەی كە هاوكاری پێشمەرگەی كردبوو و هەواڵی ئەو

پارەیەی ناردبوو، بە دەستی پێشمەرگەیەك كوژرا. من زۆر لە پێشمەرگەكە تورەبووم، بەڵام ئەو هەندەك لە پارەكەی برد و هەڵاتە ناو عەشیرەتەكانی سەر زێ. ڕوداوێكی زۆر دڵتەزێن بوو و زۆر دڵتەنگی كردم، چونكە كوشتنەكە كارێكی پێویست نەبوو. سەد خۆزگە پارەكە نەبوایە، بەڵام ئەو كەسە شەهید نەكرابایە. دوای ئەو ڕوداوە، موچەی فەرمانبەرانی شارەكان بە هەلیكۆپتەر دەهێنرانە شارە سەرەكیەكانی وەك كۆیە و شەقڵاوە...

بە پەلە گەڕاینەوە بۆ ئەشكەوتی جەلی و چەند ڕۆژێك ماینەوە. محمد ناقوبانی حەیوانێكی كێوی كوشت، بەڵام تا گەیشتینە سەری، مردار ببوو. هەندێك كەس خواردیان، بەڵام هەندێكمان نەمانخوارد، هەرچەندە زۆر تامەزرۆی بۆنەكەشی بووین. هەندێك پێشمەرگە لەئەشكەوتی گەورە بوون، بەڵام ئێمە لە ئەشكەوتی بچوك بووین. ئەوانەی لە بیرمن، ئەحمەد زەخۆك، مەلا محەمەد، حەمید قەساب، حەمەدئەمین عەوڵا شین، مەلا یاسین، یونس حەمەد مەلا یونس، ساڵح حەسن حوسەین میسری، عەزیزی فاتە قەرەوێ و واحیدی خوارزای، قادر حەسەن، حەسەن ئەحمەد هۆرێن و ئەحمەد سەلیم...



لە ڕاستەوە: ئەحمەد سەلیمە گردە،
قادری گۆزێ
بۆمبی تەیارە هیران

بۆنی ئاوی ڕووباری سماقوڵی زۆر ناخۆشە، چونكە كانیاوەكانی ئەو ناوە جۆرێك لە مادەی كیمیاویان تێدایە. گۆمەكان كەفێكی سپیان لە سەربوو، لە خوارەوەش كانیاوێكی گەرم هەڵدە قووڵا. كابرایەك لەوێ بوو دەیگوت كانیاوەكە هەر ساڵەو لە بەرێكی ڕوبارەكە دەر دەبێ.

گەراینەوە بۆ ئامانج، هەرڕۆژە و مەفرەزیەك بۆ لایەك دەردەچووین. زۆرجاریش دەچووین بۆ ناوچەی خەلەكان. لۆریەكی حكومی سەربە بەڕێوەبەرایەتی كشتوكاڵ، پێیدەگوترا ئۆتۆمبیلی مەلاریا كە دیدیتی تێدابوو، لەو ناوە بە دەستی پێشمەرگە سوتێندرا. من و چەند هاوڕێیەك زۆر هەوڵماندا ئەو كارە ئەنجام نەدەن، چونكە مەكینەكە سودی بۆ ناوچەكە هەبوو. بەڵام كارینەكرد و سوتێندرا. چوار ڕۆژ دوكەڵ ئەبڕایەوە و بۆ ماوەیەكی زۆر، هیچ پێشكە و مێشولە لەوناوە نەمابوون.

لەو ٣٢٠٠٠ دینارەی دەستی بەسەرداگیرا، ١٠٠٠٠ بۆ سەركردایەتی و بارزانی ڕەوانە كرا. ئەوەی تریش بۆ پێداویستیەكانی پێشمەرگەی ئەو ناوە خەرج دەكرا. هەرچی كەم و كوڕیمان هەبوو، بۆیان دابین دەكردین وەك جل و بەرگ، خواردنی وەك حەلوا و خورماشمان بۆ دەهات، كە ماوەیەكی زۆر بوو ئەمان چێژتبوون.

من بە نیش چوبووم بۆ گوندی ئەنگۆز، تا هاتمەوە حەمید كاوانی لەگەڵ هاوڕێیانیتر گەشتێكیان ئەنجامدابوو و چووبوون بۆ زێوە و هەرمك و ئامانج. كە گەڕانەوە، باسیان دەكرد كە برنج و گۆشتیان خواردبوو. چونكە زۆر دەمێكبوو برنجمان نەخواردبوو، من ووتم ئەرێ برنج چۆنە؟ یەكسەر وە بێ پرسی من، حەمید كاوانی یونسی ناردبوو بۆ گوندی دواوێ كە پێنج كیلۆ برنج و ڕۆن بێنێ. لە ئامانجیش گیسكێكی كڕی. لەبەر خاتری قسەكەی من، شیوێكی زۆر خۆشیان ئامادەكرد! حەمید پیاوێكی زۆر مەردبوو.

من و هاوڕێكانم بۆ سەردان چووینە سەر قەڵاتی بێتواتە. جێگاكە زۆر سەختە و هەردوولای هەڵدێرە، تەنها یەك ڕێگە هەیە بۆ سەرەوە و بەیارێكی لەسەر چێندراوە. شوێنەواری دەرگای قەڵاتەكەش هەرمابوو. دوای دەرگاكە، تەختایەك دێت كە پێیدەڵێن تەختی خاوەر زەمین، چونكە شاخەكان وەك كاشی ڕاستن. جۆنی و هەركەویان لێدروست كردبوون و جێگای ئاویشی هەبوو. ئەشكەوتێكی لێیە كە دەورەی بە دیوار گیراوە و ئاوی تێدابوو، بەڵام بە خۆڵ و بەرد پڕببووەوە. دیوی دواوەی قەڵاتەكە گەلیەكی زۆر قوڵە. جێگایەك هەبوو دەیانگوت جێگای لەسێدارەدان بووە، بەڵام بەبڕوای من جێگای هەڵكێشانی ئاو بووە لەخوارەوە. لەو قەڵاتە شوێنەواری چەندین گۆڕ هەبوون، نیسقانیش لە چەند گۆڕێك بەدی دەكران. گوایا پارە و شتی سەیریشی لێ دۆزراوەتەوە. بە هەرحاڵ، ڕۆژێكی خۆشمان بردەسەر و گەڕاینەوە. بەم دواییە لە هاوڕێیەكی مەسیحیم بیست كە لە كتێبی كڵێسایی كۆن، ئەوە ناوی بێتواتە نییە، بەڵكو ناوی (بێت یاوت)ە، واتا (دار التوبە). من نازانم ئەوەیان چەند ڕاستە، چونكە لە

مێژوو نوسێکم بیست کە ووشەی بێ، مانای نارامیە و چەندین بێ لەو دەوروپشتە هەن وەك بێ دەلان، بێ ترخێن، بێتواتە...



ڕیزی پێشەوە: حەمید قەساب، ئەحمەد، زەخۆك ڕیزی دواوە لە چەپەوە قادر گۆزێ، ئەوانیتر نەناسراون

بۆ ماوەیەك لە گوندی نامانج ڕاهێنانی سەربازیمان دەکرد. عەریف عەلی مولود، جەوهەر قادر، عەریف حەمەد، سەمەد و سابر، کۆنە پۆلیس بوون و شارەزاییان لەو بوارە زۆر باشبوو. ڕۆژێك لە ڕیزی ڕاهێنان ووتیانە من و حەمید قەساب و برایمە خڕە، چەك دابنێن و وەرن! ئێمە نەمان دەزانی چی بووە. شەو و ڕۆژێك دەست بەسەرکراین و حاجی شوکر سەرپەرشتی ئێمەی دەکرد. حەمید کاوانی ئەو شەوە بە مەفرەزە ڕۆیشتبوو بەرەو ناوچەی سلێمانی، ئەگەرنا بەهیچ جۆرێك ئێمەی لە خۆی دانەدەبڕی. بەداخەوە ئەمە دواین سەفەری حەمید بوو و لەوێ شەهیدکرا. پیاوێکی مەرد و کوردێکی ڕاستەقینە بوو. ئیسماعیل ئەفەندی ومام تەها هاتن بۆلامان، لێمەش پرسیمان بۆچی ئێمە دەست بەسەر کراوین؟ ووتیان گوایا ئێوە گووتوتانە، "ئەگەر حزب سەرکەوێ، لێرە تا بالیسان خەڵکی لەسێدارە دەدا"! سعید مەسیفی هاتە لامان و گووتی، "ئێوە وەها دەڵێن و ئێمەش بەهەمووومان لێرە تا زێوەی نابینن"! ئێمەش گووتمان، "دیارە کەسێك خانینی میللەتی خۆی بێ، جەنابتان پاداشتی دەکەن! ئەگەر وابێ، ئێمە چەکمان بۆ چی هەڵگرتوە و خۆمان لە ماڵ و منداڵ بێبەشکردوە"؟ گووتی، "ئێوە ڕاستدەکەن و داوای لێبوردنی کرد".

جارێك ئێمە کۆمەڵێك پێشمەرگە بووین بەرەو مێرگەسەر بەڕێکەوتین. سەرما و شەختەیەکی زۆربوو و بۆ شەو گەیشتینە ماڵی سلێمان بەگ. لە دەرگاماندا، چەند پیاوێك هاتنە دەرەوە و ئێمەش خۆمان پێناساندن، ئەوانیش فەرمویان

لێکردین. بەڵام ووتیان لێرە نەخۆشمان هەیە و بردنیان بۆ خانوێکی تر. ڕۆژی دواتر زانیمان کە نەخۆشیان نەبوو، بەڵکو جاشێکی زۆر لەوێ بوون. جاشەکان زانیبوویان کە پێشمەرگە هاتوون، بەڵام مەردایەتی ماڵی سلێمان بەگ بوو کە نەیانهێشتبوو ڕووبەڕووی یەك ببینەوە. هەرئەو ڕۆژە بەرەو گوندی هەرمك هەوراز چووین. لە زێوە لە ماڵی کوێخا عەمەر میوان بووین، بۆ ئێوارەش چووینە گوندی هەرتەل. بۆ بەیانیش چووینەوە بێتواتە و لە وێش چووینەوە بۆ نامانج.

هەرلەو ماوەیەش ئاغاکانی هەردوو هۆزەکانی بیتوێن، ئاکۆ و بلباس، پیاوەکانی خۆیان دەناردنە ناو پێشمەرگە، چونکە شۆڕش داوای لێکردبوون کە دەبێ کوردایەتی بکەن و هاوکاری شۆڕشبن. لە دۆڵی خەلەکان ئەگەری ئەوە هەبوو کە حکومەت هێرش بکا. هەندێکمان لە جادە بەجێمابوون و ئێمە پۆلێکی ١٧کەسی لەگەڵ عەزیز دەربەندی چووینە سەرکەپکی باڵندە، کە بەسەر دوکان دەڕوانێ. دوو ڕۆژ لەوێ بووین، ئینجا هاتینە خوارەوە. عەریف سابیر بەرپرسی ئەو سەنگەرە بوو و عەزیز دەربەندی لێی پرسی، "بۆچی نانمان بۆ نەهاتووە، ئێمە خەریکە ڕۆیشتنمان پێناکرێ"؟ ووتی، "بەشەرەفم نانی حەوت کەسیشم زیادە ناردووە". دیاربوو ئەو کابرایەی بەرپرس بوو لە خواردنی ئێمە - کە دەمانزانی کێیە - خواردنی ئێمەی خواردبوو وە بەشێکی زەرکردبوو. عەریف سابیر لە کاتی وەتمان ناردیە پاقلان و لە ماڵی شێخی نانمان بۆ هات و هەریەکەو نانێکمان بەرکەوت.

## ئاهەنگی نەورۆز

نەورۆزی ١٩٦٢ نزیك ببوو. هەر مەفرەزەیەك بەرەو گوندێك کەوتینە ڕێ، بۆ ئەوەی داوایان لێ بکەین لە شەوی نەورۆز ئاگر هەڵکەن. من و شەش هاوڕێی تری خەڵکی شەقڵاوە چووینە گوندی ئەنگۆز و داوامان لە مەلای مزگەوت کرد کە بە خەڵك ڕابگەیەنێ ئاگری نەورۆز بکەنەوە.

بیستبوومان کە شیخ خاڵ جێگایەکی زۆر خۆشە و حەزمانکرد سەردانێکی ئەوێ بکەین. مریشکێکی زۆر گەورەشمان بە نیو دینار کڕی. مەنجەڵمان لە مام شوان وەرگرت و مریشکەکەمان کوڵاند. ڕۆژێکی زۆر خۆشمان لەوێ بەسەربرد. ئەوکات من شیعری سادەم دەنوسین. دەفتەرێکم پێ بوو کە شیعر و یادەوەری، جاروباریش کەم و کوڕیەکانی شۆڕشم تێدا تۆماردەکردن. مەلا عەوڵا پیاوێکی زۆر توند بوو و چەند هاوڕێیەکم ئامۆژگاریانکردم کە ئەگەر ئەو

دەفتەرەکە ببینی دەڵێ دیارە تۆ خەبەرمان لێدەدەی، بۆیە ئەم هەموو شتەت نوسیوە. هەرچەندە کۆمەڵێك شیعر و زانیاری بەسوود لەو دەفتەرە نوسرابوون، بەڵام لەسەر ئامۆژگاری هاوڕێیەکانم سوتاندم. بەداخەوە تەنها چەند پارچە شیعرێکم لەبیرماون. ئەو شیعرەشم ئەو رۆژ نوسی:

ڕۆژێ بە فەرمان چووینە دێی ئەنگۆز
خۆم و چەند هاوڕێ لەگەڵ یەك دڵسۆز
پێیان ڕابگەیەنین لە شەوی نەورۆز
ئاگرێ هەڵکەن لەسەر قوپەی قۆز
لە گەڕانەوە هاتینە شێخ خاڵ
جێگایەکی خۆش سەر چیا و ئاودال
ڕوباری بە خوڕی دێتە خوارێ
ڕامان بوارد ئەوڕۆژە تا ئێوارێ
دەمێ بە قسەو دەمێ بە شایی
مریشکێکمان کڕیبوو بەدە پەنجایی



لە ڕاستەوە:
حەمید قەساب،
قادر گۆزێ،
برایمە خڕە،
نەناسراو،
حەسەن ئەحمەد
هۆری

هاتینەوە بۆ ئامانج و شاخێکی بڵند لە نزیك ئێمە بوو، بەڵام تا بڵێی شوێنێکی سەخت بوو. ئاگرێکی گەورەمان بۆ ئەورۆز لەوێ کردەوە. بۆ ڕۆژی دواتر ئاهەنگی نەورۆز لە ئاوچەی گۆرمزە ڕێکخرابوو. شوێنێکی تەخت و خۆشبوو لە بەرامبەر گوندی بێتواتە. ئێمەش لەگەڵ مەلا عەوڵا سەرپەرشتی ئاهەنگەکەمان دەکرد. بۆ بەرگری لە هێرشی ئاسمانی، لەسەر بەرزاییەکان دوو ڕەشاش دامەزرێندرا بوون. کچ و کوڕەکانی ماڵی کاك حوسێن هاتن و خەڵکیان کۆکردەوە و جیهاز و بڵندگۆیان لەگەڵ خۆ هێنابوون. بەڕاستی ئاهەنگەکەیان

زۆر ڕێك وپێك تر كردبوو. به بەند و شایی و حەیران، خەڵكێكی زۆر بەشداری تێداكرد. كابرایەكی ڕەواندزی، گورگۆیان پێدەگوت، به گۆرانی بزماره و بزماره زیاتر له كاتژمێرێك شایی گێرا.

## چالاكیەكی گەوره

ڕۆژێك بروسكەمان بۆ كرا كه هەموو پێشمەرگەكانی ناوچەكه، به هەموو كەل و پەلەكانیەوه بێنه بێتواته. عومەر دەبابه و مەلا عەولا لەوێ بوون و كۆبونەوەیان پێكردین. پرسیاریان كرد هەریەكەی چەند فیشەكمان پێیه. هەركەس كەرەستەی خۆی پیشاندا و ئەوەی فیشەكی كەمبوایه، بەقەدەر حاڵ هەندێكیان داین. ئەوكات فیشەك هێنده زۆرنەبوو. عومەر دەبابه ووتارێكی بۆ خوێندینەوه و ووتی، "هەرچی قاندەكانتان دەڵێ، دەبێ به گوێیان بكەن، ئەگەر قائیدیش خەتی خۆی بەزاند، ئەوا ڕاپۆرتی خۆتانی لەسەر بنوسن و من بەو پەنجانەم چاوی دەردێنم".

كۆی ئێمه ٩٦ كەس بووین و هەموومان ئامادەبووین بەرەو شوێنی مەبەست بڕۆین. بۆ نوێژی شیوان كەوتینه ڕێ و ماوەیەكی زۆر ڕۆیشتین. له كۆیه و تەقتەق تێپەڕین، ئینجا له پێنج گوند دابەشبووین و شوێنی یەكترگرتنەوەمان له گوندی بۆگرد بوو. بۆ شەو باران و تەزرەیەكی زۆر باری و گەنم و جۆی ئەو ناوەی لەگەڵ زەوی ڕاستكرد. كه گەیشتینه بۆگرد، جوتیارەكان زۆر خەمباربوون، بەڵام زۆربەی ماڵەكان مریشكیان بۆ ئێمه سەربڕی بوو. مەلا عەولا شارەزایی له جوتیاری هەبوو و پێی گووتن، خەم مەخۆن، گەنم و جۆ له جاران چاكتر ئەبێ و كه ئەڕژێتەوه گوڵەكەی زیاتر پنج دەكا. بۆ جاری دواتر كه ڕێمان كەوتەوه ئەو ناوه، ئەڵبەته گەنم و جۆ لەجاران جوانتر ببوو. من هەردەم حەزم له شوێنەواره و له بۆگرد چوومه قەڵاتی پاشای گەوره (پاشای كۆر). بانەكه كەوتبوو، بەڵام هەندێ داره تووەكانی بانەكه هەرمابوون.

بۆ ئێواره چووینه گوندی كلیسه، كه كەوتۆته سەر زێ. شەو لەوێ بەسەر ماڵەكان دابەشبووین. ئەو ماڵەی من بۆی چووم، گۆشتی سوسكەیان هەبوو. منیش زۆر حەزم له ڕاوی سوێسكه بوو. كابرا ووتی هەموو ماڵێك لێره ڕاوی سوسكه دەكا. پرسیارم كرد له ڕۆژێكدا چەند سوسكه دەگرن؟ گووتی ده تا دوازده. منیش گووتم ئەو ڕاوه لای ئێمەش زۆر باوه. بەسەرهاتی خۆشم بۆ باسكرد كه جارێكیان، له بەیانی تا نیوەڕۆ، ٢٧ سوسكەم گرت. بەڵام ئێمه هەر مانگێك ڕاوی سوسكه دەكەین، كەچی له دەشتی كۆیه ماوەكەی زیاتره و

خەڵکێکی زۆر دەچنە ڕاو. بۆ بەیانی بە کەڵەك لە زێ پەڕینەوە کە لە ١١ بەرمیل دروست کرابوو و وولاغەکانیشمان لە زێی پەڕاندنەوە. لەو ناوچەیە، لە هەموو زەویەکانی ئەمبەر و ئەوبەری زێ کشتوکاڵیان چاندبوو.

مەلا عەولا لە پێش ئێمە دەڕۆیشت و بۆ شەو گەیشتینە سۆتکە، کە لە نزیك گوندی عەسکەرە و چووینە مالی شێخ قادری سۆتکەی. خانوەکەی چوار ژووربوون و پڕببوون لە پێشمەرگە. بەو نیوەی شەوە نانیان بۆ ئامادەکردین. سەرەڕای ئەو ماندووبونە، هەندێکمان جێگای نوستنمان بەرنەکەوت. بەیانی مەلا بانگدان کەوتینە ڕێ. لەناو زورگەکان دەڕۆیشتین و بەهارێکی خۆش بوو، بەڵام هێشتا سەرما هەرمابوو. لە بەرزایەك چووینە خوار بۆ چەمی ڕێزان، دیمەنێکی زۆر جوان بوو. پێشمەرگەکانی لقی هاشم عەقراوی لە پێشوازیمان بوون و پێش ئێمە گەیشتبوونە ئەوێ. ووتیان ئەمڕۆ دوو مەڕی کێویمان کوشتوە، منیش زۆر پەرۆش بووم مەڕی کێوی ببینم. بزنی کێویم ڕاوکردبوو، بەڵام مەڕی کێویم نەدیبوو.

من و هاشم عەقراوی لەسەر بەرزایەك دانیشتین، ئەمبەر و ئەوبەرمان چیا بوو. دەوروبەریشمان گیای ترشۆکەی لێ بوو، منیش خوێم دایم پێبوو و ترشۆکەمان بەیەکەوە خوارد. هاشم ووتی "ئەتو مرۆیەکی گەلەك زیخی، ئەڤ شتانە چەوا دناسی" کە کەتینەوە ڕێ و لەو سەفەرە، هاشم عەقراوی هەرلەگەڵ من دەڕۆیشت. کە زانی شتێك لە دونیایە دەگەم، حەزیدەکرد بەیەکەوە بڕۆین. هاشم باوەڕپێکراوی بارزانی بوو و مەلا عەولاش زۆری حەزنەدەکرد کە هاشم عەقراوی لە پێشمەرگەکانی ئەو نزیك ببێتەوە. بەڵام چونکە مەلا عەولا منی خۆشدەویست، هیچی نەدەگووت.

گەیشتینە ناوچەی چەمی ڕێزان و ئەو ناوە ئەشکەوتێکی زۆری لێبوو. لەو شوێنە دۆڵێك هەیە کە بەرێکی کەوتۆتە لیوای کەرکوك و بەرەکەی تریش لە لیوای سلێمانی. ئێمە لە بەشی لیوای کەرکوك بووین. بارەگایەکی پێشمەرگە لە یەکێك لە ئەشکەوتەکان بوو. چووین بۆ بارەگاکە و مەلا ئاسیح سەرپەرشتی ئەو بارەگایەی دەکرد. کۆی هەموومان ١٧٨ کەس بوو و هێشتا نیوەی ئەشکەوتەکەش بەتاڵ بوو. لەبەر دەرگای ئەشکەوت دانیشتبووم، جارێکی تر هاشم هاتەوە لام. باسی پێشهاتەکان و شێخ ئەحمەد و مەلا مستەفا، هەروەها شۆڕشی پێشوو و کۆماری مەهابادمان کرد. پرسیارم لێیکرد"بە ڕای تۆ ئەو شۆڕشە بەرەو کوێ دەچێ" ؟ ووتی، "خودێ ئەز نزانم". زۆر پێم سەیر بوو کە کەسێك لە سەرکردایەتی بێ و ئاگای لە هیچ نەبێ! ئێمە سێ ڕۆژ لە و بارەگایە پشوماندا.

نیواره بوو هاشم عەقراوی ووتی، هەرکەس چەکی خۆی هەڵگرێ، بەڵام هیچ جێنەهێڵن و سەرکەون بۆ سەری چیا. پێشتریش مەلا عەولا نۆبەتچی ناردبوون و ڕایسپاردبوون، کە هەرکەسێکیان بینی بەرەو لای دوژمن دەڕوا و خۆی نەدا بەدەستەوە، تەقەی لێبکەن و بیکوژن، ئەوەکو خەبەرمان لێبدەن وە پلانەکەمان ناشکرابێ. لەوێ چووین بۆ سێگردان، کە ناوەکەی هەر لە خۆیەتی، چونکە کەوتۆتە بەینی سێ گرد. کۆمەڵێك خەڵکی ناوچەکە بۆ پشتگیری و وەك شارەزا لەگەڵمان هاتبوون. مەلا عەولا پرسیاری لێدەکردن، ماڵی مدیر ناحیە چەند کەسی پێویستە؟ فڵانە جێگا چەند کەسی پێویستە؟... مەفرەزەکان دابەشکران و هەر مەفرەزە و شارەزایەکی لەگەڵ بوو. مەفرەزەی ئێمە شەش کەس بووین. من، برایمە خڕە، ئەحمەد زەخۆك و دوو کەسی تر، سەردەستەکەشمان ناوی شێخ وەسمان بوو. ئەوکات ئەهێنیەکانی شۆڕش زۆر دەپارێزران، ئێمە ئەو نیوارە زانیمان کە دەچینە ناغجەلەر.

هەر مەفرەزەو لە قۆڵی خۆی ڕووی لە شار کرد و ڕۆناکی فانۆس لەناو شار دیاربوون. ڕوبارێکی زۆر ساردیش لە سەرڕێگەمان بوو و بە ناچاری پەڕینەوە. کاتژمێر نۆی شەو تەقە دەستی پێکرد. هەرزوو و جگە لە قشڵەی پۆلیس، شارەکە لەلایەن پێشمەرگە کۆنترۆڵکرا. مدیر ناحیە و ئەوانەی مەبەست بوون زۆربەیان گیران. کۆمەڵە خەڵکێکی تریش گیران کە پەیوەندیان بە دائیرەی ئەمن کردبوو. شوێنێکی تریش بۆ ئێمە دیاری کرابوو و وامان بۆ باسکرابوو کە ئەو کەسە پیاوی حکومەتە و چەکی هەیە! بەرلەوەی بگەینە ئەوێ، دوو کەس پەیدا بوون. لێمان پرسین ماڵی فلانە کەس لە کوێیە. ووتیان وەڵڵا ئەوە ماڵی ئێمەیە و بە پێی خۆیان هاتنە بەردەستمان.

بۆ ئەوەی بەرایی لە هێزی حکومەت بگرین، هەرئەو شەوە هێزەك بەرەو گوندی چنارتۆ کەوتەڕێ. بۆ بەیانیەکەی لەگەڵ تاریك و ڕۆن، ڕومانکردە سەنگەرەکانی دەورەی شار. دکتۆر خالیدمان لەگەڵ بوو و داوای لە من کرد کە لەگەڵ دوو کەسی خەڵکی بیتوێن و دوو کەسی ناغجەلەری، کۆنترۆلی گردێك بکەین. بەرزاییەکانی ئەو ناوچە داریان کەمە، فڕۆکەی جەنگیش پەیدابوون و دەستیان بە بۆمباران کردنی دەور و پشتی ئێمەکرد. تەنها من و کوڕێکی بیتوێنی، کە خەڵکی گوندی پوکەبوو خۆمانگرت، ئەوانیتر ڕۆیشتن و بزربوون. تەیارە زۆر نزم بوو و دڵنیابووین کە دەرچوونمان مەحاڵە، بەڵام خوا لە ڕۆژی ئەبردین. بۆ ئێوارە دووبارە کۆبوینەوە و بەرەو قشڵە ڕۆیشتین، کە هێشتا خۆیان بەدەستەوەنەدابوو و تەقە هەربەردەوام بوو. چواردەوری قشڵە چۆڵی

بوو و نەدەکرا نیمە بەرەوپێش بچین. قادر حەسەنیش یەکێك بوو لەوانەی بەرامبەر دەرگەی قشڵە تەقەیان دەکرد.

مەلا عەوڵا نۆ کەسی لە نیمە نارد بۆ گوندی تەوەکەل، دواییش بڕیاربوو لە گوندی سۆتکە یەکتر بگرینەوە. شێخ عوسمان سەردەستەمان بوو، دوو فیشەکدانی لە پشت و یەکێکیشی لەسەر شانبوو. من، برایمە خڕە، ئەحمەد زمخۆك، ڕەسوڵ مەولود، کوڕێکی گەلاڵی کە ناوی عومەر بوو وە سێیانی تربووین. کەوتینە ڕێ و ڕۆژمان بەسەرداهات. گەنم بەرز ببوون، کە تەیارە دەهات لە ناو گەنم خۆمان حەشاردەدا. دوو گوند هەبوون بەناوی تەوەکەل. لە بەینی هەروو گوندەکە، قەڵاتەك لەسەر گردێك هەبوو و ناوی تێدابوو. لەبن سێبەری قەڵاتەکە دانیشتین و کورتە پشوێکماندا. کابرایەك لەوێ تێپەڕی و منیش پرسیارم لێیکرد، ئەو قەڵاتە هی چ سەردەمێکە؟ ووتی گاورکاریە (پێش ئیسلام)، بەڵام عەشیرەتی هەمەوەند نۆژەنی کردۆتەوە. تۆپی حکومەت گەیشتنە تەوەکەل و دیاربوو هێزەکانی حکومەت گەیشتونەتە ناغجەلەر. بڕیارماندا بگەڕێینەوە، بەڵام ئەمجارە لەبەر تۆپ و تەیارە، ڕێگاکەمان زۆر دوورکەوتەوە. کە گەیشتینە گوندی سۆتکە، هەموو پێشمەرگە لەوێ کۆببونەوە. مەلا عەوڵا پرسیاری دەکرد کێ دیارنیە؟ بەداخەوە فەقێ وسو گەڕۆتەیی شەهید ببوو و لە گوندی چنارتۆ بە خاك سپێردرا.

بۆ شەو گەڕاینەوە چەمی ڕێزان و بۆ ڕۆژی دواتر، تەیارە هەر بەدووامان دەگەڕا. من و چەند هاوڕێیەك لەسەر بەرزاییەك نۆبەتچی بووین. تەیارە ئەوەندە نزمبوو کە ڕەشاش کاری لێدەکرد، بەڵام حەیفێ ڕەشاشمان لەلا نەبوو. لە ترسی دەنگی تەیارە، جووتە گورگەك لە کەلێنی کۆمەڵە بەردێکی گەورە هاتنە دەرەوە و بە پێش نیمە تێپەڕین.

ماوەیەك لەو چەمە پشوماندا. لەوناوە ئەشکەوتێك هەبوو ووتیان زۆر قوڵ و درێژە، گوایا لە ژورێ دەنگی سەیر دەبیسترێ. دوازدە کەس ڕێککەوتین و فانۆسێك و عەنەتریك (لایت)ێکمان برد و بەرەو ئەشکەوتەکە کەوتینە ڕێ. ( پێدەچێ ووشەی عەنەتریك لە ووشەی ئەلکتریکی ئینگلیزی هاتبێ). پەنجا مەترێك چووینە ژورەوە، لەبەر تەنگەنەفەسی، هەشت کەس گەڕانەوە. هەندێ جێگای ئەشکەوتەکە زۆر بەرینبوون و هەنێکیش تەسك، دیوارەکانیش نەرمبوون. من زۆر چاوم دەگێڕا کە شتێکی دەستکار بەدیبکەم، بەڵام هیچ نیشانەیەکم چنگنەکەوت. کەمێکیتر ڕۆیشتین و خەریکبوو هەناسەمان تەنگتر دەبوو، بەڵام گەیشتینە فێنکاییکی خۆش. ئاوێك لە کەلێنی شاخ دەهاتە خوارەوە و گۆمێکی لێدروست ببوو. پێدەچوو ئاوەکە مادەیەکی کیمیاوی تێدابێ، چونکە

شاخەکەی سپیکردبوو. کەمێکم تامکرد، تاڵ نەبوو، بەڵام زۆرگەرمبوو. کەمێکیتر ڕۆیشتین، گەیشتینە ناوێکی تر. بەردێکی بچوکم بۆ یادگاری لە هەردوو ناوەکە دەرهێنا. گەشتینە ژورێك کە تەنها کونێکی بچووکی تێدابوو. برادەران ووتیان با بگەڕێنەوە، بەڵام من پێمداگرت لەسەر ئەوەی بزانین لەودیو چی هەیە. بەکر هیرانی لەگەڵم هات، ماوەی چەند مەترێك لەسەر سك ڕۆیشتین و عەنەتریکمان بردبوو. کە گەیشتینە ئەودیو، ژورێکی گەورەتربوو لەوانەی پێشوو و دووبارە لەوبەر تەسك دەبوەوە. لەوێ هێمای تیرێك لەسەر شاخەکە کرابوو کە ڕووی بەرەو دەرگاکە بوو و هەندێ نوسینیش کرابوون. یەکێکیان نوسرابوو "جەماعەتی عەلی عەسکەری ئەشکەوتەکە هەموو گەڕاون و هیچ شتێکی دەستکردی لێ نەدۆزراوەتەوە". هەرلە نزیك ئەویش نوسرابوو کابرایەکی فەرەنسی سالی ١٩٥٧ هاتووە بۆ بەسەرکردنەوەی ئەشکەوتەکە. لە لایەکی تریش نوسرابوو کە کەسێك سالی چل هاتووە. ئێمەش دەمانویست شتێك بنوسین. بەکر قەڵەمێکی مەرەکەبی پێبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی شوێنەکە زۆر شێداربوو، کە دەمان نوسی، مەرەکەبەکە بڵاو دەبوو! نازانم ئەوانی تر بەچیان نوسیبوو. خەریك بوو هەناسەمان زۆر تەنگتردەبوو و بەپەلە خۆمان گەیاندە دەرەوە. دوو ڕۆژبوو هەستمان دەکرد کە لەشمان هەرماندووە.

چەند ڕۆژێك لەناو ئەو دۆڵاییە ماینەوە و لە کەنار ڕووبار لە چەمی ڕێزان، داری توڕەمەکی و ئەستری و بلالوك وسۆبلەتی زۆر چڕ هەبوون. هەرلەوێ بۆ یەکەم جار مەڕی کێویم بینی، قۆچ (شاخ)ەکانی گەورە و بە گرێ بوون، بەڵام کلکی بچوك بوو.

ڕۆژەك مەلا عەوڵا گیراوەکانی لە ئەشکەوت هێنانەدەر. بە کوڕێکی ووت، ئەوە نامەی باوکتە بیخوێنەوە. نامەکە لە مدیر ئەمنی ئاغجەلەر بۆ کەرکوك ناردرابوو و تێیدا نوسرابوو، کە فلان هاتەلاتان ئاگاداربین، چونکە دۆستی ئێمەیە و دوژمنی قەومی خۆیەتی. ئینجا هاتە سەر یەکێکی تر و ووتی، "بۆچی پارمەتی ئێمەت نەدا"؟ ئەویش لە وەڵام ووتی "قوربان سەهوم کرد، شێتم" جلەکانی لێ هەڵتەکاند و ووتی، "شێت ڕووتە نەك وەك تۆ پۆشتە" ئەویش ووتی، " قوربان لەمەودوا پارە دەدەین". مەلا عەولا توڕە بوو و ووتی، "بۆ ئێمە قەشەی کاسۆلیکی ئەوروپاینە، بە پارە ڕازی ببین". کابرا ووتی چوار منداڵم هەیە، مەلا عەوڵا لە وەڵام پێی ووت، "کەواتە کوشتنت واجیبە، شۆڕش منداڵەکانت بەخێودەکا، با وەك تۆ خائین و مێشك بۆگەن نەبن". دوایی گشتمان ئازادکردن، تەنها مدیر ناحیە نەبێ.

پاش نیوەڕۆیەك بەرەو بێتواتە کەوتینەڕێ. لە چەمی ڕێزان ڕەتبووین، بەدەم ڕووبار دەڕۆیشتین. لە ناو گەلی، ڕووبارەکە لەگەڵ ناوی سورداش و زێی بچووك تێکەڵ دەبێتەوە و دەبێتە ڕووبارێکی زۆر گەورە. هەرلە ناو گەلیەکە، گەیشتینە جێگایەك کە کۆنە قەڵات بوو. تا بناری چیا، خانو لە دوای خانو لەسەر یەکتر کرابوون. لایەکی قەڵاتەکە کەندبوو، ڕووباریش لە دەوری پێچیدابووەوە. لە شوانێکم پرسی ناوی ئەو قەڵاتە چییە؟ ووتی "قەڵاتی شا جوڕندی".

ئەوبەری ڕووبار چەند گوندێکی لێبوون و هەمووی جۆگەیان بۆ برنج هەڵبەستا بوو. مدیر ناحیەمان سواری ماینەکی کردبوو و من لە ڕێگا قسەم لەگەڵ دەکرد، کوڕێکی زۆر نەرم و فەقیرحاڵبوو. گەیشتینەوە بێتواتە، لەوێ جێگایەکی تایبەت هەبوو بۆ ئەم جۆرە گیراوانە و ڕادەستی ئەوان کرا.

جارێکی تر مەفرەزەیەکی گەورە بووین چووینە گوندی سماقوڵی، لەوێش بۆ گوندی قۆرتەلاس. ئەوکات لقی هەولێر لەوێ بوو و شەو لەوێ خڕبوینەوە. دواتر بەرەو دەشتی کۆیە بەڕێکەوتین بۆ ئەنجامدانی چەند چاڵاکیەك، کارەکانمان جێبەجێکردن و گەڕاینەوە. هێشتا بەهار مابوو، ڕەشماڵی مەنتکەکان لەسەر ڕێگای گەڕانەوامان بوون. چووینە دۆڵی ئەسحابان، کە کاتی خۆی شەڕی گەورەی ئەسحابەکانی لێکراوە و گۆرستانی گەورەی لێیە. سروشتی بەردەکانی ناوچەکە بەلامەوە سەیربوو، زۆر لە بەردەکان چاڵی خڕیان تێدابوون، وەك بڵێی بە دەست ئەخشابن. لەوێشەوە بە فەرمان چووینە ناوچەی خدران و کانی مازی لە دۆڵی خەلەکان وە چیاکەی ئەو ناوەمان گرت و کۆنتڕۆڵکرد. دوو ڕۆژ لەوێ ماینەوە و بارانێکی زۆرمان بەسەر باری. ئێمە بەخۆمان یەکجار ماندوو بووین، بارانەکەش ئەوەندەیتر شەکەتی کردین. سەرباری ئەوەش، بروسکەمان بۆ هات کە دەبێ دەم ودەست پاشەکشەبکەین. بە ناچاری و بەو شەوە کەوتینە ڕێ، هەردەڕۆیشتین، هەڵدەخلیسکاین و بەردەبوینەوە. گەیشتینە ڕووباری قەسرۆك، بەڵام لەبەر باران، ناوەکە زۆر زیادیکرد بوو. دوو ووڵاغمان پێ بوون، سەری پەتێکمان لە هەردووکیان قایم کرد. ووڵاغەکان لە پێشمان دەڕۆیشتن و ئێمەش پەنجا کەسێك دەبوین و دەستمان لە پەتەکە گرتبوو و لەدوایانبووین. ناو تا نزیك فیشەکدان هاتبوو، بەڵام هەموومان بەسەلامەتی پەڕینەوە ئەوبەر. لە دێی پوکە پێش ڕۆژهەڵات، کورتە پشویەکماندا. هەرلەو بەینە بروسکەیەکی تر هات کە بچینە بالیسان، گوایا جاشەکان هێرشیان کردوە و سێ چوار کەسیان کوشتوە، هەروەها دوو کەسیش بریندارن. بە ناچاری ئاراستەکەمان لە بالیسان کرد. کە گەیشتین،

بالیسان چۆڵ ببوو، تەنها دە تا پازدە ماڵێك مابوون. سەنگەرمان لێدان و چەند ڕۆژێ لەوێ ماینەوە، بەڵام جاشەکان نەهاتنەوە.

## کۆبونەوە لەگەڵ بارزانی

لە زێوە مەحمود کاوانی نامەی بۆ کوێخای گوندەکان دەنوسی. نامەیەکی پێیدام و ووتی بۆ کوێخا تاهیری هەرمکی ببە، شەش کەسیشی لەگەڵ ناردم. کوێخا تاهیر لەبەر چاوی من نامەکەی بە کەسێك لە دیوەخانی خۆی خوێندەوە. تێیدا نوسرابوو "مەلا مستەفا هاتۆتە ناوچەی سۆران، بۆ ماوەی سێ هەفتەی تر کوردستان ئازاد دەبێ". ئەو کەسەی نامەکەی دەخوێندەوە، گریا. ووتم بۆ دەگری؟ ووتی نامەکەی بە قەڵەمێکی سوری وەك خوێن نوسیوە! خەمی ئەوەی بوو کە شەڕی گەورە ڕوودەدا و خوێن دەڕژێ.

چەند ڕۆژێکی پێچوو، بۆ بەسەرکردنەوەی ناوچەکە، دیسان بەرەو بالیسان کەوتینەوە ڕێ و لەوێ چووینە ماڵی حەمەد شینکۆ. حەمەد شینکۆ ڕاوچی بوو و چەند کەوێك و داوی پێشکەشکردین. ئێمە لەگەڵ دەروێش عەوڵا دابووین، کە دەروێشی ماڵی کاکی هیران بوو. پیاوەکی زۆر چاکبوو و چوار کوڕی لەگەڵ بوون و ئێمەش پێنج شەقڵاوەیی بووین. دەروێش عەوڵا ووتی، "ئەو کەو و داوانە لەگەڵ خۆمان دەبەینەوە. ڕاستە ماندومان دەکەن، بەڵام کە گەیشتینە سایە و سێوۆکان، هەرگۆشت کەو دەخۆین". جاری پێشتر کە لەوێ بووین، کەو زۆربوون. گەیشتینە دۆڵی مەلەکان، شوێنێکی زۆر جوان و دڵخۆشکەربوو. ڕەشماڵ هەڵداربوون و کەویە بەفریان دەکردن. لەخوار کەویە بەفرەکان چاڵیان لێدابوون، بۆ ئەوەی ناوی بەفرەکە لەناوی کۆبیبێتەوە و مەڕوماڵاتی پێ ئاوبدەن. شەو لەو ناوە ماینەوە و بەیانی زوو بەتەنیا دەرچووم، بەهیوای ئەوەی بزنێکی کێوی ڕاوبکەم. لە ڕەشماڵەکان بە دوورکەوتم و پێشونی هەرس (وورچ)یشم بینی، بەڵام هیچ دەسکەوتم نەبوو. کە گەرامەوە نزیك ڕەشماڵەکان، بەرامەر کەویە بەفرێك دانیشتم و بۆ یەکەم جار لە ژیانم، کەوێکی سپیم بینی.

بە مەبەستی کۆبونەوە لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی، ڕۆژی دوایی چووینە زینی ئەستێرۆکان. پارساڵ ئێرەمان لە پایز بینی بوو. لە بناری کاڕۆخ، هەردۆڵێکی دەماندی، ئاوێکی دە لینجی پێدا دەڕۆیشت. ئینجا گەیشتینە کوێستانی مەکی. کوێستان چ کوێستان! شوێنی ئەوها خۆشم لە ژیانمدا نەدیبوو و سروشتێکی یەکجار سەوز و پڕ داری هەبوو. دار گوێز، مازی، مێو و سێو بەشێك بوون لە

دارەکان. لە وەرتێ مزگەوتێکی سپی هەبوو و چووینە ئەوێ. ڕووبارێکی گەورەی ناوی چیای کاڕۆخ بەوێدا دەڕوا. کاتی خۆی داربڕەکانی شەقڵاوە، وەك محمودی پیرەژن و ئەوانیتر، داریان لە وەرتێ دەکڕین و بەو ڕووبارەیان دەهێنانە خوارەوە تا ناوکێلەکان. ئینجا بە ووڵاغ و بە لۆری دەیان گواستنەوە. ڕێگەی وەرتێ گەلێك ناخۆش و قوڕبوو، لەو ناوە، ئەوەی خێری بکردبا ڕێگەکەی خۆش دەکرد.

گەیشتینە گوندی خانەقا، تازە توو پێرادەگەیشتن و گۆڕەتوێك لە بەرامبەر مەرقەدی ماویلیان بوو. لە پرد پەڕینەوە بۆ زیارەتی شێخی ماویلیان. عەباس ئاغای سەرکەپکانمان لەوێ بینی و چاك و چۆنیمان لەگەڵی کرد. کەوتینەوە ڕێ و گەیشتینە گوندی ڕەژێکەریان. خەڵکی ئەو ناوە زیاتر بە مێش هەنگ خەریك بوون. لە دورەوە بینیمان ئاگرێکی زۆر کرابوونەوە و لەشکری بارزانی لەوێ بوو. بۆنی گۆشت برژاندن ئەو ناوەی پڕکردبوو، ئەوکات لە سەردەمی عبدولکریم قاسم، تەیارە بەشەو نەدەهات. ئەو لەشکرەی لەگەڵ بارزانی بوون هەموویان بارزانی بوون. ئێمە لە پێش ئەوان تێپەڕین، گۆشت بەکۆمەڵ داندرابوو، بەڵام کەسەك فەرمووی لێنەکردین. هەرئەو شەوە، مەحمود کاوانی چووە لای بارزانی و تاوتۆێ باروودۆخەکەی لەگەڵ کرد.



لە ڕاستەوە: ئەنانسراو، مەحمود کاوانی
لە ئەرشیفی ئیسماعیل ئەفەندی وەرگیراوە

لەگەڵ سابیر ئاقوبانی کە کۆنە پۆلیس بوو، تا درەنگانی شەو دانیشتم. باسی چۆنیەتی هەڵگیرسانی شۆڕش لە بارزان و پشدەر، هەروەها باسی ئەگەرەکانمان دەکرد. بەیانی هێشتا ڕۆژهەڵنەهاتبوو، من و دەروێش عەوڵا لە نوێژکردن دەهاتینەوە و لەسەر ڕێچکە دەڕۆیشتین، بینیمان بارزانی بەرەو ئێمە

دێ. کە بارزانی گەیشتە لای عەزیز سولی، ووتی "ها عەزیز ئاغا، باشی، سەلامەتی"؟ عەزیز زۆر دڵخۆشبوو، چونکە خەڵك حەزیدەکرد قسە لەگەڵ بارزانی بکا. من زۆر بە ووردی تەماشای بارزانیم کرد. سواری ئەسپێك ببوو کە بەتانیەکی فەتاح پاشای لێ قایمکرابوو و پێشمەرگەیەکیش لە پێشی دەڕۆیشت. بارزانی ڕانك و چۆغەڵێکی داغ داغی لەبەردابوو. تفەنگێکی بڕنۆشی بە لاونیو لەمل کردبوو و خەنجەریشی لەبەر پشتبوو. یەك دەلینگی ڕانکەکەی لەناو گۆرەویەکەی نابوو و دووربینیشی لە مل بوو. سڵاوێکی گەرمیشی لە ئێمەکرد و ڕەتبوو.

## ئازادکردنی باڵەکایەتی

لەشکری بارزانی هەمووی ڕۆیشت و ئێمە لە گەلیەکانی ئەو ناوە ماینەوە و تەیارەش بەردەوام دەهات. شەو کەوتینە ڕێ تا گەیشتینە پردی حافیز. هەندێك هێزی بارزانیەکان ڕۆژی پێشی لەوێ ڕۆیشتبوون، جەماعەتی عەباس ئاغاش لە سەر ئەو دوو بەرزاییە بوون کە بە بەسەر پردەکە دەیانڕوانی. هەردوو لا بەهەڵە لێیان ببوو بە تەقە و ئەبی سەرناسن شەهید کرابوو. کاتی خۆی دەیانگوت ئەبی سەرناسن فەوجێکی بەتەنیا گرتبوو! لە بالسنان تا سەری ڕۆلە بە ئێمە سپێردرا، کە بەسەر دەرگەڵە و بەرسیرینی دەڕوانێ. لە بەر هەستیاری شوێنەکە، بەین بەین ناڵو گۆڕیان پێدەکردین. تا ماوەیەك جەماعەتی عەباس ئاغاشمان لەگەڵ بوون. پاشان، مەحمود کاوانی بە عەباس ئاغای ووت، "کارەکان ئەوها نابن، لایەکی لێ هەڵگرە، یان ئەوبەرەی پرد یان بەرەکەی تر". عەباس ئاغا سەری چیای ڕۆلە تا پردی هەڵبژارد. ئێمەش لەسەر کۆسپی سپی دابەشبووین تا دەرە بەرانێ.

جەماعەتی شێخ زەیتۆ بەشەو دەهاتنە لای ئێمە و زۆر یارمەتیدەرمان بوون، زۆرجار خۆراك و پێداویستی تریان بۆ دەهێنایین. شێخ زەیتۆی سەید تەهای ئەهری لەسەرەوە لەگەڵ حکومەت بوو و برایەکیشی لەگەڵ بارزانی بوو. شەوێك خەبەریان هێنا کە حکومەت داوای لە سلێمان بەگ کردووە کە سەری ڕۆڵە بگرێتەوە. سلێمان بەگی دەرگەڵە کە ئاغای ئەوناوەبوو گووتبوی، "ئەگەر لەشکری محمود کاوانی لەوێ بێ، ئەوا من ناچم. ئەوان هەموو ماڵیان سوتاوە و کوڕیان کوژراوە و لە گوڵە ناگەڕێنەوە و من خەڵکی خۆم بەکوشت نادەم". هەرهەمان شەو، دەوروبەری کاتژمێر دوازدە، لەوبەر بووە تەقە و سەری ڕۆڵەی وەرگرتەوە. بۆ بەیانی ئاڵایەکی سپی لە سەری ڕۆڵە هەڵدرابوو و ئێمە پشتمان گیرا. کاك سەدیق هیرانی ئیدارەی ئەوێی ئەگێرا و بەرپرس بوو

لە دابینکردنی فیشەك و خۆراك و پێداویستیەکان. کاك سەدیق نامەیەکی بەبێ ئاگاداری مەحمود کاوانی بۆ مەلا مستەفا ناردبوو، کە بارودۆخمان خراپە و داوای هێزی کردبوو. کە مەحمود کاوانی بەمەی زانی زۆر تورەبوو. حاجی بێرۆخی لەگەڵ نەوەد کەس هات و شەو لەگەڵ هەندێ لە شارەزاکانی ناوچەکە هەموو جێگاکانی بەسەرکردنەوە. نۆ سەنگەر لە سەری ڕۆڵەی دامەزرابوون و هەر سەنگەرەی دەکەسی بۆ دانان. شەوی پاشتر کاتژمێر دووی بەیانی، هێرشی کرد و بۆ بەیانی ناڵا سپیەکە نەمابوو و هەمووی وەرگرتەوە. بۆ شەو حاجی بێرۆخی هاتەوە لای ئێمە و جەماعەتی شێخ زەیتوش هاتن و باوەشیان بەیەکداکرد.

مستەفا بەگ پاسەوانی تایبەتی مەلا مستەفا بوو، چاوێکی کوێربوو و کاتی خۆی لە ماڵی سالح بەگ لە شەقڵاوە یەکترمان بینیبوو. شەڕەکەی هەموو بۆ گێراینەوە کە چۆن هێرشیانکردوە و چوونەتە پێش. ئەو تفەنگی مامەند مەسیحی پێبوو و ووتی، مامەند مەسیح لە سەنگەر هاواری کرد "مەمکوژن ئەز بارزانیمە". ووتی منیش چەکم کرد، بەڵام کە دەستم دایە تفەنگەکەی، دەستم سوتا. منیش ووتم، "مامەند، ئەتۆ نازانی هەرچی تەقە بەرامبەر بارزانی بکا، کوشتنی حەڵالە"؟ مستەفا بەگ ووتی من قسەکانم تەواو نەکردبوو، کە هاوڕێکانم دە کەس بوون و دە تفەنگیان لێدا. لاشە و پارەکەیان دابوو بە کچەکەی، بەڵام تفەنگەکە بووە هی شۆڕش. پێش ئەو شەڕە، عیزەتی سلێمان بەگ، خەبەرێکی نهێنی بۆ ئێمە نارد کە ئەوان دێنە ڕێی زینێ سەران. داوای کرد کە ئێمە کەمین دابنێینەوە، چونکە پۆلیسان دێننێتە ئەوێ و هەموویان تەسلیم دەبن. ئێمەش بۆسەمان دانا و تا ئێوارە چاوەڕوان بووین، بەڵام کەس نەهات.

زۆر برسیمان ببوو، دوو ڕۆژ زیاتربوو بێ نان بووین و هیچمان بۆ نەهاتبوو. پێشتر من هەرکاتێك نانم زیادی بکردبایە، هەندێکم وورد وورد دەکرد و لە تورەکەم دەکرد بۆ ڕۆژێکی وەك ئەوڕۆژە. ووردە نانەکەم دابەشکردە سەر هاوسەنگەرەکانم، هەموویان لە خۆشی گەشبوونەوە. جەوهەر کاوانی تفەنگی لە پشتی کردەوە و ووتی، "پێشکەشتبێ، ئەتۆ ڕۆحی منت کڕیەوە". بەیانی چووینەوە پردی بەرسیرین، هەشت ڕۆژ لەوێ ماینەوە و پاشان چووینە سەری ڕۆڵەی. لە سەنگەرەکان  لە بەرامبەر پردی بەرسیرین دابەشبووین، کوڕەکانی دەرویش عەوڵاشمان لەگەڵ بوون. دەبابە هەتا پردەکە دەهاتن و بە ڕەشاش و تۆپ دەوروبەری ئێمەیان بۆمباراندەکرد. ئێمەش بە تفەنگ تەقەمان لێدەکردنەوە، بەڵام کار لە مەودای تفەنگ نەبوو، باشبوو جێگای ئێمە زۆر قایم بوو و زیانی پێنەگەیاندین.

من و برایمە خڕە و حەیدەر کاوانی و کەسێکی تر بە فەرمان چوینە گەڵاڵە. مەحمود ووتی کەسێك هەیە ڕەشاش و فیشەکێکی زۆری پولیسی لەلایە و دەبێ لێپێچینەوەی لەگەڵ بکەین. کە گەیشتینە ئەوێ، هێزی پێشمەرگەی پشدەریەکان لەوێ بوون، تەیارەش بەردەوام دەچوون و دەهاتن. ئەشکەوتەك دیاربوو، ئێمەش بەرەو ئەوێ چووین، بەڵام دیاربوو پڕببوو لە ژن و منداڵ. بە ناچاری گەڕاینەوە و بەرەو ماڵی مەحمود ئاغا چووین. کاتێك لەوێبوو، عەباسی باویلیان و چەند کەسێکی تریش لەوێ بوون. عەباس تفەنگێکی زۆر جوانی پێ بوو و دەیووت "١٣٠٠ دینارم پێداوە"! دووبارە تەیارە هاتنەوە و بە پەلە چووینە پەنا بەردێکی گەورە. تەیارەکان جۆری ئەلیوشین بوون، سێ بۆمیان بەردانەوە و یەکێکی لە ماڵی محمود ئاغا داو یەکێکیش لە بەردێکی نزیك ئێمە تەقیەوە، بەردەکە هەمووی بووە ساچمە. من لاق و سەرم بە ساچمەی بۆمبەکە کەمێك بریندار‌بوون و ئەوەی تەنیشت منیش سعاتی دەستی شکا، کوڕێکی تریش کەمێك برینداربوو. خۆشبەختانە کەس نەکوژرا. ئێوارە کابرامان دۆزیەوە، بەڵام هیچ چەکێکی لا نەبوو.

ئەو بارانە زۆرەی کە لە بەهار بارین، هاوینێکی میرشەڕەفی خۆشی بە دوای خۆی هێنا، گیا زۆر هەڵسابوو. مام عەدە و میرۆی خەیلانیمان لەگەڵدابوون، میرۆ هەر دەیووت، "ئای چیبکەم بۆ مەڕی چاو زەرد، لێرە با، ئەو گیایە جوانەی بخواردبا".

هێزی بارزانی دەوری قشلەی ڕایەتی دابوو، نزیکەی مانگێك بوو پۆلیسەك بە ناوی کەریم خۆرانی لەوێ بوو و تەسلیم نەدەبوو. لەوێ تەیارەکان چەکێکی زۆریان بە پەڕەشوت فڕێدابوو و زۆریان کەوتبونە دەست پێشمەرگە. بارزانی ڕەشاشێك و چەند تفەنگێك وە هەندێ فیشەکی لەوانە بۆ ناردین. ئەحمەد حاجی پۆلیس کە هاوڕێیەکی من بوو. پەڕەشوتێکی هەڵگرتبوەوە کە دەیان مەتر بەرینبوو.

لە ١٢ی تەموز، حکومەت سێ لیوای سەربازی هێنانە زێوە. ئەو ناوچەیە هەرلە هەندرێن تا کۆسپی سپی هەمووی لە ژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگە دابوو. بە تۆپی خەمسە خەمسە و هاوەن، لە سەری ڕۆڵە تاکو بەرسیرین هەمووی وەرد و شۆکرد. دەوڵەت تازە تۆپی ١٥٥ ملیمەتری بۆ هاتبوون و بە تۆپی خەمسە خەمسە بەناوبانگ بوون. ئێمە لە کۆسپی سپی بووین و بە دووربین تەماشامان دەکرد. پاش ماوەیەك هەرسێ لیوا هێرشیان هێنا و زۆر هاتنە پێش. نازانم چەند فەوجی جاشەکانیش لەهێرشەکە بەشدار بوون. هەرچەندە هێزی

نیمە زۆر بچوك بوو، بەڵام شەڕێکی زۆر گەرم لەو شەوە کرا و هێزی دوژمن شکا. تۆپێکی حکومەتیش بەهەڵە لەناو جاشەکان دراو و لەوانی پەرت وبڵاوکرد. عومەری مەلا زادە و رەشید کوڕی، دەورێکی باڵایان لەو شەڕە بینی. حکومەتی عێراق هەموو توانای خۆی بەکاردەهێنا بۆ گرتنەوەی باڵەکایەتی. ئەحمەد ساڵح عەبدی وەزیری بەرگری بوو، بەرنامەی دارێشتبوو کە بۆ ١٤ی تەموز، پێشمەرگە لە ڕایەت نەمێنێ، بەڵام پیلانەکەی سەرینەگرت.



وێنەیەکی کۆنی ناوچەی باڵەکایەتی

لەو ماوەیە چەندین هێرشی جیا جیا کران. هەرچەندە حکومەت توانای سەربازی زۆر لە نیمە زیاتربوو، بەڵام چونکە نیمە لە ناخەوە شەڕماندەکرد، تۆپ و تەیارە هیچی سودی بۆ دوژمن نەبوو. شەوێکیان، حکومەت توانی ئەو کەپکە بگرێ کە لە نێوان سەری ڕۆڵە و پردی بەرسیرین بوو. ئەو شوێنە زۆر ستراتیژی بوو، چونکە زاڵ بوو بەسەر جادەی هاملتۆن و تا زێوە و ڕووباری ڕوستێی هەموو لێ دیاربوو. دەبوایە شتێك بکەین ئەگەرنا پەکمان دەکەوت. شەوێك مەحمود کاوانی، هێزەکەی کردە سێ بەش و کەمینی لە هەردوو لای کەپکەکە دانا. خۆی و هەژدە کەس هێرشیکرد و کەپکەکەی وەرگرتەوە. ٤٢ سەرباز بەدیل گیران و سەربازێکی زۆریش خۆیان لە شاخ فڕێدا. لەو شەڕە زیانێکی زۆر بە هێزەکە گەیاندرا. بەداخەوە ئەو شەوە حاجی برایم ناژگەیی شەهید بوو، کوڕێکی تا بڵێی نازابوو. بەم سەرکەوتنە پێشمەرگە زۆر دڵخۆش بوو و چەك و ئەڵغام و تەقەمەنیەکی زۆرمان دەستکەوت. محمود کاوانی چەندین پارچە چەك و ڕەشاش و ئەلغام و زۆر شتی تری بۆ بارزانی نارد و دەیووت، "ئەو پێنج شەش پارچەی دابوون بە من، منیش زیاترم بۆ

ناردنەوە". زۆر پیاوێکی مەرد بوو، چەکی باشی بەسەر پیاوی ئازا دابەشکرد و منیش تفەنگێکی ئینگلیزیم بەرکەوت.

لەو داستانە، یەکێك لە گەورەترین قارەمانیەکانی شۆڕشی ئەیلولمان تۆمارکرد. بەر لەو شەوە و بۆ چەند ڕۆژی دوایی، بەرگەی هێرشە یەك لەدوای یەکەکانی دوژمنمان گرت. لەدوای ئەم سەرکەوتنە و هەتا ساڵی ۱۹۷۵، ئەم ناوچەیە بووە گەورەترین ناوچەی ئازادکراوی شۆڕش و بارەگای بارزانی و دەزگا سەرەکیەکانی شۆڕشی ئەیلول لەوێ جێگیرکران. لە گەرمەی بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی دوژمن لە شاخی کۆسپی سپی، ئەم چەند دێرە شیعرەم نوسین:

چل ڕۆژی تەواو بەس بە نان و ناو
ڕۆژی دوو نان و یەك مەتارە ناو
بە ڕۆژ لە سەنگەر دووربین لە بەرچاو
بە شەو چاوەڕێی دوژمن لە ناکاو
ڕزگاری کوردم دینیتە بەرچاو
زۆر جوان دیارنەبێ پیاو و ناپیاو

من دوای شەڕەکە لەگەڵ مەحمود چوومە ناوکێلەکان، بارەگای سەرەکیمان لە ئەشکەوتی خوارەوە بوو. ڕۆژنامەنوس هاتبوون و مقەدەم عەزیز ئاکرەییان لەگەڵ دانیشتبوو، تەیارەش هەر لەو ناوە دەسوڕا و بۆمبارانی دەکرد. حاجی شوکر گەرۆتەیی، کە خۆی و براکانی پێشمەرگەبوون، شەو بەرەو جێگای دیاریکراوی خۆی دەچێ، لە ڕێگا سەربازێك دەدۆزێتەوە کە لاقی شکاوە، دەست بەجێ دەیهێنێتەوە سەر جادە. ئاشەوانێکی شەلە لەو ناوە هەبوو، مەحمود داوای لێکرد سەربازەکە بباتەوە ئەودیو و سێ دیناریشی پێدان. سەرەتا، ئاشەوانەکە دەترسا لە جێبەجێکردنی ئەم کارە، بەڵام دوایی برینداریەکەی بە سواری کەر بردەوە و هەرزوو گەڕایەوە و پارەشیان دابوێ. ئەو ڕۆژە ڕۆژنامەنوسەکان پرسیاریان لە ئاشەوانکرد "کە بریندارەکەت بردەوە پرسیاری چیان لێکردی"؟ لە وەڵام ووتی "پرسیان چەند چەکدار لەوبەرن؟ منیش گوتم ۱۵۰۰"! ئیتر بوو بە پێکەنین و هەمووومان دەستخۆشیمان لێیکرد، چونکە ئێمە هەمووومان ۲۰۰ کەس نەدەبوین! مەحمود بۆ ڕۆژنامە نوسەکانی دەگێڕایەوە کە چۆن ئەو چیایەمان گرتەوە، ئەوانیش بەکامێرا و بەنوسین تۆماریان دەکرد.

دوای چەند ڕۆژ، مەحمود سەردانی بارزانی کرد و داوایکرد کە ئێمە بگەڕێینەوە خۆشناوەتی. هەروەها گووتبوی "بێخەمبن، ترسێکی باشم داوتە

عەسكەر و جارێكیتر هێرشناكاتەوە". بارزانیش پێكەنی بوو، چونكە زۆری مەحمود خۆشدەویست، پێشی گوتبوو "ئێوە بڕۆن و منیش دێم". بەرەو ڕەژیكەریان كەوتینە ڕێ و بەندكراوەكانیشمان پێبوون. بەیارێك لەسەر ڕێگای گوندبوو، پێشمەرگە ترێیەكی زۆریان لێكردەوە و خواردیان. خاوەنەكەی زۆر پێی ناخۆشبوو و منیش بەو كردارە زۆر توڕە بووم و داواملێكردن كە چیتر كاری وا نەكەن. بەرەو وەرتێ كەوتینە ڕێ، كە گەیشتین، لە مەكی دانیشتین و خەڵكی ئەوێ میوانداریێكی زۆر جوانیان كردین.

چووین بۆ كوێستانی كارۆخ، لەوێ بەفر لە چاڵە بەفرەكان هەڵدەگیران بە مەبەستی ناودان بە مەڕومالات. بەفرەكە دەهێننە دەرەوە و لەسەر بەرد دایدەنێن و چاڵێكیش لەخوارتر لێنەدەن بۆ ئەوەی ناوەكە لەناوی پەنگ بخواتەوە. بۆ سبەینەكەی، بەشێكمان لە گەرو مەنجەڵ بە قەدبڕ چووینە سایە و سێووكان. زۆر پێش ئەوانیتر كە چوونە ڕێگای زینی ئەستێرۆكان گەیشتینەجێ. دیمەنی ئەو كوێستانە زۆر جوان بوون. سەركەوتنەكانی ئێمە زۆر ناوبانگی دەركردبوو و دەگەیشتینە هەرشوێنێك، پێشوازیەكی زۆر گەرممان لێدەكرا. لەناو ڕەشماڵەكانی سایە و سێووكان دەستخۆشیەكی زۆریان لێكردین كە چەندین جار هێرشەكانی دوژمنمان شكاندوە و سەركەوتنی گەورەمان بەدەست هێناوە.

بەیانی چووینە گوندی هەرتەل، ئەو چیایەی كە بەسەر هەرتەل دەنواڕێ، چەندین ڕێگای تێدایە. لەوانە، دەرەدار و دەرەشێر و دەرەزێوە و دەرەهەرتەل. ئێمە لە دەرەهەرتەل هاتینە خوار و بەندكراوەكان ناردرانە بێتواتە. هەموو خەڵكی گوند داوەتێكی تایبەتیان كردین. لەبن دار گوێز و لەسەروچاوەی كانیاو، حەیوانێكی زۆر كوژرایەوە و پڵاوو و ساوار و مەرەگەیان لێنا. بۆ ئێوارەش، لە هەرتەل تا بالیسان دابەش بووین. هەر گوندێكی پێدا دەچووین، نانیان نامادەكردبوو. وەك بڵێی خەڵك متمانەیەكی بە شۆڕش پەیداكردبوەوە. دواتر ئێمە لە بالیسان جێنیش بووینەوە. كە ئێمە بۆ باڵەكایەتی چووین، بەهاربوو، بەڵام كە گەڕاینەوە نیوەی وەرزی هاوین ڕۆیشتبوو. ماوەیەك پشوماندا تاكو لەم ماندووبونە بحەسێینەوە، پاشان بەمەبەستی بینینی هاوڕێكانمان چووینە بێتواتە. زۆر لە هاوڕێیانی شەقڵاوە لەوێ مابوون وەك، ئەحمەد سەلیمە گردە، مام حەسەن ،حەمید قەساب كە لەگەڵ ئێمە هاتنەوە بۆ بالیسان. بەڵام پێش ئەوەی بچینەوە ئەوێ، چەند ڕۆژێك لە زێوە ماینەوە. جێگایەكی زۆرخۆش هەبوو، ناوێكی جوان و سازگار لە تاقی شاخ دەردەچوو كە پێیدەڵێن سولێێ زێوەی. لەوێ پشوماندا و كەمێك لەشمان هاتەوە سەرخۆ.

## ڕزگارکردنی دۆڵی هیران

لەو کاتەدا، بارزانی بە نهێنی هاتبووە ئەوناوە، بەڵام کەم کەس دەیزانی. دیاربوو پلانێکی ووردی دانابوو بۆ گرتنەوەی دۆڵی هیران و نازەنین. دوو ڕۆژ دوای گەڕانەوەمان بۆ بالیسان، فەرمانمان بۆهات کە بەرەو دۆڵی هیران بکەوینە ڕێ. بەڵام بارزانی مەحمود کاوانی لەگەڵ خۆی بردبوو و شارەزای تری ناوچەکەشی لەگەڵ بوون و بەرەو ئەوێ کەوتبوونە ڕێ. تا ئێمە گەیشتین، شەر دەستی پێکردبوو. لەسەر چیای هەورێ، سابیر کاوانی کوڕی کوێخا مستەفامان بینی، کە لەوێ دەهاتەوە و بارێك تفەنگی پێ بوو. پرسیاری شەڕەکەم لێی کرد، ووتی پێشمەرگە نەسپیندارە و هیرانی گرتوە و چەندین جاش کوژراون. کە گەیشتینە نەسپیندارە، حەیدەر کاوانی لەوێ بوو. دەوری کاتژمێر دوو بوو، دیار بوو بارەکە نارام ببوەوە. حەیدەر گووتی "شەڕکە لێرە بوو، پێنج تا شەش کەس کوژراون، هەرواها گوایا ناغایەکی خەڵکی هیرانیش کوژراوە. ئەمڕۆش تەیارەی عیراقی خۆی لە تەیارەی تورکیا داوە و لە کەومرتیان کەوتوە و فرۆکەوانەکەیان بردوە بۆ شەقڵاوە". دوایی دەرکەوت کە تەیارەکە بە دەستی پێشمەرگە یان بە هۆی کێشەی تەکنیکی کەوتبوو، فڕۆکەوانەکەش بیانی بوو و پێم وابێ ڕووس بوو.

بەیانی چووینە گوندی ناقوبان، مەحمود کاوانیش لەوێ بوو. ئێمە دابەشبووین بۆ سەر ڕەبایەکانی ئەو ناوە و جاشیش لە سەفین بوون. چەند ڕۆژێك لەوێ لە چاوەڕوانی هێرشی دوژمن بووین، بەڵام هێرش نەکرا. دوو فڕۆکەی مێك زۆر بە نزمی سێ جار چوون و هاتن، جاری چوارەم دەستیان بە ئاگرباران کرد. من لەسەر تیشی ناقوبان بووم و تەیارەکان زۆر نزمبوون. ڕیزە کەپرێکی ناقوبان هەبوو و هەرهەمووی گڕیگرت. هێندەی پێنەچوو، خالیدی حاجی مستەفای کاوانی هاواری کرد "مەحمود برینداره". مەحمود هێندە خۆشەویست بوو لەناو پێشمەرگە، کەسمان ئاگای لەخۆی نەما و هەموو بەرەو ئەوێ غارماندا. مەحمود لەبن دارگوێزەکان لەگەڵ سێ چوار کوێخای ناوچەکە کۆببوەوە. کە ئێمە گەیشتین، لەشی زۆر بە خوێن بوو، پشتی سەری سپی دەکرا، نازانم ساچمە بوو یان داری بەسەردا کەوتبوو. مەحمود لەسەر کانیەکە درێژکرابوو و چەند لاشەیەکیش لەوناوە کەوتبوون. مەحمود بە برینداری لاوکی دەگووتن "خەبەری بدەنە بابێ لوقمانی، ئەمن هێندە شڕنیمە". لە ناکاو عوسمان حوجرانی پەیدا بوو و زۆر بە تووڕەیی ووتی، ئەگەر ئێستا حکومەت هێرشی هێنا، چی دەکەین؟ باش بوو فڕۆکەکان نەگەڕانەوە، چونکە هەرچی پێشمەرگەبوو لەو ناوە کۆببوەوە. ئێمە هەشت تا نۆ شەقڵاوەیی بووین و مام حەسەن سەردەستەی ئێمە بوو. بەغاردان چووینە سەر ئەو تیشە سۆرکەی

بەرامبەر سپیگرە وچنێران و تا نێوارە لەوێ ماینەوە. مەحمود لە نێوان دوو خراری پڕ لە کا، لەسەر پشتی وولاغ بارکرا و بەرەو بێتواتە ڕەوانەکرا. بەداخەوە، دوای ماوەیەك بە برینداری شەهید بوو. لەدەستدانی ئەو کەڵەپیاوە، کەلێنێکی گەورەی لە ڕیزەکانی پێشمەرگە دروستکرد.

## ئازادکردنی سەفین

دوای برینداربونی مەحمود کاوانی، مقەدەم عەزیز عەقڕاوی کرایە فەرماندەی هێزی سەفین و لە تۆڵەی برینداربونی مەحمود کاوانی، بڕیاریدا سەفین لە جاش و خۆفرۆشان پاك بکاتەوە. مقەدەم عەزیز سەرکردەیەکی سەربازی بەتوانا بوو و کاری لەسەر پلانەکە کرد، خۆشی لە سەربازی تۆپهاوێژ(مەدفعی)بوو. خەڵکی ناوچەی سەفینی کۆکردەوە و پێی ووتن، ئێوە ئەبێ نانی پێشمەرگە بدەن و بەرنامەشی بۆ دانان. حەمید قەساب نامەیەکی ڕێکوپێکی نوسی و دایە دەست مقەدەم عەزیز و بۆی ڕونکردبوەوە کە ئەو ناوچەیە جاشی لێیە و ئەوانەی دەتوانن پشتیان پێببەستن کێن و ئەوانەی جێگەی باوەڕپێنەکردنین لای ئاشکرا کردبوون. بۆیە مقەدەم عەزیز باوەڕی زۆری خستە سەر ئێمە و نەخشەی ناوچەکەی هێنایەدەر و ئێمەش ناوچەکەمان بەتەواوی پیشاندا. چەند ڕۆژێکی پێچوو، کەریم زیارەتی لەگەڵ کوڕێکی کە پیاوی زۆر قارەمانبوون، بە مۆڵەت و بە نهێنی چووبونەوە زیارەت. کە هاتبوونەوە، لە کەپکی شیلان سەرکەوتبوون، پێنج کەپك ئەڕۆن و تفەنگ دەتەقێنن، دەبینن کەس لەم ناوە نەماوە. ئەو ناوچەیە پێشتر لەژێر دەستی جاشەکانی زیارەت بوو و ئەوانیش چووبونەوە ماڵ و چۆڵیان کردبوو. مقەدەم عەزیز کە ئەوەی زانی، دڵی زۆر خۆش بوو. ١٧ کەسی لە ئێمە دەستنیشانکرد کە بچینە گردی پونگینە، بۆ ئەوەی بەری پشتەوەی هێرشەکە قایم بکەین، ئەوەکو جاشەکان پشتمان لێبگرن و لەوناوە دوریان بخەینەوە. ئەوانەی لەبیرمن، ئەحمد زەخۆك، برایمە خڕە، مام حسن، عەزیزی فاتە قەڵەوێ، عەزیز دەربەندی، باوەکرە سور، قادر مەنتك، مستەفا خەتی.

مستەفا خەتی سێ یان چوار ڕۆژ بوو لە سەربازگەی دۆکان ڕایکردبوو و پەیوەندی بە دەستەی ئێمە کردبوو. ڕەشاشێك و ٦٠٠ فیشەك، لەگەڵ تفەنگ و دەمانچەیەکی لەگەڵ خۆی بردبوو. بەڵام سەربازەکانی تر پێیان زانی بوو و کەوتبونە شوێنی. ئەویش خۆی لە چیا قایم کردبوو و هەتا شەوی بەسەردا هاتبوو، بە تەنیا شەڕێکی زۆری کردبوو. لەو هەموو تەقەمەنیە، تەنها ٢٠

گولەیەکی پێمابوو. تفەنگەکەی جێهێشتبوو و ڕەشاشەکە و دەمانچەکەی هێنا و بوە پێشمەرگە.



ریزی پێشەوە لە ڕاستەوە: دووەم حەمید قەساب، چوارەم قادر گوزێ، ئەوانیتر نەناسراون

ئێمە بە شەو سەرکەوتین تا گەیشتینە کەپکی شیلان. بۆ بەیانی زیاتر چووینە پێش و چاروبار تەقەماندەکرد، بەڵام هیچ وەڵام نەبوو. بەشێکمان گەڕاینەوە بۆ گۆڕاییەکەی کەپکی زاواوبوکان. مقەدەم عزیز پێ گووتبووین، ئەگەر ئەو ناوەتان پاککردەوە، ئاگرەکی بکەنەوە. بۆیە شەو ئاگرمان لەسەر بەرزایەك کردەوە. بەیانی زوو دیسان بووە تەقە و ئێمە بەپەلە بەهانای هاوسەنگەرەکانمان چووین. عەزیزی فاتەقەرەومان بینی بەرەو ئێمە دەهات، گووتی "ئێمە سێ چوار کەپك چووینە پێش، لەناکاو بەسەر جاشەکان هەڵبووین". دوای ئەوەی ئێمە چووین، چوار کەپکی تریشمان پێ چۆڵکردن. باوەکر کابرایەکی زۆر ووریا بوو، هەرهاواری دەکرد "ها وەبەردا، ها وەبەردا". ئێمە کەسیشمان لەلای خوارەوە نەبوو، بەڵام جاشەکانی ترساندن و وایان زانی لە خوارەوە هێزێکی زۆری لێیە و پشتیان دەگرین.

ئێمە، ئەو ١٧ کەسە، زۆر بێباکانە و بەڕاکردن کەوتبووینە دوای جاشەکان و زۆر لێیان نزیك بووینەوە. بەڵام شەش کەسمان لەپێش ئەوانیتر بووین. لە ناکاو، کۆمەڵێك جاش لە ترسی ئەوەی ئەوەکا بە دەست بیانگرین، لێمان ڕەوینەوە. پارچە شاخەك کەوتە نێوان هەردوو لامان. ئەوان کەوتنە بڵندی و ئێمەش لە خواروی ئەوان کەوتینە قوڵایی. پارچە شاخەکە چەمابووەوە و پێنج کەس کەوتنە پەنای شاخ و لە جاشەکان دیار نەبوون. منیش بە تەنیا لە سەرووی ئەوان بووم و بەردێکی نزمی نزیکەی مەترێك بڵند لە پێشم بوو. پشتەوەشم هەرشاخ بوو و بەحاڵ جێگەم بوەوە، بەڵام ڕووم لە جاشەکان بوو.

هەرلە بەیانی تاکو شەو، لەوێ گیربووین و تەقەمان لەسەربوو. جاشەکان نەدەوێران پاشەکشە بکەن، چونکە هەموو هێزەکەی ئەوان ڕایکردبوو و کەس بەهانایان نەهات. شوێنەکەی ئێمەش بە جۆرێك هەڵکەوتبوو کە نەك هەرنەمان دەتوانی بەرەو پێش بچین، بەڵکو ئەشمان دەتوانی لە شوێنی خۆمان بێینەدەر. ئەو شوێنە زۆر ناخۆشبوو و جێگاکەی منیش زۆر تەسك بوو، بەڵام تەنها من دەمتوانی تەقە بکەم. لەبەر چەمانەوەی شاخەکە، ئەوانی تر کەس تەقەیان پێنەدکرا. من ئەو ڕۆژە ١٤ پاکەت فیشەکم تەقاندن و توانیم جاشەکان ڕابگرم لە هاتنە پێش. جاشەکان هاواریان دەکرد و قسەی ئەشیاویان بە شۆڕش و کوردایەتی دەگووت. عەزیزی فاتە قەرەوێش هاواری دەکرد "قادر بێ دەنگیان بکە". منیش بە تەقە وەڵامم دەدانەوە و ئەوانیش دەوروبەری ئێمەیان گوللە باران دەکردەوە. ئەو ڕۆژە سەدان گوللە لەو شاخەی پشت سەری من درا. من ناوم پێ نەمابوو، لە تینویان قوڕگم وەك بەردەکانی پێشم ووشك ببوو.

مستەفا خەتی لەقوڵێکی تر بوو و ڕەشاشی پێبوو. ئەویش نزیکەی ٤٠٠ گوللەی تەقاندبوو، بەڵام هەزار مەخابن ئەو ڕۆژە مستەفا شەهید بوو. جاشەکان لە سەرەوە تانیان لەخۆیان ئەدان و دەیانگووت "ئەگەر ئێوە بارزانینە، وەرنە مەیدانێ". یەکێك لەوانەی ئێمە گووتی "ئێمە بارزانینە". من زۆرم پێ ناخۆش بوو و گووتم "بۆ پیاوەتی خۆت نەکەیە هی خەڵکی تر"! دوایی وەڵامم دایەوە و گووتم ئێمە خۆشناوین. یەکێك لە جاشەکان گووتی "من دوڵەمەریمە، خەڵکی لای مێرگەسۆرم".

بۆ ئێوارە، هێزێکی ئێمە لە ناقوبان بەهانامان هات و تەقەیەکی زۆر دەستی پێکرد، جاشەکانیش بە تاریکی لە شوێنی خۆیان هەستان و ڕایانکرد. بە داخەوە دەروێش عەوڵا لەو شەڕە برینداربوو، و دواتر زانیمان کە مستەفا لە قوڵەکەی تر شەهیدبووە. مستەفا فیشەکێکی بەسەر کەوتبوو و ئێمە بە هەواڵی شەهیدبوونی ئەو زۆر دڵ تەنگ بووین. تەمەنی پێشمەرگایەتی مستەفا زۆر کورتبوو، بەڵام بەڕاستی پیاوێکی شەڕکەربوو. بۆ بەیانی، تەرمی مستەفامان بە شێوەیەکی کاتی بە خاك سپارد و دوایی گواسترایەوە بۆ ناو گۆڕستانی گوند.

هەر ئەو بەیانیە، چووینە ئەو شوێنەی جاشەکان تەقەیان لە ئێمەدەکرد، لەوانەیە پتر لە دووهەزار قەوانەی گوللەی لێکەوتبوو و لە پێنج شوێن تەقە کرابوو. دیاربوو دوو ڕەشاش و سێ تفەنگ تەقەیان کردبوو. بۆ پاش نیوەڕۆ ئێمە زیاتر چووینە پێش تا نزیك کانی گوێزمان کۆنترۆلکرد. لەو کاتە، هەواڵی شەهیدبوونی مەحمود گەیشتبوو، بەڵام لەبەر وورەی پێشمەرگە باسیان نەکرد. دوای چەند ڕۆژێك، مقەدەم عزیز و بەکر ئاغا و چەند کەسێکی تر کە

ناوەکانیانم بیر نەماوە، هەموو پێشمەرگەیان کۆکردنەوە و ووتیان بەبێ پرسی بارزانی، کە هێشتا لە هیران بوو، شەڕێك نەکەین و هەوڵ نەدەین سەفین بگرین. مام حەسەن نەخۆش بوو نەیتوانی سەردەستایەتی ئێمەبکا. خالید مامەجەلکەیی کوڕێکی زۆر نازابوو، بۆیە ئەومان هەڵبژارد کە سەردەستەی ئێمە بێ. بەیانیەکەی بەرەو سەفین کەوتینە ڕێ و کە گەیشتینە سەر بەرزایی، کۆمەڵێك پێشمەرگەی تریش هاتن.

هێزەکە بۆ سێ قۆڵ دابەش کرا و کەپکی خۆران بۆ ئێمە داندرا. ئێمە هەرزوو کەپکی خۆرانمان گرت. بە دووربین تەماشامانکرد هێزێکی زۆری جاشەکان لە کەپکی دارنازێ ڕیز ببوون وئێمەش سەنگەرمان بەرامبەریان دامەزراند. هێزەکەی تر هێرشی کردە سەر کەپکی دارناز و جاشەکان شکان. ئێمە دوو دەستەی بچوك بووین و لەناکاو جاشەکان ڕۆیان لە ئێمە کرد. زۆر لە پێشمەرگەکان شوێنی خۆیان بەجێ هێشت. کوڕێك کە گولەی ڕەشاشی پێبوون، خەریکبوو سەنگەر بەجێ بێڵێ. من زۆر لێی قەڵسبووم و پێم گووت ئەگەر بڕۆی، تەقەت لێدەکەم، بەڵام کاری نەکرد و ڕۆی. دەستەی ئێمە توانیمان بۆ ماوەیەك بەرگری بکەین، بەڵام هێزەکەی دوژمن یەکجار زۆربوو و خەریك بوو دەورەمان بدەن. کار لەوەدا نەما و برادەران یەك یەك پاشەکشەیان کرد. لەو ڕۆژە ساچمەیەکی بەرد بەر پەنجەی دەستم کەوت و ئینۆکەکەی هەڵگرتم، ناچار منیش لە دوای هەموویان ڕۆیشتم.

پەریمەوە بەرزاییەکەی ئەوبەر، گەیشتمە پێشمەرگەیەك لە ژێر دارێك کەوتبوو و هێزی لێبڕابوو. ئەو کوڕێکی بادینی بوو و تازە لە سەربازی ڕایکردبوو. هاوەنێکی پێبوو گووتی، "ئاقێ بدەمن". کەمێك ئاوم پێبوو و خواردیەوە. برادەران هەموویان ڕۆیشتبوون، من و ئەو بادینیە کەمێك بەیەکەوە ڕۆیشتین. بەڵام ئەمجارە من هێزم لەبەر بڕاو خەریك بوو دەکەوتم، بە کابرام گووت تۆ بڕۆ. من توانام نەمابوو بڕۆم و ماوەیەك لەوێ مامەوە. کوڕێکی سپیگرەیی بەلامدا تێپەڕی، پێم گووت وەرە با هەتا شەو لێرەبین، ئینجا دەردەچین. بەڵام ئەو گەنج بوو، ڕۆیشت و گوێی پێنەدام. منیش زۆر لەسەرخۆ و بە تەنیا ڕۆیشتم و لە هەموو لایەك گولە باران دەکرام. ئەو ڕۆژە زۆر بێ هیوا بووم لە ژیان، ماندوو و برسیەتیش سەربار و بنبار. شەهادەم هێنا و بەتەمای خوای گەورە لێیگەڕام. دوو تەیارەی مێك هاتن و ئەو کەپکانەیان بۆردومانکردن کە ئێمە پێشتر لەسەریان بووین. پێموابێ ئەو بەسەرهاتە مانگی دە بوو، چونکە بەناو بەیاری ترێ دەڕۆیشتم و ترێ نەمابوو. گەیشتمەوە کابرای بادینی، خۆی لە لایەك کەوتبوو و هاوەنەکەش لەلایەکی تر. ووتی "ئەزێ دێ مرم، من گەلەکی تێنیە". گوتم منیش تینومە. بۆ ئەوەی وورەی بەرزبێتەوە، گووتم لە

پشت ئەو گردە ئاو هەیە. دیاربوو کاری لێکرد و هەڵسایەوە، هاوەنەکەشم هەڵگرتەوە تا بۆ دوژمن جێ نەمێنێ. بە حاڵ گەیشتینە کانی گوڵان. کانیەکە بەخۆی ئاوی زۆر کەم بوو و هێزەکەی ئێمەش پێشی ئێمە گەیشتبونە ئاوەکە. کە من و ئەو کوڕە بادینیە گەیشتین، کانیەکە تەنیا هەندێ قوڕاوی تێدامابوو. دەومان بە قوڕاوەکە نا و خواردمانەوە تا کەوتین.

من و هاوڕێیانم یەکترمان گرتەوە و بەرەو کەپکی شیلان کەوتینە ڕێ. دیاربوو هێزەکەی تری پێشمەرگە لەو ناوە سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو و کەپکی دارنازیشیان کۆنترۆڵ کردبوو. هێزەکان لەوێ کۆبونەوە و دەرکەوت کە شەش پێشمەرگە شەهید ببوون. لە بیرمە عەزیز سولی، کە خەڵکی هەریر بوو، یەکێك بوو لەو شەهیدانە و بریندارێشمان هەبوون.

ڕەشید سندی مولازمێکی دوو ئەستێرەی خەڵکی ئەتروش بوو و قیادەی ئەو ناوەی دەکرد. پیاوێکی زۆر چاونەترس بوو. لەبەر خاتری ئەو شەڕانەی سەفین، کوڕەکەی خۆی ناولێنا سەفین. سەفینی کوڕی لەگەڵ ئێمە هاتە ئەمریکا و لە ئەمریکا کۆلێجی پزیشکی تەواو کرد. ڕەشید سندی، کاتیخۆی لەگەڵ سەرداری عەلی ئەفەندی شەقڵاوە بەیەکەوە ئەفسەربوون وە ئەو ڕەوانەی پێشمەرگایەتی کردبوو، چونکە سەردار ئەوکات لە ڕێکخستن کاریدەکرد.

بۆ بەیانی مقەدەم، عزیز ئێمەی نارد پشوویەك بدەین، دیاربوو ڕەشید سندی پێی گوتبوو کە دەستەی خالید مامەجەلکەیی دەست و بردێکی باشیان کردوە. بۆیە ئێمەی ناردە هیران کە دوو ڕۆژ بمێنینەوە. ئێمە شەش کەس بووین و کەوتینە ڕێ بەرەو هیران. لەوێ چووینە ماڵێك، داوامان لێکردن ئەگەر بکرێ جلەکانمان بۆ بشۆن، بەڵام تەنها تەڕیان کردن و هەڵیانخستن. بۆ نیوەڕۆ، ساوارێکی بێ خوێ و بێ چەوریان لە پێش داناین. ئەو ماڵە کوڕێکیان پۆلیس بوو، دیاربوو ڕقی زۆریان لە پێشمەرگە بوو. بۆ سەردانی بریندارەکان، چووینە نەخۆشخانەی هیران و ئەوانمان بەسەرکردنەوە. هەرلە نزیك هیران لە گوندی دۆرێ چووینە ماڵێك و پارەمان بە منداڵەکەیان نارد کە مریشکێکمان بۆ بکرن تا بەیەکەوە بیخۆین.

لەو سەردانە، چاومان بەکاك سدیق هیرانی کەوت. گوتی حکومەت مەلا و فەقێ و پیاوی ماقوڵی شەقڵاوەی بە زۆر ناردون. بەڵام پێشمەرگە نەیان هێشتوە هەموویان بێن، تەنها مەلا هادی و مەلا عەوڵای موفتی مۆڵەت درابوون بۆ ئەوەی لاشەی جاشەکەن ببەنەوە. ئێمە لە کەپکی دارنازێ شەش شەهیدمان

دابوون، هەندێك جاشیش کوژرابوون و جەنازەکانیان کەوتبوە دەست پێشمەرگە. لەوێ ڕۆیشتین و گەیشتینە هاوڕێیانی خۆمان لە نێوان ئاقوبان و چنێران، ووتیان تازە مەلا هادی و مەلا عەوڵا لێرە ڕۆیشتن. منیش زۆر بە پەلە بەرەو ئەوان ڕامکرد تا بگەمەوە ئەوان. پێشتر پێشمەرگەکان هەڕەشەیان لێکردبوون کە دەبێ بڕۆن ئەگەر نا ئەیانکوژن! کە بینیان پیاوێکی چەکدار بەرەو ئەوان ڕادەکا، زۆر دڵ تەنگ و حەپەسابوون. کەمێکی تر چوومە پێش، ئینجا منیان ناسیەوە. مەلا هادی خزمی ئێمە بوو، کە منی بەم شێوەیە بینی، گریانی بۆم هات. منیش گووتم مامۆستا دڵگیرمەبە، من بە ویستی خۆم پەیوەندیم بە هێزی پێشمەرگە کردوە. ڕاستە ماندوو دیارم و جلەکانم دڕاون، بەڵام من بە دڵ لەگەڵ شۆڕشدام. گووتی ئەدی ئەو ماڵ و منداڵانەت؟ گووتم کەس زۆری لە من نەکردوە کە ماڵ و منداڵم بەجێبێڵم. تکام لێکرد کە بۆ من خەمبار نەبێ. بەڵام گووتم پرسیارێکم بۆت هەیە، تکایە بە دروستی وەڵامم بدەوە. ئایا باوکم لەژیاندا ماوە یان نا؟ ساڵێك زیاتر بوو کە هیچ خەبەری ماڵەوەم نەبوو. لە وەڵامدا گووتی، پێش دوو ڕۆژ لەلای بووم و زۆر باشە. هەموو ئاواتی من ئەوەبوو جارێکی تر باوکم ببینمەوە.

گەڕاینەوە بۆ سەفین و نۆبەتمان لە کەپکی دارناز بۆ داندرا، عەزیز دەربەندیش کرا بە سەردەستەمان. ئەو کەپکە جێگایەکی زۆر هەستیاربوو. هیچ خواردنیشمان بۆ دابین نەکرا، ناچار کۆنە سەمونی ترشاوی جاشانمان هەڵدەگرتنەوە. سەمونەکان لە ڕەقی نەدەخوران، بۆیە بە بەرد ووردماندەکردن، ئینجا دەمانخواردن. ڕێگەی چاڵە بەفری دارمازیش لە نزیك ئێمەبوو. ئەم چاڵە بەفرە لە شوێنێکی قووڵ بوو و گەورەترین چاڵە بەفری چیای سەفین بوو. هاوینان بارە بەفرێکی زۆر لەم چاڵە دەبردرایە هەولێر بۆ فرۆشتن. هەروەك پێشتریش باسمکرد من دۆستایەتیم لەگەڵ شیعر و ئەدەب هەبوو و هەندێ شیعری سادەشم هەن و ئەو ڕۆژە ئەم چەند دێرەی خوارەوەم نوسین:

ڕادەبوێرم ڕووت و برسی
گوێ نادەمە هیچ مەترسی
کورد نافرۆشم بە فلوسی
مێژووش ئەمانە دەنوسی

ڕۆژێك مقەدەم عزیز سەردانیکردین، دیاربوو ناوی پێنەمابوو و منیش مەتارە ناوەکەی خۆم دایێ. ووتی ئەتوش وەکو منی، بۆ ئاوی خۆت دەدەیە من؟ گوتم خەم مەخۆ ئاو لێرە زۆرە. مقەدەم عەزیزم بردە سەرچاڵی دارمازی و بەفرم

پیشاندا. هەندێك بەفرمان لەسەر دوو دار دانا و ناوەکەی چۆڕایەوە، مقەدەم عەزیز مەتارەکەی پڕکرد و زۆر دڵخۆش بوو. من جلەکانم زۆر خراپ بوون، ئەویش جلەکانی وەك من خراپ و دڕابوون. کە چاوی بەجلی من کەوت ووتی قادر، دەزانم بارودۆخمان زۆرخراپە، بەڵام چاری هیچمان پێ ناکرێ.

ئەو کات بەشی زۆری سەفین کەوتبوە دەست پێشمەرگە. پاش نیوەڕۆیەك مقەدەم عەزیز پێشمەرگەی کۆکردنەوە کە ٦٠-٧٠ پێشمەرگە دەبووین و بەرەو ڕەشە دۆڵ چووینە خوارەوە. بارانیش دەباری و شەوێکی زۆر ساردبوو. لە ژێر تاوێرە بەردێك ئاگرم کردەوە. مقەدەم عەزیز هاتە لام و پشتی دایە ئاگر و جلەکانی ووشك کردنەوە. پێش ڕۆژهەڵات کەوتینەوە ڕێ تا گەیشتینە هەرکەوی دووپشك، بەرامبەر کێلی گیسکان. لەوێ پشوێکماندا و مقەدەم عزیز ووتارێکی دوور و درێژی بۆ داین. گووتی، "ئێمە بۆ دانیشتن نەهاتوین، ناکرێ هەر لێرە بمێنینەوە، سەفین قەڵایە و دەبێ لێرەوە دەربچین و زەبر لە حکومەت بوەشێنین. دەبێ نان پەیدابکەین و بێینەوە قەڵای خۆمان. دەبێ دوژمن هەڵپێچین".

## پاککردنەوەی پاش سەفین

مەفرەزەك لەگەڵ مقەدەم عەزیز چوون بۆ دەشتی کۆیە بۆ لای حەمەد ئاغای پەلکەڕەش و گوندەکانی ئەو ناوە. لە هاتنەوە پەخەی قشلەی دەربەندی گۆمەسپانیان گرتبوو، ئەوانیش تەسلیم نەببوون. بەدوای ئێمەدا هات و پەنجا کەسەك لەگەڵی ڕۆیشتین. تەیارەش لەسەر سەرمان دەسوڕا، کە دەهات خۆمان حەشاردەدا و کە دەڕۆیشت دەکەوتینەوە ڕێ، تا گەیشتینە دەربەند. من و مقەدەم عەزیز و أحمد زمخۆك ئەو تیشەی سەر دەربەندمان گرت لە بەرامبەر قشڵە. ئەوان هەردووکیان برنۆیان پێبوو، منیش چەکێکی ئینگلیزیم پێ بوو. ئێمە بۆسەمان دانابوو ئەوەك دوژمن هێزی زیاتر بە هانای قشلە بنێرێ. لەو کاتەدا تەیارە بە هەڵە بۆردومانی فەوجێکی جاشەکانی کرد و جاشێکی زیارەتی کوشت کە زۆر ناسراو بوو. هێزەکەی دوژمن ڕەویەوە و پۆلیسەکانی ناو قشلەش هەڵاتنەدەرەوە و کەوتنەبەر دەستڕێژی پێشمەرگە. لەناکاو بانگیان کرد وەرنە خوارێ، بریندار هەنە. هەرچەندە شوێنی ئێمە زۆر لێژبوو، بەڵام ئەحمەد زمخۆك گەنج بوو و بەغاردان چووە خوارەوە. من و مقەدەم عەزیزیش بەیەکەوە و بەپەلە دەچووینە خوارێ، بەڵام ئەو پیاوێکی قەڵەوبوو و لێنەدەگەرا منیش بڕۆم. هەردەقەیە و هەڵدەخلیسکا و دەیگووت کێ بریندارە؟ منیش لەگەڵ ئەوبووم و وەك ئەو نەمدەزانی! دوای ئەوەی چەندین جار ئەو

پرسیارەی دووبارە کردەوە، بەدەست خۆم نەبوو توڕەبووم و پێمگووت، ئەدی ئەمنیش لەگەڵ تۆ نیمە؟ دوایی زۆر پەشیمان بومەوە، چونکە ئەو فەرماندەیەکی زۆر قارەمان و خەمخۆرێکی گەورەی پێشمەرگە بوو. کە گەیشتینە خوارەوە، پێشمەرگەکان دەوری ۱۲ پۆلیس و رەئیس عورەفایەکیان دابوو و یەك لە پۆلیسەکانیش برینداربوو. کە مقەدەم عەزیز بینی بریندارەکە پێشمەرگە نەبوو، وەك گوڵ گەشبوەوە. هەندێك لە پۆلیسەکان دەرباز ببوون و ئەو کۆمەڵەش بەدەم ڕووبار چووبونە خوارەوە و گیرابوون.

مقەدەم عەزیز پرسیاری لە رەئیس عورەفایەکە کرد و ووتی، "فەوزی، چەندجار خەبەرم بۆ ناردی کە تەسلیم ببی و لە سەر شەڕەفی بارزانی هیچت لێناکەین"؟ گوتی قوربان خاوەن ماڵ و منداڵم. پێشمەرگەیەك تفێکی لێکرد، بەڵام مقەدەم عەزیز زۆر خۆی لە پشمەرگەکە توڕەکرد. ناوی هەموویانی پرسی، کە گەیشتە یەکێکیان، وەڵامی نەدایەوە. دوایی بە عەرەبی ووتی من عەرەبم. مقەدەم عەزیز چەند جارێك ووتی، "ئەتۆ سەر چاوی من، سەر سەری من، ئەتۆ حەقی خۆتە، بەڵام ئەوانەی کە کوردن دەبوو تەسلیم ببان". دواتر هەربە ناوی کوردایەتی، هەموومان ئازادکردن. قشڵە گیرا و تا ئێمە گەیشتین، چەك و تەقەمەنی هەمووی بردرابوو. بەتانی و شت مابوو، من تەنها موشەمایەکم هێنا کە بۆ باران بەخۆم دابدەم.

من هاشم ناقووبانیم زۆر خۆش دەویست ونیستاش هەرلام خۆشەویستە، ئەویش ڕێزی منی زۆر لەلابوو. پیاوێکی هەتا بڵێی ئازابوو و لە زۆربەی شەڕەکان لە ڕێزی پێشەوە بوو. کە پەیوەندی بە پێشمەرگە کرد، هاشم زۆر گەنج بوو و تفەنگی باوکی خۆی هێنابوو. ئەو شەوە لە قشڵە تفەنگێکی هێنابوو و پرسیاری لە منکرد "مام قادر، ڕات چیە تفەنگی باوکم دابنێم و ئەوەی شۆڕش هەڵگرم"؟ منیش گووتم، "کوڕم، تفەنگی خۆت هی خۆتە و کەس ناتوانێ لێتبستێنێ، بەڵام ئەوەیتر موڵکی شۆڕشە، تفەنگی خۆشت لەوەی تر باشترە". دیاربوو ئامۆژگاریەکەی بە باش زانی و چەکەکەی تری ڕادەستی شۆڕش کردەوە.

هەموومان گەڕاینەوە سەفین. ئێمە، جەمەعاتی عەزیز دەربندی، لە سەری سەفین بووین لە نزیك خۆران. مەحمود دەبۆیەکمان لەگەڵدابوو خەڵکی گوێر بوو. عەرەب بوو، بەڵام کوردیەکی باشی دەزانی و زۆر قسە خۆش بوو. دەنگێکی زۆر خۆشیشی هەبوو، ڕۆژانە بانگی نوێژی بۆ ئەداین. ڕۆژێك هێزێکی دوژمن بە چەند جێبێك بۆ پشتی خۆران هێرشیان هێنا. ئێمەش وردە وردە بۆیان چووینە خوارەوە بووە شەڕێکی گەورە. هەموو پێشمەرگە هاتنە

خواریَ و مقەدەم عەزیزیش لەلای زیارەتی بەهاوەن هێرشی کردنە سەر و بەخۆی هاوەنی دەتەقاندن. ئێمەش هاتینە خوارەوە تا سەر خۆران. شاکربەگی شانەشانی گەردیش لەگەڵ ئێمە بوو. بەڕاستی پیاوەکی هێمن و زۆر تێگەیشتو بوو، لە شەڕیش لەئێمە زۆر زاناتر بوو. یەك لە پێشمەرگەکان لە گەرمەی شەڕ شوێنی خۆی بەردا و لە هێزەکەی دوژمن دیاربوو. شاکربەگ ووتی کوڕە ئەکەی هەنوکە ئەکوژرێی. ئەو پێشمەرگەیە لەوبەری بوو وە دۆڵێکمان لەمابەین بوو، بەڵام دەنگمان ئەیگەیشتێ. باش بوو دانیشت ئەگەرنا ئەکوژرا. شەڕەکە ماوەیێکی خایاند، دواتر جاشەکان پاشەکشەیانکرد. مقدەم عەزیزیش بە هاوەن کەوتە دوایان هەتا تەقە بڕا.

حکومەت دەستیکرد بە تۆپبارانێکی خەستی ناوچەکە. سەربانەکانی خۆران هەمووی کەپربوون و گیایان لە سەربوو. کەپرەکان یەك پارچە ئاگریانگرت و مەنجەنیقێك دروست بوو، ئەوسەری دیارنەبی. دوای ماوەیەك مقەدەم عەزیز گەڕاوە و ئاگرەکەی بینی، گووتی بابە گوڕ گوڕە! ئێمە هەموو لە مەکتەبی خۆران خڕببوینەوە، دووبارە حکومەت لە شەقڵاوە دەستی بە تۆپبارانکرد. دوو تۆپی زۆر لە نزیکی ئێمەدان، بەڵام تۆپی سێیەمی لە ناو مەکتەبدا. خوا ڕەحمی کرد نەتەقیەوە، ئەگەرنا هەموومان دەکوژراین. لەبەر تۆپباران و ئاگر، ناچاربووین خۆران چۆڵبکەین، بەڵام هێزی حکومەت و جاش نەیانتوانی جارێکی تر بگەڕێنەوە خۆران.

یەك دوو ڕۆژ دواتر هاتینەوە خۆران، مستەفا مەلا قادر بالیسانیشمان لەگەڵ بوو. چووینە خانیەکی دوو هۆدە پڕو پڕی باوی بوون، بەڵام هەمووی لە جێی خۆی سوتابوون. شانەی مێش هەنگوینیش سوتابوون و هەنگوینەکەی دەردابوو. مستەفا گووتی ئەمن ئەو هەنگوینەی دەخۆم. پێمان گووت کوڕە مەخۆ، گەرمە، خراپە، بەڵام هەرخواردی و زۆریشی خوارد. نازانم چۆن باسبکەم کە چی بەسەرهات! جەماعەت هەموویان ڕۆیشتن و کەس لەگەڵ ئێمە نەما، بەڵام من دڵم نەهات بەجێی بێڵم. مستەفا هەردەیگووت ئەمرم! ئەو هەموو هەنگوینە گەرمەی خواردبوو، لەشی زۆر گەرم داهاتبوو. هەرچەندە سەرمابوو، بەڵام جلەکانیم لەبەرداکەندن و هەتا ملی لەناو حەوزی مزگەوتم نا. لە دڵی خۆم گووتم دەمرێ، بەڵام خواکردی بەو ئاوەی بڕەك چاکتربوو. ئێوارەمان بەسەرداهات و هەتا بەسەریشم خستەوە بۆ سەر سەفین، بووە نیوەی شەو، چونکە هەرسێ شەقاوان دەڕۆیشت و پشی هەردەما.

شەڕێك لە گوندی شەرەبوت دەستی پێکرد، عەشیرەتی سۆفیان دەیانەویست ئەو ناوە داگیربکەن و مەڕوماڵاتیان لەوێ بەخێوبکەن. فەرمان بۆ ئێمە هات کە بەهانای ئەو شەڕە بچین. پاش نیوەڕۆ بوو کە لە سەفین دەرچووین، بۆ شەو

گەیشتینە دەربەندی گۆمەسپان و تەقە کەم ببوو. بۆیە شەو لەوێ ماینەوە، بەڵام زۆر نازارمان بینی. ڕەشەبایەکی بەهێز دەهات، سەرمابوو و هیچیشمان پێ نەبوو. لە دەربەندی گۆمەسپان، کە شەو دادێ و هەتا ڕۆژهەڵات، هەڵدەکاتە بایەکی زۆر بەهێز. لە کۆن گووتویانە "ئەگەر پێتنەکرا بچیە کوێستانێ، هەروەها (برۆ) دەربەندی گۆمەسپانێ"، چونکە لە هاوین شوێنێکی زۆر فێنك وخۆشە. کاتژمێر ١٠ی شەو، تەرمی پێشمەرگەیەکیان هێنایەوە و ووتیان سۆفی شکان. دەنگۆ هەبوو کە دایکی شەهیدەکە خەڵکی شەقڵاوەیە و خوشکی بەکری سەڵتەیە. کە بینیم، ناسیمەوە. کوڕێك هەبوو بە ناوی شەریف، برای (گوارە)ی خێزانی عەوڵا ڕەش بوو، کە لە کۆن جیرانی من بوون. ئەو تەرمە، ئەحمەدی کوڕی ئەو بوو. تەرمەکەمان لە ووڵاغ بارکرد و بردیانە زیارەت و لەوێ بە خاك سپێردرا. من و هاوڕێکانیشم بۆ بەیانی لە گۆمەسپان گەڕاینەوە بۆ سەفین.

دەور سوڕا و بووە مفاوەزات، لە ڕۆژێکی بەهار، لە سەفین دابەزیم بۆ شەقڵاوە. لە سەربانی چایخانەی لای مزگەوتی گەورە دانیشتبووم، ئەو شەریفە هات و لەلام دانیشت. شەش ساڵێك دەبوو شەریفم نەدیتبوو. پاش چاك و چۆنی ووتی، کەوتومەتە دڵتەنگیەکی یەکجار زۆر، خەریکە شێت ئەبم. منیش گوتم خێرە؟ ووتی کوڕێکم پێشمەرگەبوو و چەند ساڵە دیارنیە، دەچمە بادینان، دەڵێن لە باڵەکایەتیە. دەچمە ئەوێ دەڵێن لە خۆشناوەتیە. لەوێش دەڵێن لە دەشتی هەولێرە، هیچ سەر و شوێنێکم بۆ پەیداناکرێ. کەمێکی تر گوێم لێیگرت و ووتی، پێم خۆشە بڵێن ئەوەتا لێرە کوژراوە، ئیتر ئەحەسێمەوە. منیش هەناسەیەکم هەڵکێشا و هەرچەندە زۆر گران بوو بۆ من کە ئەو هەواڵە ناخۆشەی پێرابگەیێنم، بەڵام دیاربوو زۆر تامەزرۆی سەرەداوێك بوو کە بیگەیێنێتە چارەنوسی کوڕەکەی. پرسیارم لێکرد، ئەگەر قسەیەکت بۆ بکەم، پێی غەمبارنابی؟ ووتی فەرموو چاوەکەم! منیش بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، کە چۆن لە دەربەندی گۆمەسپان، بەخۆم تەرمی کوڕەکەم لە ووڵاغ بارکردوەو و لەگەڵ عەریف جومعە لە شەڕی سوفیان کوژراوە، گڵکۆکەشی وا لە گوندی زیارەتە. شەریف هەڵستا سەرپێ و نێوچەوانی ماچ کردم و دەستێکی بە دەم و چاوی خۆی داهێنا خوارەوە و ووتی، "ئۆخەی، قوربانتبم، ئەمن ئەوە دوو ساڵە بەدوای ئەو کوڕەم دەگەڕێم. گەلێك مەمنونتم، تازە سامەوە و ئەویش گەردەنی ئازادبێ و خوای لێ خۆشبێ".

ماوەیەکی پێچوو و تەنکە بەفرێك باری. حکومەت زۆر بە چڕی لە سپیگرە بۆ هیران پێشڕەوەی کرد. ئێمە لە تیلکەدرێژ بووین (شوێنێکە لە سەفین لە نێوان چنێران و ناقوبان). سەرەتا، بە تۆپ و هاوەن زۆر بە چڕی دەور و بەری ئێمەی بۆردومان کرد. شێخ محەمەد وسو کامەلا، عومەری برازای، سەید

مستەفا و محمود دەبۆ چونە لای خوارەروە و سەنگەریان دامەزراند. ئێمەش لەسەرەوە هەرکەس لە شوێنی خۆمان دامەزراین. هێرشی سەربازی بەرەو ئێمە دەستی پێکرد و ئێمەش لە خوارەوە و لە سەرەوە بەرەنگاری بوینەوە. فڕۆکەی جەنگی دەهات و بەردەوام بۆردومانی دەکردین. هێزەکان سێ جار هێرشیان هێنا و شکان. بۆ جاری چوارەم، گەڕانەوە دواوە و نەیانتوانی بێنەوە پێش. لە کەلەکین، کە شوێنێکە لە نێوان گوندی سپیگرە و چنێران و بەردی گەورە گەورەی لێیە و دەڵێن کاتی خۆی شارێك بووە بە ناوی شاری خۆتەن. ئیتر لەوێ جێگیر بوون و کەمپ و خێوەت هەڵدران. بەداخەوە ئەو دەستە پێشمەرگەی بۆ کەپکی زیزنێ داندرابوون، نەچووبونە جێگای خۆیان، ئەگەرنا سوپای حکومەت نەیدەتوانی لەویش جێگیربێ. لە کاتی تۆپ بارانەکە، دەستەیەك پێشمەرگەی تر لە تیشی چنێران هاتبونە ئەو گەلیەی دامێن ئێمە. تۆپێك لە نزیك ئەوانی دابوو و پێنج پێشمەرگە شەهید و بریندار ببوون و کوڕی میرکەی خەیلانی یەکێك بوو لە شەهیدەکان. دواتر بریندارەکانی تریش شەهید بوون، تەنها عوزێر خەیلانی نەبێ. عوزێر لاوك بێژێکی زۆر دەنگ خۆشیش بوو.

بارەگای پێشمەرگە لە سەفین لە نزیك کەپکی شەهیدان بوو، میرانی ساڵح بەگ و جەمیل کاوانی لەوێ بوون. کابرایەکی هیرانی بەناوی ئەحباب، ڕۆژانە لە دەوری چواری بەیانی، بە سێ چوار وڵاغ ئازوقە و خواردنی لە هیران بۆ دەهێنایین. ئەحباب پیاوێکی زۆر چاونەترس بوو. ئیتر هەر مەفرەزەو کەسێکی دەنارد و بەشە خواردنی خۆی دەهێنا. ڕۆژێك تەیارە لە بارەگای پێشمەرگەیدا، چوار کەری کوشتن و بەشێکی بارەگاکەی سوتاند، بەڵام زەرەری گیانی بە پێشمەرگە نەگەیاند. هەرلە سەفین بووین کە بارزانی پارەی بۆ پێشمەرگە نارد، هەر پێشمەرگەو ۱۰ دیناری وەرگرت، کە تاکە پارمەتی بوو لەو پێنج ساڵەی پێشمەرگایەتم وەرمگرتبێ. شانازیش بوو بۆ من، چونکە من بۆ پارە پێشمەرگە نەبووم. شایانی باسە، کاتێك لەگەڵ حکومەت گفتوگۆ هەبوو، جۆرێکی تری یارمەتی درا بە پێشمەرگە، بەڵام من هیچم وەرنەگرت. زۆرجاریش داوام لە هاوڕێیانی ناو شار دەکرد کە فیشەکم بۆ بنێرن، ئەوکات خاڵك کۆمەکی شۆڕشی دەکرد، بەڵام هی تاکە کەس نا.

فڕۆکە جەنگیەکان زوو زوو سەردانیان دەکردین، هەرچی پێیان بوو بەتاڵیان دەکرد و دەڕۆیشتن. سەدیق، تەنها کوڕی مام عەلی بیرێژی و پاشەبەرەی هەشت خوشکەکانی بوو، گەنجێکی جوان و پیاوانەبوو. ڕۆژێکیان تەیارە زۆر نزم بەسەر کەپکی شەهیدان تێپەری. سەدیق تفەنگێکی برنۆی باشی هەبوو و تەقەی لێکرد. تەیارەکە نزمبووەوە و بەرەو دۆڵایی چوو. ئێمە زۆر دڵخۆشبووین، وامانزانی دەکەوێ، بەڵام پاشان بەرزبوەوە و ڕۆییشت. ئیتر

هەرجاری فڕۆکە جەنگیەکان دەچوون و دەهاتن، تەقەیان لەو کەپکەدەکرد. هەتا ببوە نەریت، کە تەیارە لە ئاسمان بوایە، ئەوکەپکەمان بەجێدەهێشت. بەداخەوە دوای مانگێك، سەدیق لە شەڕێکی تر لە ناوچەی سەری بەرد شەهیدکرا.

لەو بەینە بەفرێکی زۆر باری. ڕێگای هاتوچۆمان بڕا و نانیشمان چیتر بۆ نەدەهات. فەرمانمان بۆ هات کە لە لوتکەی سەفین بێینە خوارەوە و لە قەڵاسنج دابەشبووین. ئەوکات زۆربەی خەڵکی ئەو ناوچەیە، گوندەکانیان چۆڵکردبوون و تەنها هەندێ ماڵی لێمابوون. هەرچەندە هەندێك لە خانووەکانی قەڵاسنج سوتابوون و هەندێکیش تێکچوبوون، ئێمە کاولە خانویەکی چۆڵمان دۆزیەوە و بڕیارماندا بۆ ماوەیەك لەوێ نیشتەجێبین. بەفر و باران لەوێش هاتبوون و بانەکە دڵۆپەیێکی زۆری دەکرد و ژوورەوەش یەك پارچە قوڕبوو. من و عەزیز دەربەندی بانەکەمان گێڕا. داریشمان پەیداکردن، سۆپامان هەڵکردن و بە ماوەی چەند ڕۆژێك، کاولە خانوەکە ووشکبووەوە.

چاش و سەرباز هێرشێکیان کرد و تا نزیك قەڵاسنج هاتن. ئێمە بۆیان دانیشتن و تەقە زۆر گەرمبوو. جەماعەتی خۆرانیەکان زۆر پیاوێ مەردیان لەگەڵدابوون، بەشێکیان چاش و بەشێکیش لەگەڵ پێشمەرگە بوون. ئەو ڕۆژە یەکتریان ناسیەوە و جنێوی سەیریان دەدایە یەکتر! دوایی هێزەکانی دوژمن شکان و گەڕانەوە پیرمەم و سەری ڕەش، جارێکیتریش نەهاتنەوە. نازانم هۆکارەکە چیبوو، بەڵام ئەوکات حکومەت بەشەو هێرشی نەدەکرد. ئێمە شەوانە هەردەستەیەو بۆ لایەك دەردەچووین. هەندێك بۆ ئەو بەرزاییەی کە بەسەر تەوسکەی دەڕوانێ، دەستەیەك لە سەروی دەربەندی کۆڕێ و هەندێکیش بۆ کەپکی کایسا و تا گۆڕی خانزاد. ئەو ناوەمان هەمووی بەسەردەکردەوە. بۆ دەور و بەری کاتژمێر چواری بەیانیش دەهاتینەوە قەڵاسنج. هەموو شەوان ئەوە نیشمان بوو. شاکربەگ لە شەڕ زۆر شارەزابوو، لەگەڵ دەستەیەکی پێشمەرگە لە ئەشکەوتی گەلی شەمان بوو. شوێنەکەی ئەوان هەستیاربوو، ئەگەر هێرش بکرابایە لەولا دەهات. عوسمان حوجرانیش خۆی و دەستەیێکی گەورە لە سەفین بوون، چوار برا و خزم و کەسێکی زۆری لێ کۆببونەوەوە. پیاوێکی بە دەست و برد و خانەدانیش بوو. لە جێگەی خۆی مەڕوماڵات و بەیار و موڵکی زۆر بوون. دەیگوت "بیست ڕۆژ جووتم هەیە و بەلامەوە هیچنیە، تەنها ئەو بەیارە نەبێ کە تازە هاتبوە بەر". سەری کەچەڵ شوێنی ئەوان بوو، کە شوێنێکی بەرزە و بەسەر کلکی سەفین زاڵە، زۆر شوێنێکی قایمە و تا ناوچەی بیرێژی لێ دیارە.

ترسێك هەبوو كە جاش لە پیرمەم و سەری ڕەش هێرش بكەنە سەرمان. بەفرێكی یەكجار زۆریش كەوتبوو. ئێمە چووین و لە بەرزاییەكانی قیرژە، لە بەرامبەر پیرمەم لە سەنگەر دابەشبووین. بەفر و زریان بوو، سەرمایەكەشی لە ڕادە بەدەربوو. ئەو شەوەم قەت لەیاد ناچێ، چونكە یەكێكە لە شەوە هەرە ناخۆشەكانی ژیانم. داری بەڕو و مازی لەوێ زۆربوون. كە مۆرانە لە مازی و بەڕوەدا، كونی بچوكیان لێدروستدەكا. كاتێك با لە كونەكانی ئەدا، دەنگ و ئاوازێكی زۆر خۆشی لێپەیدادەبوو. بەڵام جێگای ئێمە هی ئەوە نەبوو كە لەزەت لەهیچ شتێك بكەین، بەڵكو هیچێكمان بەتەمای ژیان نەبووین. جل و بەرگەكانیشمان شتێكی وانەبوون. خۆ ئەگەر بۆ دڵسۆزی ئەتەو و كوردایەتی نەبوایە، كەس نەیدەتوانی كارێكی وابكا! باش بوو دوژمن هێرشی نەكرد و ئێمەش بۆ بەیانیەكەی گەڕاینەوە. ئەگەرچی ماوەیەك بوو هێرشی سەربازیمان لەسەر نەبوو، بەڵام هەردەم ووشیار بووین و بەردەوام دەوروبەرمان بەسەردەكردەوە. دەچووینە بەرامبەر سەرمەیدانی شەقڵاوە و تەماشای جموجۆڵی حكومەتمان دەكرد. ئەوانیش كەمتەرخەمیان نەدەكرد لە تۆپ بارانكردمان. بە مەبەستی زەرەر گەیاندن بە هێزەكانی دوژمن، زۆر جار عوسمان حوجرانی چەند فانۆسێكی لە بارگیرێك قایم دەكردن و ڕوەو لای سەرمەیدان بەڕەڵای دەكرد، ئیتر ئەو شەوە دۆخی سەربازگەكەی حكومەت تێكدەچوو و سەدان تۆپیان دەگرتە چیای سەفین.

هەروەك پێشتر باسمكرد، من زۆر خولیای خوێندنەوە بووم و حەزم لە پەڕتوك و نوسراو بوو. هاوڕێیەكم پێی ڕاگەیاندم كە لە هەندێ خانووی چۆلكراو، چەندین پەڕتوك وا لەبەر بارانن. خۆم پێنەگیرا و بەهانای پەڕتوكەكان چووم. لە دەلاقەكانی كۆشكی خورشید بەگ، شانامە بە زمانی فارسی و ڕۆستەم و شێرەوی و گەلێك پەڕتوكی بە نرخ، دڵۆپەیان بەسەر دەهاتنە خوارەوە و هەموویانم داپۆشین. خورشید بەگ پیاوێكی ڕۆشنبیر بوو و چەندین زمانی دازانین. چوومە ماڵی مەلا حوسین و ماڵی حەسەن قەراسنجی باوكی هونەرمەندان ڕزگار و ڕەنجبەر خۆشناو، ئەوكات ئەوان لە شەقڵاوە بوون. ئەوانە پیاوی زۆر باشبوون و چاك دەمناسین. هەردوو ماڵەكە پەڕتوكی بەنرخیان هەبوون. هەموو پەڕتوكەكانم كۆكردنەوە و لەسەر چەند دارێكم دانان، وە بە هەمبان داپۆشین. قوتابخانەش هەندێ گۆڤار و پەڕتوكی لێبوون وەك، ڕۆناكی و هیوا... زۆرجار دەچووم بۆ قوتابخانە و دەمخوێندنەوە. هەرلەوێ، پەڕتوكێكم خوێندەوە كە گیوی موكریانی لە ڕەواندز چاپی كردبوو بەناوی ئەمارەتی سۆران.

لە قەڵاسنج گەلیەکی بەرین هەیە و لە ناوەڕاستی گەلیەکە شوێنەواری قەڵایەك هەیە، کە لە لای خوارەوە ڕێگەی بۆ دەچوو. بەشێکی کەم لە دیوارەکانی قەڵایەکە و سارنجی ناویشی تێدامابوو. (سارنج، حەوزێکە لە شاخ دروست دەکرێ بۆ کۆکردنەوەی ناو). هەروەها دوو بیری ناو بەدیدەکران، بەڵام پڕبپونەوە. من پەرتوکی شوێنەوارەکانی عیراقم خوێندۆتەوە، بەڵام بەداخەوە باسی ئەوێی تێدانەبوو. من پێموابێ ناوی دێی قەڵاسنج لەو قەڵاتەوە هاتووە. سەنج، لە زمانی فارسی مانای بەرد. قەڵای سەنج، بەواتای قەڵای بەرد یان قەڵای بەردین. لە بەهار، گوڵە نێرگزی محەمەدی لەوێ زۆر دەڕوێن، ئەو ناوە بەگشتی نێرگزی زۆرە. کابرایەك لە ناو گوند بە چیلەی بەرد پارچە زەویەکی جیاکردبوەوە، سونبل و سوسن و نێرگزی لێچاندبوون. لە کۆن سونبل لە شەقڵاوە زۆر بوون، بەڵام بەم دواییە نەمابوون. کابرا هەندێك شەتلە سونبل و سوسنی پێشکەشکردم و بردنمەوە بۆ شەقڵاوە. هەندێکم پێشکەش بە دوو هاوڕێکردن و ئەوانیتریشم لەناو کۆلەکانی سەر دەرگای خانەقا چاندن.

### ئینقیلاب

شەوێکی ساردی زستان، فەرمانمان بۆهات کە کاژێر دووی شەو بەرەو شینکەکانی قیرژە بڕۆین، کە بەسەر گۆڕەشێر و بیرێژ زاڵە. شەو لەوێ بووین، بۆ بەیانی، ٨ شوباتی ١٩٦٣ ئەو ڕۆژە بوو کە حیزبی بەعس کودەتای بەسەرعبدالکریم قاسم کرد. دەسکرا بە وتار خوێندنەوە لە ڕادیۆ، بەڵام هیچ باسی کوردی نەکرد. ئێوارە گەڕاینەوە قەڵاسنج و بۆ شەو، ساڵح یوسفی بەناوی پارتی بروسکەیەکی نارد. هەرهەمان شەو بەعسیەکان بەیانێکیان دەرکرد کە لامەرکەزی بە کورد نەدەن و ئاگربەستیان ڕاگەیاند. حیزبی بەعس لەلایەن دەولەتە ڕۆژئاواییەکان کارئاسانی بۆ کرابوو تا کودەتا بکەن و دوو کاری سەرەکیان پێسپێردرا بوون. ئەوانیش لەناو بردنی شوعیەکان و وازهێنان لە کوێت بوون. بۆیە  بڕیارياندا شوعیەکان، کە ناویان لێنابوون "عومەلاء" ئیبادە بکەن. بەیانی ژمارە هەشتیان دەرکرد بەناوی"ابادة الشیوعیین العملاء". بە ماوەیاکی کەم، هەزاران کادیری حزبی شوعی لە عیراق گیران و کوژران. ئەوکات شێخ کەوکەسی سەید تەهای ئەهری، سەرکردەی ئێمەبوو لە قەڵاسنج، حاجی کانەبی و حاجی عومەریشی لەگەڵدابوون. ئەمانە ئەوەی شێخ عوبەیدوڵای ئەهری و لە موهاجیرەکانی کوردستانی تورکیا بوون و هەموویان پیاوی چاك و بەڕێزبوون.

ڕۆژێك لەگەڵ شێخ کەوکەس چووینە نزیك ئاشی سپی لە کۆیێ. لە سەرجادە بووین و ئۆتۆمۆبیل تێنەپەڕین بۆ شەقڵاوە و ڕواندز و هەولێر. پیاوێکی زۆر خراپ قائمەقامی شەقڵاوە بوو و لەو کاتە بەپێش ئێمە تێپەڕی بوو، بەڵام ئێمە جادەمان نەگرتبوو. کە گەیشتبووە شەقڵاوە، خێرێکی گەورەی کردبوو و گوتبوی "بیانگرتبام ئەیانکوشتم". ئێمەش ئەفەرمانی گرتن و ئەفەرمانی کوشتنمان پێبوو! زیاتر بۆ ئەوە چوبووین کە لە خەڵك نزیك ببینەوە و داوامان لێدەکردن کە پەیوەندی بە شۆڕش بکەن و ئەبن بە جاش. ئێوارە چوونیە ماڵی موشیر ئاغا و کەریم ئاغا و بۆ بەیانی گەڕاینەوە. شاکربەگ چوو لە قەسرەکەی سەری ڕەش دانیشت و ئەوێی کۆنترۆڵکرد. حەمەد ئاغای مێرگە سۆر و مقەدەم عەزیز و بەکر ئاغاش لەهیران بوون.

ئەمجارە لە قەڵاسنج فەرمان هات کە دەستەی عەزیز دەربەندی بچینە بیرێژ. گوندێکی زۆر خۆشە و بەرەو بەهاریش بوو، بەڵام هەموو ڕۆژ باران دەبارین. من زۆرم هەست بە شەرمەزاری دەکرد کە بۆ هەموو ژەمە خواردنەکان دەبوو دابەش ببینە سەر ماڵان. زۆر لە ژەمەکان نەدەچووم و هەوڵمدەدا لەسەر بەری هەندێك لە گیاوگۆڵە بەهاریەکان خۆم تێربکەم، بەڵام هێشتا بەهار زووبوو و کەم شتم دەست دەکەوت. کە دەچوومە ماڵەکان زۆر پێی دڵگیر دەبووم، بەڵام چارەی تریشمان نەبوو.

کاتی خۆی ڕۆژنامەی ئازادی حزبی شوعی، باسی وسو سەبزەچی دەکرد. زۆر گەورەی کردبوو و دونیای بۆنەهەژاند. دوو کەسیتریش ئەوکات شوعی بە ناوبانگ بوون، کە ناویانم لە بیرنەماوە. ئەوانە هەرسێکیان لە ترسی حکومەت هەڵاتبوون و هاتبونە لای دۆستەکانیان لە بیرێژ و ناوێران لە هەولێر بمێننەوە. ئەگەر بگیرابان، لەوانەبوو لە سێدارە درابان. من زۆر ڕێزم لێنەگرتن، بەڵام بەداخەوە هەندێك کەس پێیان پێدەکەنین. لەبەر گفتوگۆکانی شۆڕش لەگەڵ حکومەت، بۆئێمە ترس کەم ببوو.

من و عەزیز دەربەندی لەسەر بەرزاییەك، لەناکاو بەسەر مارێك هەڵبووین. ماری وا گەورەم تا ئەمڕۆش نەدیوە! تفەنگم هێنا خوار، بەڵام مارەکە چووە ژێر بەردێك. گووتم دوایی دێمەوە و دەیکوژم. ئێوارە هاتمەوە پێچێکی لەسەر بەردبوو و بەشەکەی تریش هەرلەژێر بەردەکە بوو. بەدبەختی من، ئەوجارە تفەنگەکەم چروکی کرد و دوبارە پێم نەکوژرا. چەند ڕۆژێك لە دوای ئەومارە بووم و وەگیرم نەدەکەوت. ڕۆژێك ڕەسوڵ وسوانیم لەگەڵ خۆبرد. من لەلای سەرەوە و ئەویش لەلای خوارەوە بۆیهات. دیاربوو مارەکە لەژێر هەمان بەرد و لەلای ئەو دیاربوو، بە گورجی دوو سێ تفەنگی لێدان و کوشتی. هێنامانە

دەرەوە و لەسەر بەردەکەمان دانا، بەڵام شتێکی سەیر بوو. مارێکی کورت، بەڵام ددانی لە گەی پەنجە درێژتر بوون و پشتی لە پێڵاوەکەم پانتربوو! کاتێک خەڵکی بیرێژ پێیانزانی، زۆربەیان هاتنە تەماشای. مارەکە چەند ڕۆژێک لەوێ مایەوە و شتێکی زەرد لە دەوی هاتبووە دەرەوە. دڵۆپەکان بەسەر بەردەکە چۆڕابوونەوە خوارێ و کەوتبونە سەر گیاوگۆڵی دامێن بەردەکە. سەیر لەوەدابوو، گیاکەی ووشك کردبوو. مام عەلی بیرێژی کوێخای گوندبوو و لە دێیەکە لە هەموویان بەتەمەنتر بوو، ووتی من قەت شتی وام نەدیوە!

لەو بەینە، لەسەر داوای شێخ کەوکەس، هەشت کەس لە ئێمە بە مەبەستی سولح کردن چوونیە گوندی شەوەك. عەزیز دەریەندی و حوسێنی خەزوری ئەو، ڕەسوڵ مەولودە دۆم، ڕەسوڵ شوان، برایمە خڕە و دوو کەسی تر بووین. سوڵحەکەمان جێبەجێکرد و شەو لەو گوندە ماینەوە. بۆ بەیانی نەورۆز بوو. هەندێك ووتیان دەچینە هەولێر، بەڵام چونکە مۆڵەتمان لە شۆڕش پێنەبوو، باشتر وابوو بگەڕێینەوە شوێنی خۆمان. بارودۆخەکان کەمێك توندبیوون، بەڵام گفتوگۆ لەگەڵ حکومەت هەر بەردەوامبوو. هەموومان بە جێبێك گەڕاینەوە. کە گەیشتینە ڕەبایەی خانزاد، سەرباز لەسەر ڕێگا وەستابوون. پرسیاریان کرد ئێوە کێن؟ گوتمان پێشمەرگە! بەڵام تەواو ڕامان نەگرت و ڕۆیشتین. خۆشمان ئامادەکرد کە ئەگەر لە مەسیف ڕێگریمان لێبکەن، شەڕبکەین. لولەی تفەنگەکانمان هێنانە دەرەوە، بەڵام بەبێ هیچ تەگەرە گەیشتینەوە ناوچەی بیرێژ و کۆڕێ. عەزۆلەی کۆیی زۆر لەگەڵ ئێمە هاوڕێ بوو. تەمەنی بچوك بوو، بەڵام گەنجێکی زیرەك و ووشیار بوو. ئاهەنگێکی خنجیلانەی نەورۆزی لەسەر ڕێگا و لە نزیك کۆڕێ ڕێك خستبوو. هەندێ خەڵکیش هاتبوون و ئێمەش تۆزێك بەشداریمان تێداکرد.

مەفرەزەی ئێمە نزیکەی ١١ پێشمەرگە بووین و بۆ ڕۆژی دوایی، فەرمانمان بۆ هات کە بچینە گوندی ئالماوان و بە پشتی کۆڕێ لە جادە پەڕینەوە. ئۆتۆمبیلێکی زۆر تێپەڕین و خەڵك زۆری پێخۆشبوو کە پێشمەرگەی بینی. هەندێك تاوانباریشمان بینین، بەڵام تخونی کەس نەکەوتین. هەندێ لەو خەڵکە دەیانگووت حکومەت بڕیاری لێبوردنی داوە، زیندانیەکان ئازادکراون و دونیا خۆشبووە، بەڵام ترس هەبوو کە حکومەت جارێکی تر دەست بوەشێنێ.

لە ئالماوان دوبارە لەسەر ماڵان دابەشبووین. بەڵام بەداخەوە، سەرکردەکانی ئەو ناوە لەگەڵ یەکتر تەبانەبوون. بارزانی شاکربەگی لەسەری ڕەش دانابوو و هەموو گەردی لەخۆی کۆکردبوونەوە، لەناکاو ئەو پیاوە ئازاو شەڕزانە، بەهەوەسی خۆی دەجوڵایەوە. حەمەد ئاغای مێرگەسۆریش بە جۆرێك و

کەوکەسیش بە جۆرێکی تر دەجوڵانەوە. باروdۆخەکە زۆر شڵەژاو و بێ سەروبەر ببوو، هەرکەس بۆخۆی کاریدەکرد. ئێمەش لەوناوە بارەکانمان زۆر خراپ بوون، تەنانەت خواردنیشمان بۆ دابین نەدەکرا. ئێمە خۆبەخۆیی کۆبونەوەیەکمان کرد و بڕیارماندا عەزیز دەربەندی و برایمەخڕە بنێرینە لای بارزانی لە بادینان، بۆ ئەوەی چارەیەکمان بۆ بدۆزێتەوە. هەرچەندە من قەت حەزم لە بەرپرسیارەتی نەبوو لەناو شۆڕش، بەڵام لەسەر داوای هەموویان، من بووم بە جێگرەوەی عەزیزدەربەندی، بۆ ئەو ماوەیەی کە دەچوو بۆ گەشتی بادینان. گەورەی ئالماوان کەریم ڕەشۆ بوو و خۆی و خەڵکی ئالماوانیش هاوکاری زۆر باشبوون بۆ ئێمە. بارەگامان لە خانوێکی قادر قەڵاسنجی دانا کە خۆی و حەبیبی خێزانی ئێمەیان دەناسی. جارانماڵی قادر لە شەقڵاوە بوو و قەتارچی ماڵی حەسەن مامست بوو. پاش ماوەیەك عەزیز و برایم هاتنەوە. لەسەر سنوری سوریا بارزانیان بینیبوو و بەڵێنی دابوو کە کۆمەکمان بکا.





لە ڕاستەوە: عەزیز دەربەندی، برایمە خڕە لە ئەرشیفی ئیسماعیل ئەفەندی وەرگیراوە

ئێمە هەر لە ئالماوان ماینەوە و هەتا دەهات دۆخەکان توندتر دەبوون. دوای ئەوەی ئێمە بووین بە پێشمەرگە، کۆمەڵێك خەڵکی شەقڵاوە گیرابوون و ڕەوانەی زیندانی نوگرەسەلمان کرابوون. ڕۆژێك هاتمە سەر جادە و هەندێك لەو زیندانیانەم بینین کە تازە ئازادکرابوون و دەگەڕانەوە شەقڵاوە. بەداخەوە، عەمەر بەگی کوڕی سلێمان بەگ کە یەکێك لەو زیدانیانە بوو و پیاوێکی زۆر قارەمان بوو، لە زیندان و لە بارۆخێکی تەمومژاویدا گیانی لەدەستدابوو. یەکێك لەو زیندانیانەی کە ئەو ڕۆژە بینیم، مەلا حوتان بوو.

من ماوەیەك بوو بە مەرامی ئەوەبووم سەردانێکی شەقڵاوە بکەم و ئازادکردنی ئەو برادەرانەم بەهەڵ زانی. عەوڵا ماوەرانیش هەندێك خزمی لە شەقڵاوە بوون و بڕیارماندا بەیەکەوە بچین. بە ئۆتۆمۆبیل تا لای سپیلکی بەرامبەر حوجران چووین. لەوێ لە سەیارە دابەزین، ئەوەکو لە بازگەی سەرمەیدان بمانگرن. بە پێ لە داری مەلا قادر ناوابووین بۆ ئەوبەری چیای سۆرك و لەوێش چووین بۆ گەروی بوکان. پەڕینەوە بۆ شەقڵاوە و لە دارەندو سەرکەوتین بۆ چایخانەی جەمیل کاوێس، کە ئەوکات لە سەرووی میوانخانەی کریکۆر بوو. ئەنوەری سلێمان سورچیمان بینی و گووتی لە چایخانە لامەدەن، دۆخەکە نالەبارە و سەربازو ئینزیبات لەوێنە. بەپەلە تێپەڕین و لە کۆڵانەکەی تەنیشت چایخانە سەرکەوتین و بەرەو ماڵی خۆمان چووین. سەرێکی ماڵەوەماندا و بەپەلە چوینە چایخانەی ناو بازاڕ. برایم کاکۆ لەوێبوو و گووتی دۆخەکە زۆر توندە و نازانم چیمان بەسەردێ. هەرلەوێ زانیمان کە ئەحمەدی حاجی مستەفا بەگ لە گرتووخانە بەربوە و لەگەڵ عەوڵا سەردانمانکرد. ئەو ڕۆژە چەند وێنەیەکیشمان بەیەکەوە گرتن.



لە ڕاستەوە: ئەحمەد حاجی مستەفا، عەوڵا ماوەرانی، قادر گۆزێ
١٩٦٣/٤ شەقڵاوە
ماڵی ئەحمەد



لە ڕاستەوە: قادر گۆزێ، ئەحمەد حاجی مستەفا و دوو کچەکانی پەروین و خەدیجە، عەوڵا ماوارانی،
١٩٦٣/٤ شەقڵاوە
ماڵی ئەحمەد

به پەلە سەردانێکی باوکیشم کرد، بەڵام زۆر پێمناخۆش بوو کە نەمتوانی لەلای بمێنمەوە. زۆر ماندوو و شەکەت بووم و شەو چوومەوە ماڵ، بەو نیازەی کە دوای ماوەیەکی زۆر، شەوێك لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانم بەسەربەرم. بەیانی زوو لەگەڵ ڕۆژهەڵات، ئەحمەد حاجی مستەفا بەگ، سابیری کوڕی خۆی بەدوا ناردم. سابیر ووتی، "مام قادر، ئەنوەری سلێمان سورچی و حاجی کوڕی حاجی حەسەن و چەند کەسێکیتریان گرتوون و خەریکە لەگەڵ حکومەت دەبێتەوە شەڕ". بە پەلە تفەنگ و فیشەکدانەکەم بەستن و بۆ ماڵی ئەوان کەوتمە ڕێ. ئەوکات ماڵەکان بەزۆری لە شەقلاوەی کۆن بوون، کە بە گوند بەناوبانگ بوو، بەڵام ماڵی ئەحمەد لەناو ڕەزان بوو. لە خوارووی قشڵە هاتمە خوار و لەلای ئاشی ئاگری ساڵحە قوتم بینی، کە پیاوێکی هەولێری بوو و لە شوێنی من لە مەکینەی کارەبا کاریدەکرد. بانگی کردم ووتی، "قادر، خۆش بڕۆ موسەلەحە هاتووچۆ دەکا و خەڵکی ئەگرن". منش لامدایە ئەو کۆلانەی لە تەنیشت ئاشە کۆنەکە دەردەچوو. لەوێش بەناو گۆڕە توو شۆڕبوومەوە بۆ ناو ڕەزان و بەبێ تەگەرە گەیشتمە ماڵی ئەحمەدی مستەفا بەگ. خەڵکێکی زۆر، کە لە ڕێکخستن کاریاندەکرد و نزیکەی ١٠٠ کەس دەبوون، لە باخچەی ئەوان کۆببونەوە. تەماشامان دەکرد لە جادەی خوارەوە زیل و دەبابە دەڕۆیشتن. لەو خەڵکە، تەنها من و عەولا پێشمەرگەبووین. مشتومڕێکی زۆر لەوێ کرا کە چی بکەین. حەسەن موختار چووبووە لای عوسمان بەگ و پرسی پێکردبوو کە چیبکەین باشە. ئەویش گووتبوی، بڕۆنە گوندی لاسێ، بەڵام من گوتم ناچمە لاسێ. من پێشمەرگەم و دەچمەوە سەفین، عەولاش هەمان ڕای منی هەبوو.

## شەڕی دەربەندی کۆڕێ

شەو، ئەو خەڵکەمان بەگەرکەوت و بەرەو سەفین ڕۆیشتین. لە گەلی وسوڕەحمان سەرکەوتین. حەسەن وەستا محمد لەگەڵ من دەڕۆیشت و زۆر ماندوو ببوو، بەڵام من زۆر هانمدەدا کە ئەوەستێ تا گەیشتینە حۆداوە. دوو ڕۆژ لەوێ ماینەوە و جاروبار دەهاتینە سەرکلکێ پیرڕێخی و تەماشای جوڵەی سەربازەکانمان دەکرد. هەندێ لە برادەرانی شوعیش لەوێ بوون. لەو بەینە حکومەت بەیانێکی دەرکرد کە بارزانی بۆماوەی ٢٤ کاتژمێر خۆی ڕادەستی حکومەتبکا، ئەگینا لێی ئەدەین. هەواڵیشمان هەبوو کە تەیارە لە بێتواتەی دابوو. پاش دوو ڕۆژەکە، فەرمانمان بۆهات کە هەموو پێشمەرگەیەك پەیوەندی بەجێگەی خۆی بکاتەوە و دووبارە شەڕلەگەڵ حکومەت دەستپێدەکا.

من و عەولا ماوەرانی بە شەو کەوتینە ڕێ. کە گەیشتنە شێرەسوار، هێزی حکومەت جموجۆڵیان هەبوو. بۆیە لە ڕۆخ ڕووبار ڕۆیشتین و دواییش لە نزیك کۆڕێ چووینە ناو ڕووبار. لەناو ئاو ڕۆیشتین تا لەژێر پردی کۆڕی پەڕینەوە و لە خواروی ئاشی مام زێندین هاتینەوەدەر. لەوێش چووینەوە بۆ ئالمەوان و کە گەیشتینە ئەوێ، دێیەکە چۆڵبوو. چەند تۆپێکی لە دێیەکە دابوون و خەڵکی چوبوونە دۆڵاییەکانی نزیك ئەوێ. لەوێ پێیان ڕاگەیاندین کە هاوڕێیانمان چوون بۆ ئەو کەپکە بەرزەی لە دەربەند بەسەر کۆڕێ دەڕوانێ. دووبارە گەڕاینەوە بۆ دەربەندی کۆڕێ و وەرداشەکانمان دۆزینەوە.

حکومەت دەیەویست هێزێکی گەورە ڕەوانەی ناوچە شاخاویەکانی سەرەوە بکا و بارەگا سەرەکیەکانی شۆڕش لەوێ بگرێ، بەو نیازەی کە بەتەواوی کوتایی بە شۆڕش بێنێ. دەربەندی کۆڕێ شوێنێکی زۆر ستراتیجیە و دەبوایە سەرکردایەتی شۆڕش گرنگیەکی تایبەت بەو شوێنە بدا. کەچی ئێمە هێزێکی بچووك بووین و هیچ چەکێکی قورسیشمان پێنەبوو. کەبوو بە شەڕیش، کەس بەهانامان نەهات! نەگەرنا، من لەو باوەڕەم ئەوکاتیش وەك ساڵی ۱۹۹۱، دەکرا هێزی دوژمن لەوێ ڕابگیرێ.

لە شارۆچکەی پیرمەم (سەلاحەدین)ەوە، هێرش بەرەو دەربەندی کۆڕێ دەستی پێکرد. لە ئالماوانیشەوە بەرەو کەپکی بڵند هێزێکی سەربازەکان بەسەرکەوت. ئێمە هەندێکمان لە کەپکی بڵند بووین، هەندێکیش لەسەر دەربەند و بەرەنگاریان بوینەوە. دوای شەڕێکی قورس، دوژمن شکا و نەمانهێشت بێنەپێش. لە دیوی لای شەقڵاوەش، هێزێکی سەربازی گەورە لە سەرمەیدانەوە هات و هێرشی سەربازی لە دواوەش ڕووی لە ئێمەکرد. بەڵام مەفرەزەکەی تری پێشمەرگە، کە هەرلە دەربەند، لە دیوی شەقڵاوە و لە بەرامبەر حوجران بوون، نەیانهێشت هێزەکان لەولاشەوە بێنە پێش. هەندێك سەرباز لەوێ کوژران و جەنازە و چەکەکانیان کەوتنە دەستی پێشمەرگە. مەفرەزەیەکی تریش لەبەری لای شێرەسواری دەربەند، کە عەزیزی فاتە قەرەوێ سەردەستەیان بوو. ئەوانیش دەورێکی گەورەیان بینی لە تێکشکاندنی هێرشەکەی دوژمن. بۆ ڕۆژی دووەم، بەهەمان شێوە هێرش دەستی پێکردەوە و دیسان بەدەردی ڕۆژی پێشومان بردن. ئێستاش هەرلە بیرمە کە سەربازەکان زۆر نزیك ببوونەوە، گوێم لە یەکێکیان بوو کە پێدەچوو عەریف بێ کە ووتی "کاضم اتقدم". جارێکی تریش دوژمن شکا. دووبارە هێزەکان پاشەکشەیان کرد. بۆ ڕۆژی سێیەم، حکومەت هێرشی دەستپێکردەوە، بەڵام ئەم جارەیان هێزێکی جاشەکان لەکلکەی دیوین، بەسەر شاخەکەدا هێرشیان هێنا و

گەیشتنە ئەو بەرزاییانەی کە بەسەر ئێمەیدا دەنواڕی. لەهەمانکاتدا، هێرشی سەربازی لە ڕووی لای شارۆچکەی سەلاحەدینەوە دەستی پێکردەوە.

ئێمە هەم فیشەك و هەم توانامان لێ بڕابوو. چەند ڕۆژ بوو لەوێ بووین، هیچ تەقەمەنی و نان و ئاومان بۆ نەهات. فڕۆکە جەنگیەکانیش بەردەوام بۆردومانیان دەکردین. ئەو مەفرەزەیەی تر کە لە دیوی شەقڵاوەی دەربەند بوون، بەرلە ئێمە و بەبێ هەماهەنگی لەگەڵ ئێمە، پاشەکشەیان کردبوو بۆ ناوچەی کەندان و ئینجا بۆ ماوەران. بۆ شەویش گەڕابوونەوە ناوچەی سپیگرە و ئاقوبان.

بەختی ئێمە، ئەو ڕۆژە حکومەت لە سپیلکی حوجران هێرشی نەهێنا، ئەگەرنا دەورەمان دەگیرا. ناچار پێش ڕۆژهەڵات، ئێمەش بەدیوی شەقڵاوە پاشەکشەمانکرد بەرەو ڕووباری حوجران. هەر بەناو ڕووبار و بەبن پردە کۆنەکەی حوجران، پەڕینەوە بۆ کلکەی سەفین. لە ڕێگا تەقەیەکی زۆرمان لەسەر بوو و پێشمەرگەیەکی خەڵکی گەرەوان فیشەکێك لە تفەنگەکەی درا و ڕانی هەندێك برنیدار بوو. ئیتر بە هەرحاڵ خۆمان گەیاندە گەلی مۆزیك لە نزیك تەوسکە. شەو هەندێك کەس لە تەوسکە هاتن و نانیان هێنا، بەڵام تا ئێمە گەیشتین، خواردنەکە تەواو ببوو و بەشی هەموومانی نەکرد، ناچار بلاروکمان خواردن. ڕۆژی دواتر چووینەوە بۆ ئەشکەوتی حۆداوە و سێ ڕۆژی تر لەوێ بووین. جەمیلی کوڕی کاوێس ئاغا، بەو دۆخەی ئێمەی زانیبوو و خواردنی لە شەقڵاوە بۆ هێنباینە ئەو ئەشکەوتە و مەنجەڵکەشی بۆ بەجێهشتین کە دوایی سوودی زۆرمان لێ بینی. جەمیل پیاوێکی زۆر بە هەڵوێست بوو.

هێزەکانی حکومەت، ناوچە سنوریەکان و بارەگا سەرەکیەکانی شۆڕشیان بەلاوە گرنگتر بوون. هەربۆیە، زیاتر شەڕیان لەگەڵ سەفین نەکرد، بەڵکو بەرەوەو ناوچەی سەرەوە ڕۆیشتن و لە شەقڵاوە تێپەڕین. دوای ڕۆیشتنی هێزەکان، زۆربەی ئەو برادەرانەی کە لەگەڵ ئێمە هاتنە چیای سەفەین، گەڕانەوە ناو شار و حکومەت لێپێچینەوەی لەگەڵنەکردن. هەندێکیشیان بڕیاریاندا ببن بە پێشمەرگە و نەگەڕانەوە ناو شار.

## پاراستنی چیای سەفین

بەیانی زوو بوو کە فەرمانمان پێکرا پاشەکشە بکەین بۆ کەپکی کایسا و کێلی گیسکان، ئێمەش بەرەو ئەوێ کەوتینە ڕێ. جوانی ئەو ناوە لە ڕادە بەدەر بوو،

بەڵام ناخ، کە زۆر برسی و ماندووبووین. ئیستاش نازانم کە تەنانەت چۆن دەمانتوانی جولەش بکەین. لە ڕەشەدۆڵ هەڵکشاین بۆ ئەوبەر، ئەو ناوە یەك پارچە گوڵی مێلاق بوو. لە چڕی گوڵەکان زەویەکە سوردەکرا، سروشتێکی یەکجار جوان بوو. بەهارێکی تەڕبوو، مانگی شەش بوو کەچی باران هێشتا دەبارین. عەزیز حاجی ئەمین، کوێخای سماقولی بوو و تا بڵێی پیاوێکی قسەزان و زیرەك بوو. هەروەها وەك گەورەیەکی ئەو ناوە تەماشادەکرا و خەڵکی ئەو ناوەش هەمووی خۆشیان دەویست. دیاربوو بارزانی ڕایسپاردبوو کە ئاگای لە پێشمەرگەبێ. ئەویش چەند عەربە گەنمێکی کردبوو بە نارد و بۆی ناردینە سەفین. برادەرانی شوعیش کە بارەگایەکیان لە کانی گوێزبوو، ناردەکەیان بۆ دەکردینە نان. نانەکە زۆر ڕەش و تاڵ بوو، چونکە زیوانی زۆر بوو، بەڵام ئەوەندەمان برسیەتی بینی بوو؛ ئیتر هەموو شتێکمان دەخوارد. ماوەیەکی زۆر بوو ئێمە هەرلە ئامادەباشی دابووین. من ٢٧ ڕۆژبوو پشتێنەکەم نەکردبوەوە و دوو فیشەکدانیشم لە پشت بوون. لەو ماوەیەدا هێندەم نارەقە کردبوو کە پشدێنەکەم کردەوە، جلەکانم ڕزی ببوون و دڕان. ناچار ناردمە شەقڵاوە و هەندێ جل وبەرگم بۆ هات.

بەعس لە ڕێگای میدیا هەڵڵایەکی نابوەوە و سەدان قسەی نەشیاویان بەشۆڕش دەگووت، "وین صار خفافیش الیل، وین صارو بالنهار". بێژەرێکی ڕادیۆ کە ناوی شەهێن تاڵەبانی بوو، زۆر قسەی نەشیاوی دەرحەق بە شۆڕش لەسەر ڕادیۆ دەکرد. دوایی زانیمان کە خزمەکانی خۆی بەم کارە زۆر شەرمەزار ببوون و هەر لەبەر ئەم هۆیە کوشتبوویان. ڕۆژێك بۆ ماوەی چەندین کاژێر، ڕادیۆی بەغدا سرودی نیشتمانی عەرەبی لێدەدان و ناوە ناوە دەیووت، پاش تۆزێکی تر هەواڵێکی گرنگتان دەربارەی هێزی سەبازی بۆ بڵاو دەکەینەوە، کە چۆن سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێناوە. پاش چەندین سەعات چاوەڕوانی، بڵاویانکردەوە کە هێزەکانی حکومەت گەیشتونەتە بارزان و ئەو ناوەیان کۆنترۆلکردوە. بۆ ئێمە ئەو هەواڵە شتێکی وا نەبوو، چونکە بارزانیش گوندێك بوو وەك هەموو گوندەکانی تری کوردستان و سەرکردایەتی شۆڕش لەوێ نەبوو. دیاربوو بەرنامەی بەعسی ئەوەبوو کە وورەی خەڵك بە ڕێگای میدیا دابەزێنێ، بەڵام ئەمانە کاریان لە وورەی خەڵکی نەدەکرد. تا دەهات ئێمە بەهێزتر دەبووین و جەماوەریش زیاتر پشتگیری لە شۆڕش دەکرد.

هەڵبژاردنی ئەنجوومەنەکان لە ناو پێشمەرگە دەستیپێکرد و هەموویان (کۆیاتی و خۆیاتیان) دەکرد و هەر ناوچەیەو کەسێکی خۆیان هەڵبژارد. مام عەلی بیریژی و کوڕی مام تەهای گۆرەشێری و عەزیزی حاجی ئەمین بۆ ئەنجومەن داندران. منیش داوام لە برادەرانمکرد کە کۆبونەوەیەك بکەین و پیشنیارم کرد

کە برایم کاکۆ هەڵبژێرن بۆ ئەنجومەن. ئێمەی خەڵکی شەقڵاوە و لاسەو ترگارە، سی تا چل کەس دەبووین، کەچی لە ئەنجومەن نوێنەرمان نەبوو. هەرچەندە مام برایم تازە پەیوەندی بە ڕیزەکانی پێشمەرگە کردبوو، بەڵام لە هەمووومان بەتەمەنتر بوو، ڕێزێکی تایبەتشی لەناو شۆڕش هەبوو، هەروەها سێ چوار کەسیشی لە خزم و براکانی لە گەڵدابوون. پێشنیارەکە پەسندکرا و برایم کاکۆمان بۆ ئەنجومەن هەڵبژارد. بارەگای ئەنجومەن لە هیران داندرا. لەگەڵ هەڵبژاردنی برایم کاکۆ بە ئەندامی ئەنجومەن، دەستەیەکیشمان هەڵبژارد کە پێکهاتبوو لە کۆمەڵێك پێشمەرگەی شەقڵاوە و دەوروبەری. برایمە خڕەمان هەڵبژارد وەك سەردەستە و عەزیزی فاتە قەرەویش بە جێگرەوەی. دەستەکەش پێکهاتبوون لە من، قادر تەهای سپیگرمیی، ئەحمەد زەخۆك، مام حەسەن ئەحمەد هۆری، سەدیق برایم بنعارد، کەریم بەگی حاجی ئاورەحمان بەگ و ئەحمەد سەلیمە گردە.

هێشتا هەرلە سەفین بووین کە ڕۆژێك هەواڵێکی خۆشمان لە ڕادیۆ بیست. وەزیری دەرەوەی ڕوسیا، ئەندریێ غرۆمیکۆ، داوای لە نەتەوە یەکگرتوەکان کردبوو کە لە گەلانی عیراق بپێچێتەوە، چونکە حزبی بەعس خەریکە لەوێ ئیبادەی مرۆڤ دەکا. ئێمە بەو هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بووین و گوتمان تازە هەموو دەوڵەتە ئیشتراکیەکان پشتگیریمان لێدەکەن! بەڵام بەداخەوە، تا دەهات دۆخەکان خراپتر دەبوون.

سەرەڕای جیاوازی بیروباوەڕمان، من پەیوەندیە تایبەتیەکانی خۆم لەگەڵ برادەرەکانم لەناو حیزبی شوعی هەردەم توندوتۆڵ بوو. بۆیە من زوو زوو دەچووومە سەردانی ئەو برادەرانە لە بارەگاکەیان لە کانی گیز. ئەو سێ برادەرەی کە لەوێ بوون و لە بیرم ماون، مامۆستا ئیسماعیلی مەلا ڕەش لەگەڵ ڕەئوف و ئیسماعیلی مەلا عەولا بوون. ئەو بارەگایە نزیکەی پەنجا تا شەست کەسی حزبی شوعی لێبوون. حەمەد ئاغای مێرگەسوریش لەگەڵیان بوو و دەیگوت "خەڵك چۆن واز لە کوڕی خۆی دێنێ؟ ئێمە کوڕی ڕوسیاین، هەر بزانە عیراقیان لە نەتەوە یوکگرتوەکان دەرکرد". مانگێك دوای ئەو قسانە، ئێوارەیەك ڕادیۆی بەغدامان کردەوە. بەیانێك دەرکرا کە شەڕ لە باکوری عیراق بوەستێ و گیراوەکان بەربدرێن... لە دوا ووتەی بەیانەکەدا گووتی کە شوعیەکان دایان نابوو لە سەربازگەی ڕەشید شۆڕشمان لەسەربکەن، بەڵام هەوڵەکانیان پوچەڵکرانەوە.

ئەو دەستەیەی ئێمە، کەپکی زیزنەمان بۆ داندرا و بارەگاکەمان لەسەر ناوی زیزنە دانا. لە دیوی شەقڵاوە، چیای سەفین لە کلکەی حوجران هەتا

جووتەدار، لە زۆربەی شوێنەکان ڕێگا هەن و دەتوانی بەئاسانی سەربکەوی. لە جووتەداریش هەتا کانی زیزنە، چەند ڕێگایە هەن، بەڵام ڕێگای زۆر سەختن و تەنها ڕاوکەرەکان شارەزای ئەو ڕێگایانە بوون. ئەگەر حکومەت بەنیازی هێرش بوایە، دەبوا بە ڕێگای کانی گێز یان ڕێگای کانی زیزنە هێرش بێنێ و هەردوو ڕێگاکەش پێشمەرگەیان لەسەربوون. چونکە سەفین شاخێکی زۆر ستراتیجی بوو، حکومەتی عەبدوسەلام عارف پاش ئەو بەرەوارە، بڕیاریدا ڕێگایەکی سەربازی لە کلکەی سەفینەوە هەتا کەپکی کایسا دروست بکا. ئەم ڕێگایە یەکەم ڕێگای سەربازی بوو بۆ سەر شاخەکانی کوردستان. لەدوای ساڵی ١٩٧٥، سەدام حوسێن ڕێگای سەربازی بۆ سەر زۆر لە چیاکانی کوردستان دروستکرد.

ئاوی کانی زیزنە زۆر سارد و سازگارە. لە شوێنی هەڵقوڵانیشیەوە چەند مەترێك دەڕوا و پاشان بزردەبێ. من نازانم هەر لەبەر ساردی ئاوەکەیە یان دەکرێ مادەیەکی کیمیاویشی تێدابێ، چونکە کە دەیخۆیەوە، خواردن زوو هەرس دەبێ و برسیت دەکا. ئەگەر هەرجۆرە میوەیەك بۆ ماوەیەکی کەمیش لەناو ئاوەکە دابنێی، ئەوا شەق دەبێ و تامەکەی دەڕوا. شاخی سەفین چەندین کانی تری لەسەرن وەك حۆداوە، کانی شیلان، کانی کنێر، کانی سەر خۆران و کانی گێز، بەڵام هیچ کامیان وەك کانی زیزنە ساردنین.


قادر گۆزێ

هەر لە کانی زیزنە بووین، شوعیەکان چەند گیسکێکیان بۆ هاتن و دوویان بۆ ئێمە ناردن. یەکێك لە گیسکەکانمان کوشتەوە و خواردمان. ئەوەی ترمان لەسەر کانی بەستبووەوە و لە دەوری کانیەکە دەلەوەڕا. دوای سێ چوار ڕۆژان بەرەڵامانکرد ووتمان تازە ناڕوا، بەڵام گیسکەکە کێوی بوو و بۆ ماوەی دووحەفتە بزرمانکرد. ئەحمەد سەلیم چاوی زۆر تیژبوون، ڕۆژەکی لە سەرکەپکی دانیشتبوو، گیسکی لەدوورەوە بینی. سێ چوار کەس لە ئێمە بە دوایدا چووین. هاشم ئاقوبانی گەنج بوو وکەوتە دوای. یەك دوو تفەنگەکی تێگرتن، بەڵام دیاربوو نەکەوت. هاشم هەرلە دوای بوو تا لە گەڵی زیزنێ فیشەکێکی تری لێدا، ئەمجارە کەوت و گرتمانەوە. شتێکی سەیربوو کە بە یەك دوو حەفتە لە بزنی کێوی، کێوی تربببوو! دواتر لە خەڵکی سپیگرەم بیست، کەهەر حەیوانێکی ئاوی زیزنە بخواتەوە، زۆر زوو کێوی دەبێ.

بۆ زستانی ساڵی ١٩٦٣/ ١٩٦٤، ئێمە چووینە ئەشکەوتی کەفتیار لە پشت گوندی خۆران. پاشان خەڵك ناوی ئەو ئەشکەوتەی گۆڕی و بووە ئەشکەوتی شەقڵاوەییان. عەلیە ڕەشیش ئەوکات پەیوەندی کردبوو، و مەلا گچکەش جاروبار دەهات بۆ سەردانمان و شەو لەلامان دەمایەوە. بۆ ئەوەی خەڵکی ئەوێ هەراسان نەکەین، بڕیارماندا ئەچینە ناو گوند. تەنها بۆ هێنانی ئاو، ڕۆژی جارێك یەکێکمان دەنارده گوند و بە وولاغ ئاوی دەهێنا. هەرچەند ڕۆژ جارێکیش، یەك دووانێکمان بە وولاغ ئەچووینە هیران و ئازوقەمان دەهێنا. لەوکات ڕەمەزان بوو، بۆ کاتی بانگدان لە هەولێر تۆپ دەتەقێندرا، ئێمەش لەگەڵ تۆپەکە ڕۆژومان دەشکاند و بۆ بەربانگیش، زۆربەی کات ماش و ساوارمان لێدەنا. ئەنوەر ئەحمەد جەمالی زاوام کە لە سەربازی نائیب زابت بوو و بەر لە ماوەیەك پەیوەندی بە دەستەی ئێمە کردبوو، لەو ئەشکەوتە لەگەڵمان بوو. شەوانە یەکێکمان هەم پاسەوانی دەکرد و هەم خواردنیشی بۆ پاش شیو گەرم دەکردەوە. شەوێك نۆرەی ئەنوەر بوو و نیوارە ساوارمان هەبوو و بەشی پاش شیویشمان لەناو مانجەڵ هەڵگرتبوو. لایەکی مەنجەڵەکەشمان کونێکی تێببوو. شەو ئەنوەر گوێی لە خرتە خرتێك دەبێ، کە تەماشادەکا، دەبینێ چەند مشکێك وا لەناو ساوارەکە یاری دەکەن. ئەویش بەبێ دەنگی مشکەکان دەردەکا و پوخت ساوارەکە دەرخواردی ئێمە دەدا. بۆ ڕۆژی دواتر و دوای ئەوەی ڕۆژومان شکاند، ئەنوەر بەسەرهاتەکەی بۆ گێراینەوە. هەندێك لە برادەران خۆیان هێناو برد و توڕەبوون. ئەنوەر گووتی هیچ قسەمەکەن، شەوی ڕابردو من لە پێش ئێوە ساوارەکەم خوارد. ئەگەر باسی مشکەکانیشم لۆ کردبان، ئەوا بەڕۆژوو ئەدەبوون و منیش گوناهبار دەبووم. دوایی بوبە پێکەنین. ئەو ماوەیەی لەو ئەشکەوتە بووین، زۆر بەخۆشی

کاتەکەمان لەگەڵ یەك بەسەربرد و ڕۆژانە نوکتەی خۆشمان بەسەردهات و پەندمان بە یەك دەکرد.

ماوەیەك بوو شەڕ لەگەڵ حکومەت نەبوو. ڕەئیس عورەفا ئەسعەد بیریژی پێشمەرگەیەکی ناوداربوو. هەروەها لای بارزانیش زۆر خۆشەویست بوو و تفەنگێکی تایبەتیشی پێشکەش کردبوو. لە شەڕەکانی پێشوو، دەورێکی سەرەکی هەبوو لە کۆنترۆڵ کردنەوەی چیای سەری بەرد و ناوچەی حەسەن بەگ. ئەسعەد بیریژی کرا بە لێپرسراوی ناوچەکانی خۆران و قەڵاسنج و دەوروبەریان. ئێمەش جاروبار دەچووینە لای و کۆبونەوەمان لەگەڵ دەکرد و دانیشتن لەگەڵی زۆر خۆشبوو.

ڕۆژێك من و ئەحمەد سەلیم و عەلیە ڕەش ـ کە ئەوکات بەتەمەن بوو ـ چووینەوە بۆ شەقڵاوە و دوو ڕۆژ لەوێ ماینەوە. دۆخی ناو شار زۆر نالەبار بوو و بەعس زۆر توندی کردبوو. بۆ کاتی گەڕانەوەمان، بەفرێکی یەکجار زۆر باری، بەڵام هەردەبوو بگەڕێینەوە. شەو کەوتینە ڕێ. گەیشتینە سپیگرە و لە گەروی ئاللەاکبر ئاوابووین، لە نێوان ئاقوبان و چنێران نوێژی بەیانیمان کرد. بەفر لەوێ تا چۆکمان هاتبوو و لەبەر زۆری بەفرەکە ڕێگای پەڕینەوە بۆ ئەو بەری سەفین گیرابوون و ڕۆیشتنمان زۆر سەخت بوو. لە نزیك گۆڕستانی ئاقوبان، عەزیز دەربەندیمان بینی کە ماوەیەك بوو هاتبووە ئەوێ. عەزیز ئاگر و شوێنی بۆ دابینکردین و خۆمان ووشك کردەوە. ئێمە زۆر هیلاك ببووین و سەرباری ئەوە بەڕۆژوش بووین، هەرچەند برادەرانی ئەوێ ئامۆژگاریان کردین، بەڵام ڕۆژومان نەشکاند. لەبەر بەفرەکە، ڕێگامان زۆر دوورکەوتەوە. ناچار لە بناری سەفین ڕۆیشتین تا گەیشتینە کەرکی گەرۆتە، ئینجا لەوێ توانیمان بپەڕینەوە. کە گەیشتینە کەرکی گەرۆتە، دوو تەیارە لەسەر سەرمان ڕەتبوون. کێشەکەش لەوەدابوو کە لەبەر بەفر هەموو شتێك سپی ببوو، تەنها ئێمە نەبێ. چاکبوو تەقەیان لە ئێمەنەکرد، بەڵام لە هیران دەستیان بە بۆردومانکرد. دواتر زانیمان کە بۆمبایەکی لە نزیك بارەگای ئەنجومەن دابوو و بارەگاکەی لە خۆڵ بزرکردبوو. دوای شەو و ڕۆژێکی زۆر سەخت، ئێوارە گەیشتینەوە ئەشکەوتەکەی خۆمان.

### دووەم مفاوەزات

بۆ ئێمە هەواڵێکی زۆر خۆش بوو کە لە ڕادیۆ بیستمان عەبدولسەلام عارف ئینقیلابی لەسەر بەعسیەکان کردوە، چونکە ماوەی چەند مانگێك بوو

بەعسیەکان عیراقیان غەرقی خوێن کردبوو. سەرەتا کەوتنە گرتن و کوشتنی شوعیەکان، ئینجا ڕاست و چەپ بەربوونە خەڵکی کوردستان. عەبدولسەلام هەرزوو بڕیاریدا گفتوگۆ لەگەڵ شۆڕشی کورد بکا.

دوای ئینقیلاب، من و برایمە خڕە بە فەرمان چووین بۆ کۆیە. چونکە گۆڕانکاری سیاسی و گفتوگۆ لە ئارادابوون، بۆ پێشمەرگە ئاسایی بوو کە بچین بۆ ناو شارەکان، بەڵام هێشتا ترسێکیش هەرهەبوو. ئەو سەردانە بۆ ئێمە زۆرخۆش بوو، چونکە کۆمەڵێك هاوڕێمان لەوێ هەبوون. لەبەر ئەوەی بارزانیش لەوێ بوو، خەڵکێکی زۆر لەوێ کۆببونەوە. زۆر لە سەرۆك عەشیرەتەکان هاتبوون تا لەگەڵ بارزانی کۆببنەوە، بۆ ئەوەی بڕیاربدەن کە لەگەڵ عەبدولسەلام چۆن ڕێکبکەون. من و برایم بەدەم ڕوباری بەستۆڕە ڕۆیشتین تا گەیشتینە ئەشکەوت سەقا. واحید کۆیی کوڕی پوری حەمید قەسابی هاوڕێمان، بەرپرسی بازگەی ئەوێ بوو. ئۆتۆمبیلێکی بۆ دابینکردین و ووتی دەبێ بچنە ماڵی ئەحمەدی برام لە کۆیە و میوانی ئێمەبن. چووینە ئەوێ و ڕێزێکی زۆریان لێناین. بارزانی بە ڕۆژ لە شار دەردەچوو و ئێوارەکانیش دەگەڕایەوە ماڵی کاکە زیادی گەورەی کۆیە و ئێمەش لەوێ چاومان بە بارزانی کەوت. چەند ڕۆژێك لە کۆیە ماینەوە و ئەحمەد حەمەدئەمینی هاوڕێمان میوانداریەکی زۆر خۆشی کردین. ئەوکات ئەو لە بەڕێوەبەرایەتی دارستانی ئەوێ کاریدەکرد. هەروەها چاومان بە زۆر دۆست و برادەرانی خۆمان کەوت وەکو، میرانی ساڵح بەگ، عەبدوڵا لاوە، ئیسماعیل لاوە، و زۆری تریش. پاش چەند ڕۆژێك، من و برایم گەڕاینەوە بۆ ئەشکەوتەکەی خۆمان.

لە بەهار زۆر لە برادەرانی شەقڵاوە دەهاتن و سەردانیان دەکردین. جارێکیان، برایم کاکۆ لەگەڵ ڕواری کوڕی هاتنە سەردانمان. برایم کاکۆ هەردەم سەرقاڵی کەو بەخێوکردن بوو و شارەزاییەکی زۆری لە ڕاوکردنی کەو هەبوو. لەو ڕۆژە کەوەکانی لەگەڵ خۆی هێنان و لە سەرووی خۆران ١٢ کەومان ڕاوکردن.

بۆ ماوەیەك مفاوەزاتەکە لەگەڵ عەبدوسەلام درێژەی کێشا، بەڵام لە کۆتایی هەر بێئەنجام بوو و شەڕ دەستپێکردەوە. لە ساڵی ١٩٦٦، عەبدوسەلام لە خوارووی عێراق فڕۆکەکەی کەوتەخوارەوە و کوژرا، عەبدولرەحمانی برای بوو بەسەرۆك کۆمار. عەبدولرەحمان ویستی بە شەڕ کۆتایی بە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بێنێ، بەڵام هەرزوو دوای شکانی لە شەڕی هەندرێن، گفتوگۆی دەست پێکردەوە. ئەو هەندێ بڕیاری گرنگی دەرکردن و بە سواری ئۆتۆمبیلێکی سەرمکراوە چووە سەردانی بارزانی لە نزیك ڕواندز. عەبدولرەحمان لەگەڵ کورد گەیشتنە ڕێککەوتنی ٢٩ی حوزەیران کە لە ١٢

خاڵ پێکهاتبوو، بەڵام ڕێککەوتنەکە بەهۆی کودەتای بەعسیەکان لە ساڵی ١٩٦٨، جێبەجێ نەکرا.

من ساڵانێك بوو لە خێزان و منداڵەکانم داپڕابووم و توشی بێدەرامەتی زۆر هاتبووین. جگە لەوەش، دەردی پیری یەخەی باوکمی گرتبوو و تا دەهات باری تەندروستی بەرەو خراپی دەچوو. کە من بووم بە پێشمەرگە، چوار کوری بچوك و خێزانەکەم بەجێهێشت، بێ ئەوەی هیچ داهاتێکیان هەبێ. براکانیشم هێشتا بەتەمەن زۆر گەورە نەبوون و قوتابی بوون. بۆیە بە هەلم زانی لە کاتی گفتوگۆکان لەگەڵ حکومەت، بچمەوە ناو شار و ئەگەر هەرنەبێ، بەرلەوەی باوکم ماڵئاوایی یەکجاری بکا، بتوانم کەمێك خزمەتی بکەم. هەرچەندە باوکم بەتەمەن بوو، بەڵام یەك دوو جار بە دەستی حکومەت گیرابوو. لە کاتی گیرانەکەشی و بۆ ئەوەی ئازاریبدەن، شەو ناویان لەبن کردبوو. کە بەعسیەکان هاتنەسەر حوکم لە ساڵی ١٩٦٣، لەکاتی تاڵان و سوتاندنی هەندێ لە ماڵە پێشمەرگەکان، سەربازێك لە باوکمی دابوو. ئەوکات دەستمان زۆر کورت بوو وە بالیفی باوکم لە پەلکی ساوار دروستکرابوو. یەکێك لە سەربازەکان بالیفەکەی بردبوو، چونکە وایزانیبوو پڕی توتنە. پێشتریش لە ساڵی ١٩٦١ دوای بوونم بە پێشمەرگە، ماڵی باوکم بە دەستی جاشەکان تاڵانکرابوو و چێڵ و گۆلکەکەشیان بردبوون.

ماڵە پێشمەرگەکان بەگشتی گوزەرانی ژیانمان زۆر نالەباربوو. بارودۆخی شۆڕشیش لەوەی ئێمە باشتر نەبوو و هەتا لە بارەگانمان نان و ئازوقە زۆر کەمبوو. بۆیە ئەوکات شۆڕش مۆڵەتی ئەدایین کە بچینەوە ناوشار و هەرجارەی چەند پێشمەگەیەك لەوێ دەماینەوە و هەندێکیش دەردەچووین. هەلەکەم قۆستەوە و بۆماوەیەکی چاك توانیم خزمەتی باوکە پەککەوتوەکەم بکەم، کە ئەوکات لەسەر جێگا کەوتبوو. زۆربەی کات من هەر لەگەڵ باوکم بووم و تەنانەت بۆ شەوێکیش نەچوومەوە لای منداڵەکانم، چونکە بەدرێژایی شەو نۆبەتم لێی دەگرت. جاروباریش دەچوومەوە سەفین و سەردانێکی بارەگام دکرد و دووبارە دەگەڕامەوە لای باوکم.

ئەحمەد حەمەدئەمین تازە لە شاری کۆیە وەك بەڕێوەبەری دارستان، گواسترابوەوە بۆ شەقڵاوە. ئەو پیاوە هەم کوردێکی دڵسۆز و پارتیەکی چالاك و هەم برادەرێکی خۆشەویست بوو، هەروەها پیاوێکی ئازا و چاونەترسیش بوو. ئەحمەد درکی بە بارە نالەبارەکەی گوزەرانمان کردبوو و وەك وەفایەك بۆ خەباتی ئەو پێشمەرگانە، لە بەڕێوەبەرایەتی دارستان بە کرێکاری کاتی دایمەزراندین. هەچەندە ئەم کارە تەحەدایەکی گەورەی حکومەت بوو و لەوانە بوو ژیانی خۆی بخاتە مەترسی، یان لانی کەم، کارە حکومیەکەی لەدەست بدا،

بەڵام بێ ترس ئێمەی دامەزراند! شایانی باسە، ئەو دار سنەوبەرانەی لە بەرامبەر میرەسەنن لەتیشی چیای سۆرك، ئەوكات بە دەستی ئێمە چێندران. هەرچەندە ئەم كارە وەرزی بوو و دوای ماوەیەك كۆتایی هات و ڕۆژانەكەشمان تەنها چەند درهەمێك بوو، بەڵام بۆ ئێمە یارمەتییەكی زۆر گەورە بوو و شەوانەش هەر دەمتوانی یارمەتی باوكم بدەم.

دوای ماوەیەك كاركردن، حكومەت بەدوای ناردین. ئەوانەی لەبیرم ماون كە ئەوكات لەگەڵ من بوون، ئەحمەد سەلیم، حەمید قەساب، حەسەن ئەحمەد هۆری. دائیرەی ئەمن ئێمەیان بە جێبێكی لاندرۆڤەر برد بۆ مەسیف و لێپێچینەوەیان لەگەڵ كردین كە چۆن ئێمە گەڕاینەوە ناو شار. گووتمان مفاوەزاتە و مۆڵەتمان وەرگرتووە. پرسیاری ئەوەشیان لێكردین كە چەكەكانمان لەكوێن. گوتمان ئێمەش وەك سەربازەكانی ئێوەین، كە دەچینەوە سەردانی كەس و كارمان، چەكەكان لە ناو شۆڕش جێدەهێڵین، كەچی ئێمە چەكەكانمان هەر لەلای خۆمان بوو! كاتێك ئێمەیان بە جێبێكە دەبرد بۆ مەسیف، ئەمنێكی عەرەب لەگەڵ ئێمە سواربببوو و كەمێك كوردیشی دەزانی. بۆ ئەوەی قسەی خۆمان بكەین بەیەك و كابراش لێمان تێنەگا، لەڕێگا بە لاونیو بە برادەرانم ووت، ئەگەر پرسیاری شتە درێژەكەیان كرد (واتا تفەنگ)، دەڵێین لەولایە (واتا لە بارەگا بەجێمان هێشتوە). ئێمە هەمان ڕۆژ ناردراینەوە بۆ شەقڵاوە.

دوای ماوەیەك، باوكم ماڵئاوایی لە دونیاكرد. پێشمەرگەیەكی زۆریش لە پرسەكە بەشداربوون. دوای مردنی باوكم، ئەركی من زۆر گرانتر بوو. جگە لە بەخێوكردنی منداڵەكانم، ئەركی بەخێوكردنی دایك و خوشك و براكانیشم كەوتە ئەستۆ. پرسەی باوكم هەر بەردەوام بوو، كە حەمە ساڵحی زاوام بێ ئەوەی پرس بە من بكا، بڕیاری دامەزراندنەوەی منی لە هەمان شوێنی كارە كۆنەكەم لە مەكینەی كارەبا وەرگرتبوو. من زۆر پێم ناخۆش بوو كە ئەو كارەی كردوە و پێم گووت كە من ئەو شتەناكەم، چونكە من هەر پێشمەرگەبووم. بەڵام هەموو خزم و دۆستانم، منیان هێنایە سەر ئەو باوەڕەی كە ئەركی خزمەتكردنی ماڵی خۆم و براكانم، هیچ لە شۆڕش و كوردایەتی كەمترنیە. ووتیان ئێستا وتوویژ لەگەڵ حكومەت بەردەوامە، ئەگەر شەڕ دەستیپێكردەوە، دەتوانی پەیوەندی بكەیەوە. لە هەمان كاتیشدا، سەركردەكانی شۆڕش لەگەڵ یەك ناكۆك بوون و كێشەكانی نێوانیان بەردەوام قوڵتردەبوون، شۆڕش و كوردایەتیش خەریك بوو ببێ بە دوو بەش. من حەزم بەو دوو بەرەكیە نەكرد و نەم ویست بەشێك بم لەو شەڕی براكوژیە.

شەوێك مەفرەزەكی پێشمەرگەی بێگانە هاتنە لام. لەجیاتی ناوی پیاوانی حكومەت، ووتیان دەبێ لەگەڵمان بێی و ماڵی چەند هاوڕێیەكی خۆتمان پیشانبدەی تاكو بیانگرین. منیش زۆر سەخڵەت بووم لەوەی كە چەند بێگانەیەك بێن و لە شارەكەی من كارێكی وابكەن. ئەوانەی لە لیستەكەدا بوون، هاوسەنگەرانی من بوون وەك عەزیز قادر خومار، مەلا حەسەن و ئیسماعیل ئەفەندی... پێم گوتن ئەوانە چەندین ساڵە لەگەڵ من پێشمەرگەن و بەیەكەوە لە دوژمنمان داوە و لە دەیان شەڕ و ئازار و میحنەت بەیەكەوە بووین. ئەوانە كوردن و ئامادەن گیانیان لە ڕێگەی كوردایەتی ببەخشن، من شۆڕش و كوردایەتیش لە هەندێك لەو برادەرانە فێربووم، ئێوەش دەتانەوێ بیانگرن؟! بۆیە من ئامادە نیم ئەوكارە بكەم. بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر ئەمرێكتان پێیە بچم زەبرێك لە دوژمن بوەشێنم، یاخود موتەسەریفی هەولێر یان هەردوژمنێكی تر بكوژم، ڕێگەم بۆ دانێن، ئەگەر نەچووم با شۆڕش لە سێدارەم بدا. من ئامادەم هەمووشتێك لە ڕێی كوردایەتی جێبەجێ بكەم، بەڵام من بە هیچ شێوەیەك خیانەت لەگەڵ رەفیقەكانم ناكەم. هەرچی لە چەنگیشتاندێ بیكەن.

## دابڕانم لە پێشمەرگایەتی

ڕۆژ بە ڕۆژ ململانێی هەردوو باڵەكەی ناو پارتی لە پەرەسەندن دابوو، ئەوەندەی خەریكی یەكتربوون، ئاگایان لە دوژمنی خۆیان نەمابوو. ئەو ناكۆكیە زۆربەی ماڵەكانی گرتبووەوە، تەنانەت برا و خزمەكانیش دابەش ببوون. كە شەڕ دەستی پێكردەوە، من ویژدانی خۆم كردە سەنگی مەحەك. بە بوونی ناكۆكیەكان، دڵم لەسەر شۆڕش سارد ببوەوە و بڕیارمدا ڕوو لە شاخ نەكەمەوە. سەرەڕای بوونی ئەم هەموو ئازارە، لە شار مامەوە. بەڵام ئەوەی شانازی پێوە دەكەم، ڕۆژێك لە ڕۆژان بیرم لەوە نەكردەوە كە خیانەت لە هاوڕێكانم و لە نەتەوەكەم بكەم. بە مانەوەم لە شار، میری فشاری زۆری خستە سەرم، بەڵام هەرگیز ئامادە نەبووم سەر بۆ داگیركەران نەوی بكەم.

من هەر چاوەڕێی ئەوە بووم كە شۆڕش وەك جارانی لێبێتەوە و هەمویان یەكبگرنەوە تاكو جارێكی تر پەیوەندی بكەمەوە. بەداخەوە هەندێك لە هەڤاڵانم وایان دەزانی كە من بەتەمای ئەدانەوەی چەكی شۆڕشم و بە هەڕەشەوە چووبونە سەر ماڵی باوكم. كە بەم هەواڵەم زانی، پێم گووتن من لە هەموو ژیانم هەردەم ئامادەم كە خوێنم لە پێناوی نیشتیمان بڕژێ، چەك چ نرخێكی

هەیە! بۆیە چەکەکەم دایە دەستی عەبدوڵا عەزیزی کوڕی خاڵم و لە ماڵی ڕەسوڵ کاکۆ ڕادەستی پێشمەرگەکان کرا.

عەونی یوسف یەکێك بوو لە ئەندامانی حزبی هیوا و پاشان ئەندامی سەرکردایەتی پارتی بوو و هەروەها لە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستان ڕۆڵێکی بەرچاو و دیاری هەبوو. کەچی لە حەفتاکان ببوو بە وەزیری شارەوانی (ئەو کات دائیرەی کارەبا سەر بە وەزارەتی شارەوانی بوو)عەونی یوسف سەردانی شارەوانی شەقڵاوەی کرد و لەکاتی ڕۆیشتنی، سواری ئۆتۆمبیلە نوێیەکەی بوو. کاتێك ئۆتۆمبیلەکە بۆ دواوە دەڕۆیشت، زەنگێکی وەك دەنگی سوێسکەی لە دواوە دەهات. منیش بەبێ ویستی خۆم دەستەواژەیەکم لە زار هاتە دەر و گووتم "ڕۆژەك هەردێ حسابەك بکرێ". ئەویش یەکسەر ئۆتۆمبیلەکەی ڕاگرت و لەبەر ئەم قسەیەی من هاتە دەرەوە. من گوتم ئەو وەرزیرە و ئێستا لێپێچینەوەم لەگەڵ دەکا، بەڵام بۆچوونەکەم ڕاست دەرنەچوو. عەونی یوسف هەموو فەرمانبەرەکانی کۆکردەوە و ڕووی لە من کرد. گلەیی لە شۆڕش و سەرکردایەتی کورد کرد و ڕۆڵی خۆی لە ڕووداوێکی ئەو سەردەمە باسکرد و پاشان گووتی "ئەم پیاوە لە کاتی ڕۆیشتنمدا قسەیەکی بە من ووت. ئەو ڕاست دەکا، میللەت مافی خۆیەتی لێپێچینەوە لەگەڵ سەرووی خۆی بکا. ئێمە هیچمان بۆ میللەت نەکردوە". دوای ئەو قسەیە ڕۆیشت.

لە دوای ساڵی ١٩٧٥ کە هێشتا هەر لە شارەوانی کارم دەکرد، حیزبی بەعس لە ڕێی ئەندامێکی فشاری خستبوە سەرم کە جارێکی تر سەرۆکایەتی نیقابە بکەم، منیش قبوڵم نەکرد. کابرا بە منی ووت "تۆ بۆ مەلا مستەفات کرد، دەبێ بۆ ئێمەش بکەی". منیش ووتم "من بۆ ئەوم نەکرد، بۆ شۆڕش و کورد بوو. بەڵام ئێوە وەك کەری ناو جۆگەی لە هەردوو لاتان خوارد". ئەو کابرایە لە شۆڕش زۆر سوودمەند بوو، دواتریش بۆ بەعس هەوڵی دەدا.

ڕاستە من وازم لە پێشمەرگایەتی هێنا، بەڵام عیشق و گیانی کوردایەتی لە دڵ و دەروونی من، بەردەوام لە جاران گەرم و گوڕتر دەبوو و منداڵەکانم بەگیانی کوردایەتی پەروەردە کردن. لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکان، سێ کوڕم بوون بە پێشمەرگە و کچەکەشم ئەندامێکی چالاکی ڕێکخستن بوو، وە دەورێکی سەرەکی لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٨٢ لەناو قوتابیە کچانی شەقڵاوە بینی. لە ساڵی ١٩٨٥، کاتێك لە شەقڵاوە ٧٦ کەس بە هەموو حیزبەکان لە ڕیزی پێشمەرگایەتی خەباتیان دەکرد، تەنها هەشت ماڵ لەلایەن حکومەت حجز و تاڵانکران. ماڵی منیش یەکێك لەو هەشت ماڵە بوو. هەتا دوای گرتنی کوێت لەلایەن سەدام، بۆماوەی ٥ تا ٦ ساڵ لە لای خزم و کەسان خۆمان حەشاردا. ئەو چەند ساڵە پڕبوون لە دەردەسەری و دڵەڕاوکێی من و هەموو خێزانەکەم، بەعسیەکانیش

بەردەوام بەدوامان دەگەڕان. چەند جارێکیش تەقەیان لە کوڕەکانم کرد، بەڵام شەقڵاوە داغستانی حەمزاتۆفی من بوو و ڕەتم کردەوە کە بۆ بەعسیانی بەجێبێلم و هەرلەوێ مامەوە.

لە کاتی بەکارهێنانی چەکی ژەهراوی لە دۆڵی بالیسان، لە ١٦ی نیسانی ١٩٨٧، دوو کوڕم بەر ئەو جۆرە چەکە کەوتن و یەکێکیان زۆر بە سەختی بریندار‌بوو. کاتێکیش خەڵکی شەقڵاوە لە دژی بەکارهێنانی ئەو جۆرە چەکە ڕاپەڕین، دوژمنی بەعس تۆزێك سەبری گرت و پاشان لە ڕۆژێکی شوم، ڕەشبگیریەکی گەورەی لە شەقڵاوە دەستپێکرد. لەم ڕۆژە ڕەشەدا، بۆم دەرکەوت کە بڕیاری گرتنی خۆم و کوڕەکانم، هەروەها یەکێك لە کچەکانم و فاتمە هەڵۆی خوشکم دەرچوو بوو. من چەند ڕۆژێکیش پێش ئەو ڕۆژە، بەرببومەوە و هەردوو دەستەکانم شکابوون. خۆم و ئەزار و سەرداری کوڕم لە شوێنێك لە مالي جەلالی برام، خۆمان حەشاردا. سەربازەکان هاتنە ئەو شوێنە و تەنها مەترێك لە ئێمە دووربوون، بەڵام باش بوو هەستیان بە ئێمە نەکرد. کچەکەشم لە شوێنێکی تربوو وە ئەویش دەربازبوو. کابرەیەکی خێرخوازیش بە فاتیمەی خوشکمی گوتبوو، کە بڕیاری گرتنی هەیە و ئەویش دەربازبوو. بەختیاری کوڕم کە چەندین ساڵبوو پێشمەرگە بوو، ماوەی چەند مانگێك بوو لەبەر سەختی برینی کیمیاباران خۆی لەشار حەشاردابوو. ئەو ڕۆژە لە ماڵی خەزورم بوو و سەربازەکان چووبوونە ئەوێ و ئەیان دیتبوو. بەڵام ئەو زوو لە حەشارگەکەی هاتبووە دەرێ و سەربازێك لە دوورەوە چاوی پێکەوتبوو و بۆی گەڕابوونەوە و گرتیان. بەختیار و کۆمەڵێك کەسی تر، بەڕێکەوت لەگەڵ ٢٣ شەهیدەکانی شەقڵاوە ئیعدام نەکران. بەڵام ئەو و چەند هاوڕێیەکی، نۆ مانگ لە زیندان مانەوە. لە هەمان کاتیشدا، دەست بە تەقاندنەوەی ماڵە پێشمەرگەکان کرا و هەتا نزیك ماڵی ئێمەش هاتن. ئەو ڕۆژە تاریك داهات و بڕیاربوو بەیانی لە ماڵی ڕەسول کاکۆ دەست پێبەکەنەوە و ماڵی منیش دووهەم ماڵ بوو لە لیستەکەدا. بەڵام بەخت یاوەرمان بوو و بۆ بەیانی بارودۆخەکە گۆڕا.

دەبێ ئەوەش بڵێم کە لەوپەڕی ڕۆژە تەنگەکاندا، کەسێکی خەڵکی شەقڵاوە کە سەر بە دەزگایەکی حکومەت بوو، خەبەر بۆ ئەسعەدی کوڕم دەنێرێ، کە پێشمەرگە بوو و دەڵێ "ئەگەر هاوکاریمان بکەی، ئەوا خێزانەکەتان دەپارێزم". ئەویش بە نێردراوەکەی گووتبوو کە بەو کەسە بڵێ "بەهۆی پێشمەرگایەتی، هەموو شتێکمان لەدەست داوە تەنها شەرەف نەبێ، دیارە ئەو برادەرەت دەیەوێ شەرەفەکەشمان لەدەست بدەین!".

هەرچەندە بەشێك لە باشوری كوردستان لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ لە بەعس پاككرایەوە و كوردستان نیمچە ئازادیەكی بەخۆوە بینی، بەڵام زۆر بەداخەوە، ئەو دۆخە زۆری نەبرد و شەڕی ئەگریسی ناوخۆ ئەنفالێكی گەورەتری بەسەر میللەتی كورد هێنا. كورد بە دەستی خۆی كوردستانی زیاتر وێرانكرد. هەرچەندە من و كوڕەكانم ڕەتمان كردەوە ببین بە بەشێك لەو شەڕە، كەچی بەرداشی ئەو شەڕە زۆر خراپتر لە ساڵانی هەشتاكان ئێمەی هاڕی.

هەر بۆیە لە سایەی دەسەڵاتی كورد، بەڵام بە ناچاری و لە كۆتایی تەمەنمدا، سەری ئاوارەییم لە كوردستان هەڵگرت. كوردستانێك كە ئامادەبووم خۆم و منداڵەكانم لە پێناوی بمرین و بۆ بەعسیشم جێنەهێشتبوو، ناچار ڕووم لە ئەمریكا كرد و بەجێمهێشت.

## « سەرنج »

مەبەستی من لە نوسینەوەی ئەو پەرتوکە، گێرانەوەی بیرەوەریەکانی ژیانی خۆمە و لە هەمان کاتیشدا خزمەتکردنە بە کەلتوری شاری شەقڵاوە و ناوچەکە. ئەو کەسانەی کە ناویان لە بیرەوەریەکانم هاتوە، بەتایبەتی لە بابەتی "بیرەوەریەکانی سەردەمی پێشمەرگایەتی" و "سەرهەڵدانی کوردایەتی" تەنها ئەو هاوڕێ و هاوسەنگەرانەن کە لەگەڵ من پێشمەرگە و هاوسەنگەر بوون، یاخود ئەو کەسانەن کە بیرەوەریم لەگەڵدا هەن یان بەیەکەوە کارمانکردوە. تەنانەت لە زۆر شوێن لەوانەیە ناوی ئەوانیشم نەهاتبێتەوە خەیاڵ. زۆر کەسی تر پەیوەندیان بە شۆڕشەوە کردبوو و لە شوێنەکانی تردا بەشدار بوون، بەڵام بەداخەوە هەمویانم بیر نەماون. من تەنها ناوی ئەوانەم هێناوە کە لە کاتی گێرانەوەی بابەتەکان هاتونەتەوە یادم و داوای لێبوردنیش لەو تێکۆشەرانە دەکەم کە لە سەردەمی من بەهەر جۆرێك بەشداریان لە خەباتی سیاسی کورد کردوە و لێرەدا ناویان نەهاتوە و سوپاسی ماندووبونیشیان دەکەم. دووبارە دەیڵێمەوە، ئەوەی من لێرە نوسیومە، تەنها بیرەوەریاکانی ژیانی خۆمن و خزمەتکردنە بە کەلتوری کورد بە شێوەیەکی گشتی و ناوچەی شەقڵاوە بەتایبەتی.

## « دوا ووتەم بۆ خوێنەر و نەوەکانم »

سوپاس بۆ خوێندنەوەی ئەم پەرتوکە، هیوادارم کاتێکی خۆشت لەگەڵی بەسەر بردبێت. ئاواتی من لە ژیان ئەوەیە کە ببینم هەموو کورد یەکبگرێ و دەوڵەتی کوردی گەورە و ئازاد دابمەزرێ. من لە ژیاندا تاڵی و سوێری زۆرم چێشتوە، بەڵام لەوەی کە کردوومە و باوەڕم پێی هەبووە، لە هیچیان پەشیمان نیم. هەمیشە چاوم لە نانی دەستی خۆم بووە و قەت نەمویستوە لەسەر حسابی خەڵکانی تر بژیێم. لە هەموو ژیانمدا بەبیرم نایێ غەدرم لە کەس کردبێ یان ماڵی کەسم بە ناحەق خواردبێ، بە پێچەوانەشەوە نەمهێشتوە کەس غەدرم لێ بکا. کاتێکیش دەمبینی کەسێك دەیویست غەدر لە کەسێکی تر بکا، نەمتوانیوە دەستەوستان بوەستم، بەڵکو دەبومە ڕێگری. بەتایبەتی لە تەمەنی لاویم کە هەندێك کەسی نەفەس نزم شەڕیان بە برا مەسیحی و جووەکان دەفرۆشت، من هەرگیز قبوڵم نەبوو و زۆر جاریش لەسەر ئەوە توشی قڕە و شەڕ دەبووم. لە ژیانی پێشمەرگایەتیشدا هەر ئەرکێکی پێم سپێردرابێ، سڵم لێنەکردۆتەوە ئەگەر زۆر سەخت و بەرەو هەڵدێری مەرگیش بووبێ. هەمیشە وەك مرۆڤێکی ڕاستگۆ و خاوەن هەڵوێست هەڵسوکەوتم کردوە. حەزم بە خۆهەڵکێشان و پیا هەڵدان نەکردوە و ڕێزم لە بەرامبەرم گرتوە، لە خۆم گەورەتر یان بچووکتریش بوبێ. هەردەم دژی قسەی پاش ملە بوومە و ئەوەی ڕقیشم لێ بوبێتەوە خیانەتکاران بوون. لە ژیانمدا مرۆڤی ترسنۆك و خیانەتکارم زۆر دیون و لە هەمان کاتیشدا زۆر تر بوون لەوانەی کە ڕاستگۆ و نیشتیمان پەروەر بوون. ئەوەی خۆم بە ڕاستم زانیوە و باوەڕم پێی هەبووە، هەوڵم داوە منداڵەکانم و نەوەکانم لەسەر هەمان ڕێچکە پەروەردە بکەم و هیوادارم ئەوانیش بۆ نەوەکانی داهاتوو بە هەمان شێوە بیربکەنەوە.

حاجی قادری گوزێ

ئەمریکا ٢٠١٤/٥/٢١

سو پا سێکی تا یبه ت بۆ ( ســه ر دا ر ) ی کو ر م که ئه ر کێکی

ز ۆ ر ی خسته ئه ســتۆ بۆ به چا پ گه یا ند نی ئه م به ر هه مه

حا جی قا در گـۆ ز ێ

# Shaqlawa & I



Kadir Gozeh

Autobiography & History

ڕادەبوێرم ڕووت و برسی
گوێ نادەمە هیچ مەترسی
کورد نافرۆشم بە فلوسی
مێژووش ئەمانە دەنوسی

قادری گۆزێ ١٩٦٢

ISBN 978-0-692-21304-9

